# دیاردەی سوو
## لە مامەڵە هاوچەرخەکاندا

نووسینی:
پرۆفیسۆر د. خالید موحەممەدساڵح



چاپی دووەم
٢٠٢٠ - ٢٠٢١

# دیاردەی سوو لە مامەڵە هاوچەرخەکاندا

ظاهرة الربا في المعاملات المعاصرة

نووسینی
پرۆفیسۆر
خالید موحەممەد ساڵح

چاپی یەکەم
٢٠١٥ - ١٤٣٦

چاپی دووەم
١٤٤٢-٢٠٢١

## قال الله تعالى:

﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللَّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ الرِّبَا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ۞ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ فَأْذَنُواْ بِحَرْبٍ مِّنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَإِنْ تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُؤُوسُ أَمْوَالِكُمْ لاَ تَظْلِمُونَ وَلاَ تُظْلَمُونَ ۞ وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَى مَيْسَرَةٍ وَأَن تَصَدَّقُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾.

**البقرة:٢٧٨-٢٨٠**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

## پێشەکی

سوپاس و ستایش بۆ زاتی پاکی تاکی پەروەردگار، لێزمە دروووودی باران ورەحمەت بۆ سەر گیانی پێغەمبەری نازدار ﷺ ویار ویاوەران وشوێنکەوتوانیان تا رۆژی دوایی.

اللَّهُمَّ رَبَّ جِبْرَائِيلَ وَمِيكَائِيلَ وَإِسْرَافِيلَ، فَاطِرَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ، عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ، أَنْتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ، اهْدِنِي لِمَا اخْتُلِفَ فِيهِ مِنَ الْحَقِّ بِإِذْنِكَ، إِنَّكَ تَهْدِي مَنْ تَشَاءُ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ.

اللهم إِنِّي أعوذ بك أن أشرك بك شيئاً أعلمه وأستغفرك لما لا أعلمه.

الله اجعل كل أعمالنا صالحا، ولوجهك خالصا، ولا تجعل لأحد فيه شيئاً.

بەرێزان: جیهانی ئابووری لەم سەردەمە جەنجاڵ وئاڵۆزەدا، رووداو وپێشهاتەکانی زۆر بەخێرای تێپەڕ دەبێت وگوزەر دەکات، هاوکات پێداویستی ژیانی تاك وکۆمەڵگەکان هەمیشە روو لە زیادبوون وفراوانبوونە، ئەمەیش زۆر پرس و مامەڵەی نوێ بەدوای خۆیدا دەهێنێت، کە پێویستیان بە وەڵام ورونکردنەوەی شەرعی هەیە.

بۆیە رۆژانە خەڵکانێکی زۆر پرسیاریان بۆ دروست دەبێت لەسەر ئەو مامەڵانەی کە لەبازاڕەکاندا دەگوزەرێت، بەڵام بەداخەوە زۆر کات وەڵامی پێویستیان دەست ناکەوێت و زانایان بۆچوونی جیاوازیان پێدەدەن لەسەر پرسەکانیان، ئەمەیش وادەکات بەرچاوروونی تەوایان دەستنەکەوێت ودوودڵی ئاڵۆزیەکانیان چارەسەر نابێت. بۆیە هەندێك لەو پرسانە تائێستایش بەهەڵپەسێردراوای ماونەتەوە.

یانیش هەندێك جار لەبەر بەرژەوەندییە تایبەتییەکانیان و بەبیانووی جۆراوجۆر خۆیان لەوەڵامە راستەکان دەدزنەوە وکاری پێناکەن.

ئامانجی سەرەکی باسکردنی ئەم بابەتە بریتییە: لە رونکردنەوەی حوکمی شەرعی لەسەر کۆمەڵێك پرسی ئابووری سەردەمیانە کە تا ئێستا ئاڵۆزن، وخەڵکانێکی زۆر وەڵامی شەرعی دروست لەسەریان نازانن. ئەمەیش بەئەرکێکی شەرعی دەزانم کە پێویستە

ئەوەندەی لەتوانامانداا هەیە حوکمی شەرع لەسەر پرسەکانی خەڵك ڕوونبکەینەوە وبەرچاوڕۆشنی تەواویان پێبدەین لەسەریان.

لەبەرامبەریشدا بەئەرکی شەرعی سەرشانی هەموو ئەو کەسانەی دەزانم کە لەم بوارانەدا کاردەکەن، فەرزی عەینە[1] حوکمی حەڵاڵی وحەرامی مامەڵەکانیان بزانن وبەر لەوەی هەر کارێك یان مامەڵەیەك بکەن دەبێت پێشتر حوکمە شەرعییەکەیان پرسیبێت وزانیبێت، تا چیتر پاساوی نەزانین وبێئاگابوون بۆ خۆیان نەهێننەوە؛ چونکە ئەو پاساوە بۆ ئەو جۆرە کەسانە ولەم ڕۆژگارەدا لای خوای گەورە سوودی نییە ودادی کەس نادات.

زانایان لەم بارەیەوە بۆچوونیان وایە: هەرکەسێك بیەوێت هەر کارێك بکات، پێویستە پێش وەخت حوکمی شەرعی وورد ودرشتی کارەکەی بزانێت، ئەگینا شەرعی نییە ئەو کارە بکات؛ چونکە بێگومان تووشی تاوان وسنورشکێنی فەرمانەکانی خوای گەورە دەبێت.

بۆنموونە: کاتێك کەسێك دەیەوێت نوێژ بکات، ئەگەر نەزانێت مەرجەکانی نوێژەکەی چییە؟ وبنەماکانی چین؟ وچۆن دروست دەبێت؟ وبەچی بەتاڵ دەبێتەوە؟ ئەوە چۆن نوێژ دەکات؟! وچجۆرە نوێژێك دەکات؟!. هەروەها کەسێك کەدەیەوێت زەکات بدات، ئەگەر نەزانێت مەرجەکانی زەکات چییە؟ وزەکات لەچی دەدرێت؟ وڕێژەی زەکات چەندە؟ وبەکێ دەدرێت؟ ئەگەر ووردەکاریەکانی ئەمانە نەزانێت ئیتر چۆن زەکات دەدات؟! .

یان زەرڕەنگەرێك یان کەسێك کەپیشەی دراو گۆڕینەوە وحەواڵە دەکات لەو بازاڕەدا، پێویستە بەر لەوەی بچێتە ئەو بوارەوە حوکمی شەرعی تەواوی کارەکەی بزانێت ئەوجا بچێتە ناوی.

هەروەها پزیشکێکیش کە کاری چارەسەری تەندروستی خەڵکی گرتۆتە ئەستۆ، پێویستە سنووری شەرعی کارەکەی خۆی بزانێت، وپسپۆڕی وشارەزایی تەواوی لەبواری کارەکەی خۆیدا هەبێت. کەسێکیش کە بازرگانە، یان بەڵێندەرە، یان ئەندازیارە، یان مامۆستایە، یان هەر کارێکی تری هەیە پێویستە حوکمی شەرعی کارەکەی بزانێت.

---

١- مەبەست لەفەرزی عەین: ئەو فەرزەیە کە دەبێت هەموو کەس بۆ خۆی پێی هەستێت، وهیچ کەس ناتوانێت لە بری کەسی تر بیکات، وهەر کەس نەیکات تاوانبار دەبێت، وەك نوێژ ورۆژوو. وەئەم زاراوەیە لەبەرامبەر (فەرزی کفایە) بەکار دێت، کەمەبەست پێی ئەو فەرزەیە ئەگەر کۆمەڵێك پێی هەستن فەرزەکە لەسەر کۆی خەڵکی لادەچێت، وەکو نوێژی مردوو، یان شاردنەوەی.

گرفتی گەورەی ئەمڕۆی خەڵك بێئاگایی ونەشارەزابوونیانە لە بوارە شەرعییەکاندا، هۆکاری سەرەکی ئەم بێئاگابوونەیش تەنها خەمساردی وبێباکیانە لەبەرامبەر ئەو جۆرە پرسانەدا، ئەگینا بۆ لە بوار وکایە دنیاییەکانی تردا کە بە بایەخەوە لێی دەڕوانن تەواو شارەزان؟!.

لەگەڵ ئەم نەشارەزاییەشدا زۆر جار پرسی شەرع هەر ناکەن، یان پاش ئەوەی کار لەکار دەترازێت ئەوجا پرسی شەرع دەکەن، بۆ نموونە: کەسێك دەچێت پشکێکی حەرام لە دامەزراوەییەکی سووخۆریدا دەکڕێت، پاش ماوەیەکی زۆر ئەوجا بیری شەرعی دەکەوێتەوە وپرسیار دەکات، کە کارەکەی حەڵاڵە یان حەرام؟ وپێویستە ئێستا چی بکات تا لەو حەرامە ڕزگاری بێت، ئەمە گرفتێکی گەورە بۆ خۆی وخەڵکیش دروست دەکات، ئەگەر پێی دەڵێیت کارەکە حەرامە ووازی لێ بێنە، ئەوە پارەکەی دەڕوات ولەوانەیە بەرگەی ئەو زەرەرە نەگرێت، یان هەر هیچ نەبێت پارەکەی ئەم دەبێتە مایەی زیاد کردنی دەسمایەی دەزگا سووخۆریەکە، ئەگەر دەڵێیت بیفرۆشەرەوە بەکەسێکی تر، ئەوە چۆن بۆ ئەم حەرامە بۆ خەڵکی تریش حەرامە ودروست نییە، ئەگەر دەڵێیت بەردەوامبە لەسەری چۆن دروستە بەخەڵك بڵێیت لەکارێکی حەرام بەردەوام بێت؟! بەم شێوەیە خۆی وخەڵکیش تووشی گێژاو وقەیران دەکات.

ئامانجێکی تری وروژاندنی ئەم بابەتە ئەوەیە، کە ئێمە پێویستە بنەماکانی ئابووری ئیسلامی بۆ خەڵکی ڕوون بکەینەوە، تا بزانن ئەو بنەما سەرەکییانەی ئابووری ئیسلامی لەسەر دادەمەزرێت چییە؟ وجیاوازی لە نێوان ئەم سیستەمە، وسیستەمی ئابووری سەرمایەداری، وسیستەمی ئابووری سۆسیالیستیدا چییە؟ وکام لەم سیستەمانە گونجاوترن بۆ بنیات نانی ئابووری وولات؟.

ئامانجێکی تری باسکردنی ئەم بابەتە ئەوەیە: کە ئێمە ڕێگە چارە شەرعییەکان بۆ خەڵکی بخەینە ڕوو، چونکە ئیسلام کاتێك ڕێگە لەکارێکی حەرام دەگرێت بەدڵنیاییەوە دەیەها ڕێگای تری حەڵاڵی بۆ خەڵك داناوە، تا بەهۆیانەوە مەبەست وئامانجەکانیان بهێننە دی، و کەس پاساوی کردنی حەرامی نەمێنێت، بۆ نموونە کاتێك ئیسلام ڕێگە لەدزی وداگیرکردن دەگرێت، ڕێگە بەبەخشین، وکڕین وفرۆشتن، وئاڵوگۆڕکردن، وبەکرێدان،

وچەندین کاری تر دەدات کە بەهۆیەوە ئەو شتە بەدەست بهێنی کە دەتەوێت، بۆیە ئێمە کاتێك لێرەدا دەڵێین سوو خۆری حەرامە، نامانەوێت دەستی خەڵکی ببەستین ورێگە لەگەشەکردنی ئابووری تاك وکۆمەڵگە بگرین، بەڵکو بەپێچەوانەوە دەمانەوێت رێگە چارە شەرعییەکان بەخەڵکی نیشان بدەین، کە لەهەموو روویەکەوە لە رێگا حەرامەکان سوود وبەرەکەتیان زیاترە وخەڵکیش تووشی حەرام وگوناە نابن بەهۆیانەوە.

سەبارەت بە پێرەوی باسکردنی بابەتەکانیش: هەوڵ دەدەین بەو پەڕی بێلایەنی ودوور لە دەمارگیری وبەرۆحێکی زانستی وبابەتیانەوە، قسە لەسەر کۆی تەوەرەکان بکەین ولەسەر هەر تەوەرێك گشت بۆچوونە جیاوازەکان وبەڵگەکانیان بخەینە روو وهەڵسەنگاندنی تەواو زانستیانە بۆ بەڵگەکان بکەین وبۆچوونی زانایانی کۆن ونوێ لەمەڕ بابەتەکان بخەینە روو وبۆچوونی پەسەند لەنێوانیاندا دیاری بکەین، تا بیسەر وبینەر وخوێنەری بەرێز بەرچاو روونی تەواوی لەسەر کۆی بابەتەکان بۆ دروست بێت.

هەرچەندە کۆی باسەکە بەزمانەکانی تر شتیان زۆر لەسەر گوتراوە ونووسراوە؛ بەڵام بەداخەوە بەزمانی کوردی وبەشێوەیەکی سەربەخۆ هیچی لەسەر نەگوتراوە ونەنووسراوە؛ بۆیە بەپێویستم زانی بەزمانی شیرینی کوردی دایك تەوەرەکانی بابەتەکە بخەینە بەر باس ولێکۆڵینەوە وکەلێنێکی کتێبخانەی کوردی پڕبکەینەوە وخزمەتێکی هەرچەند کەمیش بێت بە ئیسلام وموسوڵمانان بەشێویەیکی گشتی وخوێنەری کورد بەتایبەتی بکەین.

جگە لەبەدەستهێنانی رەزامەندی خوای گەورە، وخزمەتکردن وخەمخۆری بۆ بەرژەوەندی گشتی ووڵات وکۆمەڵگا، هیچ مەبەستێکی تر لەپشت ووروژاندنی بابەتەکەوە نییە وقسەکانیشمان ئاراستە نییە بۆ هیچ کەس، ولایەن وکەرت وپیشە وبازرگانێك بەتایبەتی وناشمانەوێت لەبەرژەوەندی کەس بدەین، یان بەرتەسکی بکەینەوە؛ بەڵکو دەمانەوێت رێگە چارە شەرعییەکان بۆ گرفت وگرێ کوێرەکانی ژیانی خەڵکی بخەینە روو، کە دڵنیاین تەنها ئەو رێگانە زامنی دەستەبەرکردنی ئابووریەکی تەندروست وگەشەکردو بێ مەترسی ودوور لەستەم دەستەبەر دەکات بۆ هەموو لایەك.

کۆی باسەکەیش لە سیازدە بەش پێك دێت، کەهەفتانە تۆمار کراون ولەکەناڵی ئاسمانی پەیامەوە پەخش کراون[1] وهەر بەو شێوەیەیش لەم پەرتوکەدا دارشتنەوەی بۆ کراوە.

هەموو ئەو پرسیارانەیش کە هەفتانە ئاراستەمان کراوە، یان ئەو گفتوگۆیانەی کە پاش هەموو بەشێك ڕاستە وخۆکراون، لێرەدا لەبەشێکی سەربەخۆدا تۆمارمان کردون تا هزری خوێنەر پرژ نەبێت، وریزبەندی بابەتەکان تێك نەچێت.

پرۆفیسۆر.

خالید موحەممەد صالح

(٣) ڕەمەزان (١٤٣٦) بەرامبەر (٢٠/٦/٢٠١٥).

---

١ - تۆمار کردنی زنجیرە باسەکان هەموو ڕۆژانێکی شەممە کاتژمێر (٣) پاش عەسر دەبوو، لەبنکەی سەرەکی ڕێکخراوی ژیار لە سلێمانی، وشەوانی پێنج شەممە کاتژمێر (٩) ی شەو لەکەناڵی ئاسمانی پەیامەوە پەخش دەکرا، وتۆمارکردنی کۆی زنجیرە باسەکان، لەبەرواری ڕۆژی شەممەی ڕێکەوتی: (٢٩/١١/٢٠١٤) دەستیان پێ کرد، و لە (٢٨/٢/٢٠١٥) کۆتاییان هات، وتەنها شەممەیەك بەرنامەکە تۆمار نەکرا ئەویش بەهۆی بەفر بارین ونالەبەری کەش وهەواوە بوو.

# دەسپێک

## چەند تێبینییەکی گشتی

بەر لەوەی بچمە سەر تەوەرکانی باسەکە پێم خۆشە ئەم چەند تێبینییە گشتییە بخەمە ڕوو:

**یەکەم:** ناوەڕۆکی باسەکەی ئێمە دەربارەی دیاردەی سوو (ربا) خواردنە؛ بۆیە سەیر نییە کە زۆرێك لەو بابەتانەی ئێمە لێرەدا باسیان لێوە دەکەین بڵێین حەرامن؛ چونکە ئیشی ئێمە لێرەدا تەنها باس کردنی حەرامەکانە نەك کۆی شتەکان، وەك ئەوە وایە کە دکتۆرێك هەموو ئەو کەسانەی کە هاتونەتە لای پێیان دەڵێت نەخۆش، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە هەموو تاکەکانی کۆمەڵگە نەخۆشبن، بەڵکو هەموو ئەوانەی کە هاتونەتە لای ئەم نەخۆشن، بۆیەش هاتوون چونکە نەخۆشن، کەواتە ئەو بابەتانەی کە ئێمە لێرەدا باسیان دەکەین ئەو بابەتانەن کە گرفتی شەرعییان هەیە، وبۆیە ئێمە لێەدا باسیان دەکەین.

**دووەم:** دەبێت هەموو لایەك ئەوە بزانین ئەم سیستەمە ئابووریەی کە ئەمرۆ هەیە ولەکۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا بەرقەرارە وەك سەرجەم سیستەمەکانی تری سیاسی وسەربازی وکۆمەڵایەتی ورۆشنبیری وبازرگانی، هەڵقوڵاوی هەناوی سیستەمێکی عەلمانییە و لەسەر بنەمایەکی شەرعی ڕەسەن دانەمەزراوە، تا ئێمە بڵێین ڕێگە شەرعییەکانمان لەخەڵکی گرتوە، ئەم سیستەمە لەسەر بنەمایەکی سوودگەرایی سەرمایەداری ڕۆژئاوایی دامەزراوە وپێویستی بەپێداچوونەوە وڕاستکردنەوە هەیە لەسەر بنەما ئابووریە شەرعییەکان.

**سێیەم:** ئێمە کاتێك لێکدانەوە بۆ بابەتێکی شەرعی دەکەین، پێویستە بەڵگەکانی بابەتەکە بەپێی ڕیزبەندی سەرچاوەکانی حوکمی شەرعی ڕەچاو بکەین، نەك بە ئارەزووی خۆمان، سەرچاوە شەرعییەکانیش بەپێی ڕیزبەندییان بریتین لە قورئان وسوننەت وکۆدەنگی زانایان وقیاس وإستصحاب وإستحسان وئەو بەرژەوەندیانەی کە دەقێکی شەرعییان لەسەر نەهاتووە وقسەی هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ وکلتور وحوکمی شەریعەتەکانی پێش ئیسلام.

کەواتە هەر بابەتێك بەڵگەی دەقی قورئان یان فەرموودەی پێغەمبەری ﷺ لەسەر بوو، ئیتر بۆ وەرگرتنی حوکمەکەی هیچ شتێکی تر وەرناگرین و ناچین بۆ هیچ سەرچاوەیەکی تر، بابەتی سوویش یەکێکە لەو بابەتانەی کە دەقی قورئان وسوونەتی لەسەرە؛ هەر بۆیە بەرژەوەندی خەڵکی لێرەدا ناکرێتە سەرچاو، وپێش دەقەکانی قورئان وسوننەت ناخرێت.

**چوارەم:** کاتێك باسی بەرژەوەندی خەڵکی دەکەین وەك سەرچاوەیەکی حوکمی شەرعی، پێوستە ئەوەمان لەیاد نەچێت، تەنها ئەو بەژەوەندییانە دەبنە سەرچاوەی حوکمی شەرعی کە بەڵگەی شەرعی لەسەر وەرگرتن یان ڕەتکردنەوەیان نەهاتووە وپێیان دەگوترێت بەرژەوەندییە کراوە یان هێڵراوەکان (المصالح المرسلة) بەڵام ئەو بەرژەوەندییانەی دەقیان لەسەر هاتووە وەکو پاراستنی بەرژەوەندی ژیان، وعەقڵ، وماڵ، ئەمانە دەق دەیانپارێزێت وبەرجەستەیان دەکات، ئەو شتانەیش کە لەڕووکەشدا لەبەرژەوەندی دەچن وبەڵام دەق ڕەتیان دەکاتەوە ئەوانە نەبەبەرژەوەندی ئەژمار دەکرێن، ونەدەیشبنە سەرچاوەی حوکمی شەرعی، وەکو بەرژەوەندییەکانی دزی، وسووخۆری، وداوێنپیسی وهتد.... ئێستا سوو خۆری لەو بەشەیە کە دەقەکانی شەرع ڕەتیان کردۆتەوە، ئیتر ئێمە چۆن دەتوانین بیکەینە بەرژەوەندی بۆ خەڵکی وبەرگری لێبکەین. بۆ خوا باشتری لێدەزانێت کە قەدەغەی دەکات وسەرکۆنەی دەکات، یان خەڵکانی تر؟!!!. بۆیە خوای پەروەردگار کاتێك سووی قەدەغە ویاساغ کردوە، لەبەرژەوەندی خەڵکانی هەژار قەدەغەی کردوە، تا دەوڵەمەندەکان نەیانچەوسێننەوە، وبەزۆر سوویان لێ وەرنەگرن، کەچی ئێستا خەڵکی وا هەیە دەڵێت با لەبەر بەرژەوەندی خەڵکانی هەژار ڕێگەی پێبدەین، ئاخر کەسێك ئەلف وبێی شەرع بزانێت چۆن قسەی وادەکات؟!.

# بەشی یەک[١]

## سیستەمی ئابووری ئیسلامی و سوو

لەم بەشەدا قسە لەسەر دوو تەوەر دەکەین کە بریتین لە:

**یەکەم:** بنەماکانی سیستەمی ئابووری ئیسلامی وتایبەتمەندییەکانی

**دووەم:** پێناسەی سوو.

### یەکەم: بنەماکانی سیستەمی ئابووری ئیسلامی وتایبەتمەندییەکانی:

سیستەمی ئابووری ئیسلامی لەسەر کۆمەڵێك بنەمای سەرەکی دادەمەزرێت کە گرنگترینیان ئەمانەن:

١- ماڵ وسەروەت وهەرچی لەدونیادا هەیە هی خوای گەورەیە ومرۆڤەکان تەنها مافی بەگەڕخستن وبەکارهێنانیان هەیە، بەپێی ئەو نەخشەیەی خوای گەورە بۆی دیاری کردون:

لەزۆر دەقی قورئاندا خوای گەورە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە خاوەنی ڕاستەقینەی ماڵ تەنها زاتی ئەوە بۆ نموونە دەفەرموێت: ﴿قُلِ اللَّهُمَّ مَالِكَ الْمُلْكِ تُؤْتِي الْمُلْكَ مَن تَشَاء وَتَنزِعُ الْمُلْكَ مِمَّن تَشَاء﴾[٢]. واتە: بڵێ ئەی خودای خاوەنی ڕاستەقینەی موڵك ودەسەڵات، هەرکەس خۆت بتەوێت موڵك ودەسەڵاتی پێدەدەیت، ولەهەرکەسیش خۆت بتەوێت موڵك ودەسەڵات وەردەگریتەوە. یان دەفەرموێت: ﴿لِلّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا فِيهِنَّ﴾[٣]. [٤] واتە: خاوەندارێتی ئاسمانەکان وزەوی وهەرچیش کە تێیاندایە تەنها هی خودا خۆیەتی.

---

١- ئەم بەشە ڕۆژی (٦/صفر/١٤٣٦) بەرامبەر (٢٠١٤/١١/٢٩) تۆمار کرا.

٢ - سورة آل عمران: الآية (٢٦).

٣ - سورة المائدة: الآية (١٢٠).

٤- ئەمانە وچەندین ئایەتی ترمان هەیە کە هەموویان جەخت لەسەر هەمان واتا دەکەنەوە لەوانە: ﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللّهَ لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾. سورة البقرة: الآية (١٠٧). ﴿إِنَّ اللّهَ لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾. سورة التوبة: الآية (١١٦). ﴿وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾. سورة النور: الآية (٤٢). ﴿الَّذِي لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾. سورة الفرقان: الآية (٢). ﴿لِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾. سورة الشورى: الآية (٤٩).

جا لێرەدا پرسیارێك لای هەمووان دروست دەبێت ئەویش ئەوەیە: ئەگەر خاوەنی ڕاستەقینەی موڵك تەنها خوای گەورەیە، ئەی خاوەنداریێتی مرۆڤەکان بۆ ئەو پارە وسامانانەی لەبەر دەستیاندایە واتای چییە؟ وتا چەندە؟ وچۆن بەکاری دێنن؟.

خوای گەورە لەو بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿وَأَنفِقُوا مِمَّا جَعَلَكُم مُّسْتَخْلَفِينَ فِيهِ﴾[1]. واتە: ببەخشن لەو پارە وداهاتەی کە ئێوەمان تێدا کردۆتە جێنشین ومافی بەکارهێنانیمان پێداون.

کەواتە ئێمە خاوەنی ڕاستەقینەی هیچ شتێك نین بەخۆیشمانەوە، بەڵکو خاوەنی ڕاستەقینەی هەموو شت تەنها خوای گەورەیە، ئێمە تەنها بۆ ماوەیەك و وەك تاقیکردنەوە مافی بەکارهێنانی شتەکانمان پێدراوە، هەروەك چۆن ساتەکانی تەمەن وئەندامانی جەستە وحەز وئارەزووەکانمان بەکار دەهێنین بۆ ماوەیەك، ئاوهایش پارە وسامانەکانمان وەك ئامرازی جێبەجێ کردنی خواستەکانمان بۆ ماوەیەك بەکار دەهێنین، ودواتر کۆتایی بەماوەی تەمەن دێت وهەموو ئەوانەی کە پێماندراوە لێمان وەردەگیرێتەوە وهەمووی دەگەڕێتەوە بۆ خاوەنی ڕاستەقینەی خۆی کە خودای بێ هاوتایە.

هەر بۆیە لەسیستەمی ئابووری ئیسلامییدا مرۆڤ ئازاد نییە لەبەکارهێنانی ئەو پارانەی لەبەردەستیدایە، بەڵکو دەبێت خاوەنە ڕاستەقینەکەی کەخودایە ڕێوشوێنی بەدەستهێنان وخەرج کردن وشێوازی بەکارهێنانی دیاری بکات، ومرۆڤەکانیش تەواو پابەندبن بەو ڕێنماییانەوە، تەنها ئەم سیستەمەیش کە خوا دایدەنێت زامنی دەستبەرکردنی مافەکانی هەموو چین وتوێژەکانە بەشێوەیەکی دادوەرانە ودوور لەهەموو ستەم وزیادەڕەوی وکەم وکورتی وپەڕگیرییەك.

---

١ - سورة الحديد: الآية (٧).

٢- سیستەمی ئابووری ئیسلامی لەسەر بنەمای خاوەندارێتی تاك و كۆمەڵگە پێك دێت:

لە ئابووری ئیسلامییدا تاكەكان مافی خاوەندارێتییان هەیە ودەتوانن لەرێگە شەرعییەكانی وەكو مامەڵە وبەخشین ومیرات وچەندین رێگەی تر ببنە خاوەنی دەسمایە وئابووری سەربەخۆی خۆیان وبۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان پارە وداهاتەكانیان بەكار بهێنن وهەموو رێوشوێنێكیش بۆ پارێزگاری كردنی ئەو مافەیان دابین كراوە وهەر لەو پێناوەیشدایە كە خواردنی ماڵی خەڵك وپێشێلكردنی مافی خاوەندارێتی تاكەكان بەبێ رەزامەندی خۆیان بەشێوەیەكی گشتی یاساغ وقەدەغە كراوە.

ئەمەیش پێچەوانەی سیستەمی سۆسیالیستییە كە دان بەخاوەندارێتی تاكدا نانێت وهەوڵی سڕینەوەی دەدات ورۆحی ململانێ وكێبركێ لەناو تاكەكاندا دەكوژێت؛ چونكە ئەگەر تاك مافی خاوەندارێتی نەبێت ئیتر لەپێناو چیدا خۆی ماندوو بكات؟. ئەگەر هەموو خەڵكی بەجیاوازی توانا وهەوڵ وكۆششیانەوە وەك یەك سەیر بكرێن، ئەوكات خەڵكانی تەمەڵو تەوەزەلو مشەخۆر جیاوازیان چییە لەگەڵ خەڵكانێك كە شەو ورۆژ دەخەنە سەر یەك لەپێناو بەدەست هێنانی بژێوی ژیان وخۆشگوزەرانی ماڵ ومنداڵ و كۆمەڵگەكانیاندا.

لەبەرامبەریشدا پێچەوانەی سیستەمی سەرمایەدارییە كە تەنها برەو بەخاوەندارێتی تاك دەدات لەسەر حیسابی بەرژەوەندی گشتی؛ بۆیە لە سیستەمی ئابووری ئیسلامیدا جگە لە برەودان بەخاوەندارێتی تاك، كۆی تاكەكانیش پێكەوە لەرێی دەوڵەت ودەسەڵاتی سیاسیەوە خاوەندارێتی كۆمەڵێك دەزگا ودامەزراوەی دارایی دەكەن، كە داهاتەكەی بۆ بەرژەوەندی گشتی دەگەڕێتەوە وئەم جۆرە خاوەندارێتیەیش رێوشوێنی پاراستن وگەشەكردنی خۆی هەیە. بۆ نموونە لەسیستەمی ئیسلامییدا (بیت المال، أوقاف، حمى) مان هەیە، كە ئەمانە هەموویان دامەزراوەی دارایی گشتیین و داهاتەكانیان بۆ بەرژەوەندی گشتی بەكاردێن.

٣- سیستەمی ئابووری ئیسلامی لەسەر بنەمای دادگەری كۆمەڵایەتی دامەزراوە:

ئیسلام لەڕێی سیستەمێکی ئابووری مرۆڤدۆستانەوە هەوڵدەدات پەیوەندی نێوان تاکەکانی کۆمەڵگە تۆکمە بکات وچینە جیاوازەکانی لەڕووی ئابووریەوە لێك نزیك بکاتەوە، تا برایانە پێکەوە بژینو کەلێن وکەم وکورتییەکانی یەکتر پڕ بکەنەوە.

ئەمەیش پسان پێچەوانەی سیستەمی سۆسیالیستی مارکسییە کە چینەکانی کۆمەڵگە دەکاتە دوژمنی یەکتر وبەگژ یەکتریاندا دەکات ورۆحی ململانێ ویەکترسڕینەوەیان لەناخدا دروست دەکات. بەداخەوە ئەم جۆرە گوتارە هەتا ئێستا لەکۆمەڵگەی ئێمەدا بوونی هەیە وهەندێك ڕێکخراوی بەناو مەدەنی پەیڕەوی دەکەن وبەردەوام لەهەوڵی ئەوەدان چین وتوێژەکانی کۆمەڵگە بکەنە دوژمنی یەکتر، تەنانەت کار گەیشتۆتە ئەوەی کە منداڵ بەگژ باوك، وژن بەگژ هاوسەرەکەی، و قوتابی بەگژ مامۆستاکەیدا بکەن، ئەم گوتارە تاك واپەروەردە دەکات کە هەمیشە بەچاوی دوژمن سەیری بەرامبەرەکەی بکات ولەبۆسەدا بێت بۆی تامافەکانی خۆی لێ بسەنێتەوە، ئەمەیش پێچەوانەی گوتاری ئیسلامییە کە لەسەر بنەمای ڕێز ودڵسۆزی وبەزەیی وخۆشەویستی تاکەکان پەروەردە دەکات.

ئیسلام هەمیشە هانی دەوڵەمەندەکان دەدات کە دەسگیرۆیی هەژارەکان بکەن وبەچاوی بەزەیی وسۆزەوە مامەڵەیان لەگەڵ بکەن وبەگیانێکی برایانەوە بەدەم خواستەکانیانەوە بچن، هەر لەو پێناوەیشدا زەکات وبەخشینی لەسەر دەوڵەمەندەکان پێویست کردووە وجگە لەوەش هەڵیناون تا لەڕێگەی قەرز وخواستن وبەخشین وزۆر ڕێگەی ترەوە داهات وسامانەکانیان بخەنە خزمەت هەژارانەوە.

سەرباری ئەمانەیش هەندێك ئەرك یان تاوان هەن کە بەدەستگیرۆیی هەژاران وتێرکردنیان قەرەبوو دەکرێنەوە، لەوانە: ڕۆژوی ڕەمەزان بەتێرکردنی هەژارێك قەرەبوو دەکرێتەوە[١]، هەروەها کوشتنی هەڵە کەفارەتەکەی تێرکردنی شەست هەژارە، وکەفارەتی (ظهار)[٢] یش هەروەها، ئەمانە هەمووی لەپێناو ئەو مەبەستەدایە وتا هەژاران واهەست

---

١ - دیارە ئەمە بۆ ئەو کەسانەیە کە هەرناتوانن بەرۆژوو بن، جا یان بەهۆی پیرییەوە، یاخود بەهۆی بوونی نەخۆشی درێژخایەنەوە، ئەگینا خەڵکانی تر کەناتوانن لە ڕەمەزاندا بەرۆژووبن بەهۆکارێکی کاتیەوە، وەکو ئافرەتی سك پڕ یان شیردەر، ئەوانە دوای ڕەمەزان ڕۆژووەکانیان دەگرنەوە و بۆیان نییە فیدیە بدەن.

٢ - بریتیە لەوەی کەسێك خێزانەکەی بشوبهێنێت بە دایکی یان بەخوشکی یان بەهەر ئافرەتێك کە بەهەمیشەیی پێی ناشێت ولێی حەرامە پێی بڵێت: وەکو خوشك و دایکم وابیت یان لە جێی دایکم یان خوشکم بیت.

بكەن زیادبوونی دەسمایەی دەوڵەمەندەكان لەبەرژەوەندی ئەوانە، وهیچ رق وئێرەییەكیشیان بەرامبەر دەوڵەمەندەكان لەدڵدا دروست نەبێت.

٤- لەسیستەمی ئابووری ئیسلامییدا ماڵ تەنها ئامرازە وئامانج نییە ومرۆڤ بەچەندین ڕێگە دەتوانێت پەیدای بكات ودەستی بخات؛ بەڵام لەسیستەمی سەرمایەداری وسۆسیالیستیدا ماڵ ئامانجە وهۆكارەكانی بەرهەم هێنان ودەستخستنیشی پیرۆزە ومرۆڤەكان ئازادن بەهەر شێوەیەك پەیدای دەكەن و بەهەر شێوەیەكیش بەكاری دەهێنن. بەبێ خوێندنەوە وگوێدانە هیچ بنەمایەكی ئاینی، یان مرڤدۆستی، یان تەنانەت ئەخلاقی، هەر بۆیە لەسیستەمی سەرمایەدارییدا واتایەك بۆ بەزەیی نییە ونامێنێتەوە، ئەمرۆ دەوڵەتە زلهێزەكانی دونیا هەرگیز بەبێ بەرامبەر هاوكاری وڵاتە هەژارەكان ناكەن وبەبێ سوو قەرزیان پێ نادەن، جاری وا هەیە كار دەگاتە ئەوەی كە هەندێك لەو وڵاتانە یان كۆمپانیا سەرمایەدارییەكانیان سیاسەتی زۆر نامرۆڤانە دژ بە وڵاتە هەژارەكان دەگرنە بەر، لەوانە پەنا دەبەنە بەر هەڵگیرساندنی شەڕی خوێناوی وكاولكاری كە سەدەها هەزار كەسی تێدا دەبێتە قوربانی تەنها بەمەبەستی ساغ كردنەوەی چەك وتەقەمەنییەكانیان، وتاقیكردنەوەی كاریگەری كاولكاریان لەسەر مرۆڤ وژینگەی ئەو وڵاتانە، یان زۆر جار بە ملیونەها تەن گەنم دەكەن بەژێر ئاوەوە، بۆ ئەوەی نرخەكەی دانەبەزێت، یان پەنا دەبەنە بەر بڵاو كردنەوەی نەخۆشی وپەتا وڤایرۆس ومێرووی زیانبەخش تا بازاڕ بۆ ساغكردنەوەی دەرمان وكاڵاكانیان بكەنەوە، بێ گوێدانە ئەوەی كە قوربانییەكانی ئەم جۆرە سیاسەتانە تووشی چ بەدبەختی ونەهامەتیەك دەبن وچ باجێكی قورس دەدەن.

٥- ئیسلام بۆ چەسپاندنی ئەم بنەمایانە ڕێگەی ڕازیكردن وقەرەبوكردنەوە بەكار دهێنێت، بۆیە كاتێك بەدەوڵەمەندێك دەڵێت دەستگیرۆیی خەڵكی هەژار بكە، خوای گەورە بەچەندین ڕێگە بەڵێنی قەرەبوكردنەوەی پێ دەدات، ئەمەیش بەپێچەوانەی سیستەمی سۆسیالیستیماركسییەوە، كە لەپێناو چەسپاندنی بنەماكانیدا ڕێگەی زەبرو زەنگ دەگرێتە بەر، لەسیستەمی ماركسیدا هەزارەها خەڵك بكوژێت، هەزارەها دەوڵەمەند لەسێدارە بدەیت، جۆرەها توندو تیژی ئەنجام بدەیت لەپێناو سەپاندنی سیستەمێكی شكستخواردودا، كارێكی ئاساییە وڕێگە پێدراوە.

٦- سیستەمی ئابووری ئیسلامی وەك سەرجەم سیستەمەكانی تری ئەم ئاینە پیرۆزە، هەموو چالاكی وكار وبنەماكانی دەبەستێتەوە بەقیامەت ودواڕۆژەوە، واتە مرۆڤ هەرچی بكات لەدونیا لێی بەرپرسیارە ودواڕۆژ سزا یان پاداشتی لەسەر وەردەگرێت، بەمەیش مرۆڤەكان هەڵدەنێت بۆ هەموو كارێكی چاكە، ودووریشیان دەخاتەوە لەهەموو كارێكی خراپە، وئەم تایبەتمەندیەیش تەنها لەسیستەمی ئیسلامیدا هەیە، پێغەمبەری خودا ﷺ لەو بارەیەوە لە فەرموودەیەكدا دەفەرمویێت: {لاَ تَزُولُ قَدَمَا عَبْدٍ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَّى يُسْأَلَ عَنْ أربع: عَنْ عُمُرِهِ فِيمَا أَفْنَاهُ، وَعَنْ عِلْمِهِ مَا فَعَلَ بِهِ، وَعَنْ مَالِهِ مِنْ أَيْنَ اكْتَسَبَهُ وَفِيمَا أَنْفَقَهُ، وَعَنْ جِسْمِهِ فِيمَا أَبْلاَهُ}[1]. واتە: لە ڕۆژی دواییدا هیچ كەس لەبەردەم خوای گەورە پێكانی ناترازێ ودەرباز نابێت تا چوار پرسیاری لێ نەكرێت: یەكەم: تەمەنی لەچیدا بەسەر بردوە؟ دووەم: ئەو زانستەی هەیبووە چۆنی بەكارهێناوە وچی پێ كردوە؟ سێیەم: ئەو پارە وسامانەی كە هەیبووە چۆنی پەیدا كردوە ولەچیدا خەرج كردوە؟ چوارەم: لاشەی لەچیدا ڕەتاندوە وبەكار هێناوە؟.

ئەم فەرموودەیە بۆمان دەردەخات كەمرۆڤ دەربارەی هەموو شتەكان یەكجار پرسیاری لێ دەكرێت، بەڵام دەربارەی پارە وسامانەكەی دووجار پرسیاری لێ دەكرێت[2]، ئەمەیش مرۆڤ وا لێدەكات كەزۆر بە هۆشیاری مامەڵە لەگەڵ ئەم پرسە هەستیارەی ژیانی بكات كەڕۆژانە لەوانەیە سەدەها جار دووبارە بێتەوە؛ بەڵام لە سیستەمە ئابووریەكانی تری دونیادا پارە وسامان تەنها بۆ دونیایە، بۆیە مرۆڤەكان تێیدا بەشێوەیەكی ڕەها هەرچی وهەرچۆن بێت هەر لەهەوڵی پەیداكردن وكۆكردنەوەیدان وهەر بەهەمان شێوەیش خەرجی دەكەن وبەردەوامیش كار بۆ ئەوە دەكەن كەخۆیان لەو یاسایانە بدزنەوە كە تا ڕادەیەك ئازادییەكانیان كۆت دەكات، یان باجیان لەسەر دادەنێت؛ بەڵام ئەمە لەسیستەمی ئابووری ئیسلامیدا ڕوو نادات؛ چونكە تاكەكان باش دەزانن كە ئەگەر لە یاساكانی دونیایش قوتار

---

١ - الترمذي (محمد بن عيسى الترمذي السلمي)، سنن الترمذي (الجامع الصحيح)، ج٤، دار إحياء التراث العربي، بيروت، ص٦١٢، رقم الحديث (٢٤١٧). تحقيق: أحمد محمد شاكر وآخرون. وقال الترمذي: حديث حسن صحيح، وقال المحقق: صحيح. والحديث صححه الألباني أيضا في: محمد ناصر الدين الألباني (محمد ناصر الدين الألباني)، صحيح الترغيب والترهيب، ج٣، ط٥، مكتبة المعارف، الرياض، ص٢٢٧، رقم الحديث (٣٥٩٢). قال: حديث حسن صحيح.

٢ – هەر لەبەر ئەمەیە كە دەوڵەمەندەكان پێنج سەد ساڵ دوای هەژارەكان دەچنە بەهەشتەوە، چونكە پارەیان زۆر بووە، ولێپێچینەوەی وردیان لەگەڵ دەكرێت، وزۆر لەسەری ڕادەگیرێن.

بن ئەوە لەیاساکانی دواڕۆژ وبەردەم دادگای خودای بەتوانا دەربازبونیان مەحاڵە، وسزای دواڕۆژیش هەرگیز لەگەڵ سزای دونیا بەراورد ناکرێت.

ئەمانە وچەندین بنەما وتایبەتمەندی تر هەن کەپێمان دەڵێن سیستەمی ئابووری ئیسلامی تاکە سیستەمە کە زامنی دابینکردنی خواستەکانی هەموو تاکەکانە بەبێ جیاوازی لەدونیا ودواڕۆژیاندا.

## دووەم: پێناسەی سوو (الربا):

سەرەتا وبەر لەوەی بچینە سەر پێناسەی وشەی سوو (ربا) لە ڕووی زمانەوانییەوە، دەمەوێت ئەوە بڵێم کە بەکارهێنانی وشەی سوود لەزمانی کوردیدا بەرامبەر وشەی (ربا) لەزمانی عەرەبیدا هەڵەیە؛ چونکە وشەی سوود بەواتای قازانج دێت کە لەعەرەبیدا پێی دەگوترێت (ربح) یان (فائدة) وئەوەیش کارێکی ڕێگەپێدراو وخوازراوە؛ بەڵام (ربا) کارێکی حەرامە و یاساغە ویەکێکە لەتاوانە گەورەکان، هەرچەندە لەکوردیدا وشەیەکی وامان نییە دەقا ودەق واتای (ربا) بدات بەدەستەوە؛ بەڵام دەبێت ئاگامان لەو جیاوازییە بێت؛ چونکە زۆر کات دامەزراوە سووخۆریەکان بەمەبەست ئەو جۆرە وشانە بەکاردەهێنن، تا چاوبەست لەخەڵکی بکەن ولەڕێی گۆڕینی زاراوەکانەوە سنورەکانی حەڵاڵ وحەرامیان لێ بشێوێنن، هەر وەك چۆن بە عارەق وشلەمەنییە بێهۆشکارەکانی تر دەڵێن مەشروباتی ڕۆحی، یان بە بەدڕەوشتی وبێشەرمی دەڵێن ئازادی تاکەکەسی، لێرەشدا زۆر جار بەهەمان مەبەست وشەی سوود بەکار دەهێنن. بۆیە پێویستە هەموو لایەك ئەوە بزانین کە ئیسلام دژی سوود وقازانج نییە؛ بەڵکو دژی سووخۆری و (ربا) یە؛ بەڵام وەکو پێشتریش گوتمان بەخاتری ئەوەی کە لەزمانی کوردیدا وشەیەکی وامان نییە کە بەرامبەر وشەی (ربا) بێت، ئەوا لێرەدا و بەناچاری لەبەرامبەریدا وشەی سوو بەکار دەهێنین، تا بتوانین لە سوود کە وشەیەکی شەرعی وڕێگە پێدراوە جیای بکەینەوە.

أ- پێناسەی سوو (ربا) لە ڕووی زمانەوانییەوە: وشەی ڕیبا لەزمانی عەرەبیدا بە واتای زیادە وگەشەکردن وزۆری وباڵادەستی دێت، خوای گەورە لە قورئاندا ولەچەند جێگەیەکی جیاوازدا وشەی (ربا) ی بۆ هەر یەك لەم واتایانە بەکارهێناوە:

بۆ نموونە لە باسی ژیانەوەی زەویدا دەفەرموێت: ﴿وَتَرَى الْأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَا أَنزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاءَ اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ﴾[1]. واتە: کە سەیری زەوی دەکەیت دەبینیت خامۆش وبێ جوڵەیە؛ بەڵام کەبارانمان بەسەردا باراند دەکەوێتە جوڵە وگژ وگیاکانی سەردەردێنن وگەشە دەکەن.

وە دەربارەی نەتەوەیەك لەنەتەوەکان دەفەرموویت: ﴿أَن تَكُونَ أُمَّةٌ هِيَ أَرْبَى مِنْ أُمَّةٍ﴾[2]. واتە: دەکرێت نەتەوەیەك لەنەتەوەیەکی تر زیاتر بێت لە ڕووی ژمارە وزۆری هاووڵاتیان وپارە ودەسەڵاتەوە.

وە دەربارەی سزای یەکێك لەنەتەوەکان دەفەرموویت: ﴿فَعَصَوْا رَسُولَ رَبِّهِمْ فَأَخَذَهُمْ أَخْذَةً رَّابِيَةً﴾[3]. واتە: ئەوانە لەفەرمانی پێغەمبەری خودای خۆیان یاخی بوون و سەرپێچیان کرد؛ بۆیە خوای گەورە لەناوی بردن وسزایەکی پڕ ئازاری دان کە لە سزای نەتەوەکانی پێش خۆیان زیاتر بوو.

وەدەربارەی (ربا) خۆی دەفەرموێت: ﴿يَمْحَقُ اللَّهُ الرِّبَا وَيُرْبِي الصَّدَقَاتِ﴾[4]. واتە: خوای گەورە فەڕو بەرەکەت لە سوو هەڵدەگرێت و بەرەکەت دەخاتە چاکە و بەخشینەوە.

کەواتە وشەی (ربا) لە قورئاندا ولە ڕوی زمانەوانیەوە بۆ چەند واتایەکی جیاواز بەکار هاتوە.

ب- پێناسەی سوو (ربا) لە ڕووی زاراوەوە:

زانایان دەربارەی پێناسەی سوو وەك زاراوەیەکی شەرعی چەند پێناسەیەکی جیاوازیان هەیە لەوانە:

حەنەفییەکان لە پێناسەی سوودا دەڵێن: (فضل خال عن عوض بمعيار شرعي، مشروط لأحد المتعاقدين في المعاوضة)[5]. واتە: زیادەیەکی بێ بەرامبەرە بەپێوەری شەرعی، یەکێك لە لایەنەکانی گرێبەستەکە دەیکاتە مەرج لەسەر لایەنەکەی تر لەکاتی مامەڵە کردندا.

---

١ - سورة الحج: الآية (٥).
٢ - سورة النحل: الآية (٩٢).
٣ - سورة الحاقة: الآية (١٠).
٤ - سورة البقرة: الآية (٢٧٦).
٥ - عبد الغني الغنيمي، اللباب في شرح الكاب، ج٢، المكتبة العلمية، بيروت، ص٣٧، تحقيق وتعليق: محمد محيي الدين عبد الحميد.

مالیکییەکان دەربارەی سوو دەڵێن: (كل زيادة لم يقابلها عوض)[١]. واتە: سوو هەموو زیادەیەکە کە بەرامبەرێکی نەبێت.

شافیعییەکانیش لە پێناسەیدا دەڵێن: (عقد على عوض مخصوص، غير معلوم التماثل في معيار الشرع حالة العقد، أو مع تأخير في البدلين أو أحدهما)[٢]. واتە: گرێبەستێکە لەسەر بەرامبەرێکی دیاریکراو، کە ڕێژەکەی بەپێی پێوەرە شەرعییەکان کاتی ئەنجامدانی گرێبەستەکە نەزانراوە[٣]، یان یەکێك لە کاڵاکان یان هەردوکیان لە کاتی ئەنجامدانی گرێبەستەکە ئامادە نەبێت[٤].

حەنبەلییەکانیش لە پێناسەیدا دەڵێن: (تفاضل في أشياء، ونساء في أشياء، مختص بأشياء، ورد الشرع بتحريمها)[٥]. واتە: سوو هەندێك جار زیاد بوونی یەکێکە لەکاڵاکان یان ئامادەنەبوونی یەکێکە لەکاڵاکان، وە تایبەتە بەهەندێك کاڵاوە[٦]، کەشەرع حەرامی کردوە.

ئەگەر سەرنجی هەموو ئەو پێناسانە بدەین پێناسەی مالیکییەکان لەهەموویان فراوانترە؛ چونکە هەموو زیادەیەك دەگرێتەوە کە بەرامبەرێکی نەبێت لەهەموو

---

١ - إبن العربي (محمد بن عبد الله)، أحكام القرآن، ج١، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت، ص٣٢٢.

٢ - الغمراوي (محمد الزهري)، السراج الوهاج على متن المنهاج، دار المعرفة، بيروت، ص١٧٦.

٣ - ئەمە جۆری یەکەمە لەسوو کە پێی دەگوترێت سووی زیادە (ربا الفضل)، بۆ نموونە تۆ (١٠٠غم) ئاڵتون دەفرۆشیت بەکەسێك بە (١١٠غم) یان بەمشتێك ئاڵتون کەنازانین کێشەکەی چەندە، ئەم دوو حاڵەتە هەردووکیان سووە؛ چونکە لەوەی یەکەمدا زیادەکە دیارە و بە بەر چاوەوەیە ولەوەی دووەمدا کێشی مشتەکە نادیارە وشافیعییەکانیش ڕێسایەکیان هەیە دەڵێت: (الجهل بالتماثل كالعلم بالتفاضل). واتە: نەزانینی هاوتا بوون وەکو زانینی زیادە وایە.

٤ - ئەمە جۆری دووەمە لە سوو کە پێی دەگوترێت سووی دواکەوتن یان ئامادە نەبوونی یەکێك لە کاڵاکان (ربا النسيئة) ، بۆ نموونە: لە کاتی فرۆشتنی ئاڵتون بە ئاڵتون، یان زیو بەزیو، یان دراو بە دراو، یان ئاڵتون بە دراو، یان گەنم بەگەنم، دەبێت هەردوو کاڵاکە لە کاتی ئەنجامدانی گرێبەستەکە ئامادەبن، خۆ ئەگەر یەکێکیان ئامادە نەبوون مامەڵەکە دەبێتە سوو.

٥ - السيوطي (مصطفى بن سعد بن عبده)، مطالب أولي النهى في شرح غاية المنتهى، ج٣،ط٢، المكتب الإسلامي، بيروت، ص٣.

٦ - واتە سووی کڕین وفرۆشتن تایبەتە بەهەندێك کاڵاوە وەکو : (ئاڵتون، زیو، دراو بەهەموو جۆرەکانییەوە، گەنم، جۆ، خورما، خوێ، ترێ) وچەند شتێکی تر، وەهەندێك شت هەیە سووی مامەڵەی تێدا دروست نابێت وەکو: (خانوو، سەیارە، جل وبەرگ، وهتد)، بەڵام سووی قەرز لە هەموو شتێکدا دروست دەبێت.

مامەڵەکاندا بەقەرزیشەوە؛ بەڵام پێناسەکانی ئەوانی تر تەنها ئەو گرێبەستانە دەگرێتەوە کە ئاڵوگۆڕیان تیدایە و سووی قەرز ناگرێتەوە؛ چونکە قەرز مامەڵەیەکی دارایی نییە کە ئاڵوگۆڕی تێدا بێت.

ت- پێناسەی سوو (ربا) لە ڕووی ئابوورییەوە:

سوو لە زاراوەی ئابووریدا چەند پێناسەیەکی بۆ دەکرێت کەهەموویان سووی قەرز دەگرنەوە، وباس لەسووی مامەڵە ناکەن لەوانە:

- سوو بەو نرخە دەگوترێت کە لەبەرامبەر بەکارهێنانی پارەدا وەردەگیرێت، یان بریتییە لە نرخی بەکرێدانی دەسمایە[١].

- یان بریتییە لەو نرخەی کە خاوەن دەسمایە لەبەرامبەر مەترسی بەقەرزدانی پارەکەیدا وەری دەگرێت[٢].

- یاخود بریتییە لەو بەشە قازانجەی کە خاوەن دەسمایە لەقەرزارەکەی وەردەگرێت[٣].[٤].

سیستەمی ئابووری ئیسلامی هەموو ئەم پێناسە وپاساوانە بۆ وەرگرتنی سوو ڕەتدەکاتەوە؛ چونکە سوو لەئیسلامدا تەنها لە قەرزدا دروست نابێت، وقەرزیش لەئیسلامدا بە مامەڵە ئەژمار ناکرێت، تا بەپێوەری قازانج وزیان هەڵسەنگاندنی بۆ بکرێت، بەڵکو کارێکی چاکەخوازی وخۆبەخشانەیە وپێویستە بەبێ بەرامبەر بدرێت؛ چونکە مەرج نییە

---

١ - ئەم پێناسەیە تەنها سووی قەرز دەگرێتەوە و پێی وایە هەروەك چۆن لەبەرامبەر بەکارهێنانی خانوو، یان ئۆتۆمبێل یان هەر کەرەستەیەکی تر پارە وەردەگیرێت، ئاوهایش لەبەرامبەر بەکارهێنانی پارە دەکرێت کرێ وەربگیرێت..

٢ - بەپێی ئەم بۆچوونە پاساوی وەرگرتنی سوو ئەوەیە کە خاوەن دەسمایە کاتێك پارەکەی داوە بەقەرز کەوتۆتە مەترسییەوە؛ چونکە لەوانەیە پارەکەی دەست نەکەوێتەوەو بۆیە بۆی هەیە لەبەرامبەر ئەو مەترسییەدا پارە وەربگرێت.

٣ - لەم بۆچوونەیشدا پاساوی سوو خواردن ئەوەیە کە قەرزارەکە کاری بەپارەی خاوەن قەرزەکەوە کردوە وقازانجی لێکردوە، بۆیە خاوەن قەرزەکەیش مافی ئەوەی هەیە بەشێك لەو داهاتەی بەر بکەوێت.

٤ - د. محمد عمر شابرا، نحو نظام نقدي عادل دراسة للنقود والمصارف والسياسة النقدية في ضوء الإسلام، دار البشير، عمان، ط١٩٩٠، ص١٧٣. حسن عبد الله الأمين، الفوائد المصرفية والربا، الإتحاد الدولي للبنوك الإسلامية، ص٣-٦. مجلة البحوث الفقهية المعاصرة، خالد بن عبد الرحمن المشعل، بحث بعنوان: الفائدة والربا شبهات وتبريرات معاصرة، ع٨٠، ص١٣-٢٣.

قەرز تەنها هی پارە بێت و قەرزی پارەیش مەرج نییە تەنها بە مەبەستی مامەڵە بێت؛ بەڵكو لەوانەیە بە مەبەستی نەخۆشی یان كردنەوەی خانوو یان پڕكردنەوەی هەر پێداویستییەكی تر قەرزەكە كرابێت، خۆ ئەگەر بە مەبەستی مامەڵەیش بێت ئەوە مەرج نییە كەسی قەرزار سوودی لەمامەڵەكەی بینیبێت؛ بەڵكو دەكرێت زیانی كردبێت، جا كابرای سوو خۆریش لەولاوە بڕێك پارەی زیادەی خولاوی لەسەر بكاتە ماڵ ئەوكات ئەوەندی تر قەرزارەكە بارگران دەبێت وهەرگیز لەژێر باری قەرزاری ڕزگاری نابێت، ئەمەیش تەواو پێچەوانەیە لەگەڵ مەبەستی شەرعی قەرزدا كە بریتییە لە دەستگیرۆیی كردنی خەڵكانی هەژار و نەدار و هاوكاری كردنیان بەمەبەستی ڕزگاركردنیان لە كۆسپ و ناسۆرەكانی ژیان.

سەبارەت بەپاساوی مەرتسی نەگەڕانەوە وفەوتانی قەرزیش، ئیسلام لەبری سوو چەندین ڕێگەی تری داناوە بۆ زەمانەتی وەرگرتنەوەی قەرزەكە لەوانە وەرگرتنی (رهن) و (كفیل) و (كومبیاله) وچەندین ڕێگەی تر، كەلەسایەی ئەوانەدا هیچ مەرتسییەك لەسەر دانەوە و وەرگرتنەوەی پارەی قەرزەكە نامێنێت.

## بەشی دوو[١]

## سوو لە مێژووی مرۆڤایەتی وئاینە جیاوازەکاندا

لەم بەشەدا قسە لەسەر ئەم تەوەرانە دەکەین:

**یەکەم:** سوو لەشارستانییەتە کۆنەکاندا.

**دووەم:** سوو لەئاینی جولەکەدا.

**سێیەم:** سوو لەئاینی مەسیحیدا.

**چوارەم:** سوو لەسەردەمی نەفامی پێش ئیسلامدا.

**پێنجەم:** قۆناغەکانی قەدەغەکردنی سوو لەئیسلامدا.

**شەشەم:** حوکمی سوو لەقورئاندا.

**حەوتەم:** حوکمی سوو لەفەرموودەکانی سەروەردا.

**هەشتەم:** هۆکارەکانی قەدەغەکردنی سوو لەئیسلامدا.

### یەکەم: سوو لەشارستانییەتە کۆنەکاندا:

پێدەچێت بە درێژایی مێژووی مرۆڤایەتی دیاردەی سووخۆری لەکۆمەڵگەکاندا بوونی هەبووبێت: شارەزایانی مێژوو دەڵێن: لەسەدەی هەشتی پێش زاین ولە سەردەمی فیرعەونەکاندا بەتایبەت لەسەردەمی (بۆخۆریس) کە دەگەڕێتەوە بۆ (٢٤) هەمین نەوەی فیرعەونەکان، ڕێژەی سوو گەیشتۆتە (٢٢٪)، بۆیە ناچار بووە بڕیارێك دەربكات کە پارەی سوو قەدەغە ویاساغ بكات.

لەشارستانێتە کۆنەکانی عێراقیشدا و لەسەردەمی ئاشوورییەکان، وکلدانییەکان، وسۆمەرییەکاندا، دەسەڵاتدارانی ئەو سەردەمانە نرخی سوویان بۆ خەڵکی دیاریکردوە وپیاوە ئاینییەکانیان بەناوی خوداکانەوە سوویان لە خەڵك وەرگرتوە، لەسەردەمی کلدانییەکان وسۆمەرییەکاندا ڕێژەی سوو بە (١٥٪ تا ٣٣٪) دیاریکراوە و لەسەردەمی ئاشوورییەکاندا بە لەنێوان (١٢٪ تا ٥٠٪) دیاریکراوە.

---

١ - ئەم بەشە ڕۆژی (٦/١٢/٢٠١٤) تۆمار کرا.

لەسەردەمی بابلییەکانیشدا بەهەمان شێوە دیاردەی سوو بەشێوەیەکی بێویژدانانە بەر بڵاو بووە وهەندێك جار ڕێژەی سوو گەیشتۆتە (٤٥٠٪) تا سەردەمی حامورابی کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ (١٨٠٠ پ.ز)، وئەو لەسەردەمی خۆیدا چەندین چاکسازی ئابووری کردوە، لەوانە ڕێژەی سووی لەنێوان (٣٠٪ تا ٥٠٪) بەیاسا دیاری کردوە.

ئیغریق، و ڕۆمانییەکان، ویۆنانییەکانیش بەهەمان شێوەی گەلانی پێش خۆیان مامەڵەیان بە سوو کردوە، تاکار گەیشتۆتە ئەوەی کاتێك هەژارەکان ناچار دەبوون قەرز بکەن، دەکەوتنە ژێر بەزەیی خاوەن دەسمایەکانەوە کەبۆیان هەبوو لەکاتی نەدانەوەی قەرزەکەیاندا بیانکەنە کۆیلە وئازادی ژیانیان لێ زەوت بکەن، یان بەندیان بکەن، هەر ئەمەیش وایکردوە کەبیریار وفەیلەسوفەکانی ئەو سەردەمە لەنموونەکانی ئەفلاطۆن وئەرسطۆ بەتوندی بەگژ ئەم دیاردەیەدا بچنەوە وبانگەشەی بنەبڕکردنی بکەن، تا ئەو سەردەمەی (سۆلۆن) هات، وزۆرێك لەیاسای میسرییەکانی گواستەوە بۆ یۆنانییەکان، وسیستەمی کۆیلایەتی هەڵوەشاندەوە وڕێگەی دا خاوەن قەرزەکان دەستبگرن بەسەر زەوی وزار وموڵك وکەلوپەلی قەرزارەکاندا؛ بەڵام بۆیان نەبوو خۆیان بکەنە کۆیلە یان بەندیان بکەن[١].

## دووەم: سوو لەئاینی جولەکەدا:

قورئانی پیرۆز دەربارەی دیاردەی سوو لای جولەکەکان دەفەرموویت: ﴿وَأَخْذِهِمُ الرِّبَا وَقَدْ نُهُوا عَنْهُ﴾[٢]. واتە: بە سوو مامەڵەیان دەکرد لەکاتێکدا لێیان قەدەغە ویاساغ کرابوو. ئەمە ئاماژەیەکی ڕوونە بەوەی کە سوو لەشەریعەتی یەهودییەکاندا، بەهەمان شێوەی شەریعەتی ئیسلام حەرام بووە.

لە تەوراتیشدا کە پەڕتووك وشەریعەتی ئاسمانی جولەکەکان خۆیانە، بەهەمان شێوەی قورئان باسی حوکمی سوو دەکات لەسەر جولەکەکان ولەدەقێکیدا دەڵێت: (إذا

---

١ - محمد الجمال، موسوعة الإقتصاد الإسلامي، ط٢، دار الكتب المصرية، ص٣٨٧. مجلة المسلم المعاصر، د. محمود عارف وهبة، بحث بعنوان: نظريات الفائدة (الربا) في الفكر الاقتصادي، ٣٤ع.

٢ - سورة النساء: الآية (١٦١).

أقرضت مالاً لأحد من أبناء شعبي فلا تقف منه موقف الدائن ولا تطلب منه رباً لمالك)[١]. واتە: ئەگەر پارەت دا بەقەرز بەیەکێك لەنەوەکانی من، بەچاوی قەرزارو خاوەن قەرز سەیری مەکە وداوای سووی لێ مەکە.

ولەدەقێکی تردا هاتووە: (وإذا افتقر أخوك وقصرت يده عندك، فأعضده غريباً أو مستوطناً فيعيش معك لا تأخذ منه رباً)[٢]. واتە: ئەگەر براکەت هەژار کەوت ودەستی کورتبوو، هاوکاری وپشتیوانی بکە، ئەو کەسە کەسێکی غەریب بێت یان هاوڵاتی مادەم لەگەڵت دەژی بەسوو پارەی مەدەرێ.

ئەمە حوکمی سووە لەتەوراتدا؛ بەڵام پیاوە ئاینییەکانی جولەکە وەك نەریتی هەمیشەییان هاتن و هەنگاو بەهەنگاو سوویان حەڵاڵ کرد، سەرەتا تەنها بۆ خۆیانیان حەلاڵ کرد وبۆ حاڵەتی پێویستی بەسێ مەرج:

١- رێژەی سوووەکە لە یەك لەسەر پێنجی قەرزەکە زیاتر نەبێت.

٢- سوووەکە بە رەزامەندی کەسەکە خۆی بێت وبەنیەتی دیاریو بەخشین بێت.

٣- لەنێوان دووکەسدا دووبارە نەبێتەوە، واتە هەر دووکەسێك تەنها یەك جار بۆیان هەیە مامەڵەی سوو لەگەڵ یەکتر بکەن.

دوای ئەمە رێگەیاندا بە قوتابییەکانیش بەسوو پارە لە مامۆستا ئاینییەکانیان وەرگرن، بەڵام بەمەرجێك بەرەزامەندی خۆیان بێت وسوووەکەیش بەناوی دیارییەوە بێت.

دواتر بازنەکەیان زیاتر فراوان کرد ورێگەیاندا بەوەی هەموو گەلی جولەکە بۆیان هەیە بەسوو مامەڵە لەگەڵ یەکتر بکەن، بەمەرجێك کەسێکی غەیری جولەکە نێوەندگیرییان بکات.

ئەمەیش وای کرد دیاردەی سوو بەشێوازێکی بەربڵاو لەنێو شوێنکەوتوانی ئاینی جولەکە بڵاوبێتەوە وبیریار وپیاوە ئاینییەکانیان بەتەواوەتی وبەشێوەیەکی رەها بانگەشەی بۆ بکەن، تا کار گەیشتە ئەوەی بازرگانەکانی جولەکە لەئەڵمانیا بیریان لەوە کردەوە، پارە لەجوتیارەکان کۆبکەنەوە وبەسوو بیدەن بەخەڵکانی تر وبەشێکی سوووەکە بدەن

---

١ - سفر الخروج، الإصحاح ٢٢، الفقرة٢٤.

٢ - سفر اللاويين، فصل ٢٥، فقرة ٣٥- ٣٧.

بەجوتیارەکان وبەشەکەی تریشی بۆخۆیان هەڵگرن، دواتر ئەم سیاسەتە پەرەی سەند وبیرۆکەی دامەزراندی بانکی سووخۆری لێکەوتەوە ولەساڵی (١١٥٧ز) لەشاری بوندوقییە لەسەر دەستی بازرگانەکانی جولەکە یەکەم بانکی سووخۆری دامەزرا و دواتریش لەساڵی (١٤٠١ز) بانکێك لەبەرشەلۆنە کرایەوە و هێدی هێدی پەتای کردنەوەی بانکی ئەهلی گواسترایەوە بۆ وڵاتە ئیسلامییەکانیش ولەساڵی (١٨٩٨ز) یەکەم بانکی سووۆری بەناوی بانکی ئەهلی میسری کرایەوە.

هەربۆیە هیتلەر ڕقی زۆری لەجولەکە بوو؛ چونکە پێی وابوو کە ئەوان هۆکاری لاوازکردنی ئەڵمانیا بوون، ولەپەڕتووکی (کفاحی) دا دەڵێت: (ئەو کات کە بۆم دەرکەوت جولەکە ئەو مرۆڤە سووخۆرە خوێن ساردە بێ ئابڕوەیە کە سەروەتەکەی لەو بازرگانییە خراپەدا دەخاتە گەڕ کە کۆمەڵگە لەناو دەبات، تەزوویەك بەهەموو ئەندامەکانی لەشمدا هات)[1].

سێیەم: سوو لەئاینی مەسیحیدا:

لە ئاینی مەسیحیدا بەهەمان شێوەی ئاینی جولەکە وسەرجەم ئاینەکانی تر سوو حەرام بوو وەسزای توندی هەبوو؛ چونکە جگە لەوەی کە کەسی سووخۆر ناچار دەکرا سووەکە بگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی، بەمورتەد وهەڵگەڕاوەیش لەدین پۆلێن دەکرا، باوکە سکوبا لەو بارەیەوە دەڵێت: (هەرکەسێك بڵێت سوو حەرام نییە بەبێباوەڕ ئەژمار دەکرێت). وباوکە یوبنیش دەڵێت: (سووخۆرەکان هەر لەدونیا کەرامەتیان لەدەست دەدەن، ولەپاش مردنیش شایەنی ئەوە نین کفن بکرێن). تەنانەت یەکێك لەبڕیارەکانی مەجمەعی مەسکۆنی[2] (٥) کەلەشاری نیقییە لەساڵی (٣٢٥ز) بەسترا، ئەوەبوو: (هەرکەسێك لەمەودوا سوو بخوات، یان داوا لەکەسێك بکات بۆی وەربگرێت، یان قەرز بەسوو بدات، یان بەهەر فێڵێك بیەوێت قازانجێکی پیس بەدەست بێنێت، ئەوە پێویستە هەموو کەس پەیوەندی

---

١ - إدولف هتلر، كفاحي، ص٢٢، ط١، ١٩٧٤، دار الكتب الشعبية، بيروت.

٢ - بەو کۆنگرانە دەگوترێت کەپیاوانی ئاینی مەسیحی ڕێکی دەخەن بۆ تاووتوێ کردنی کاروباری ئاینەکەیان وکاتێك بە (مەسکۆنی) ئەژمار دەکرێت کە هەموو پیاوانی ئاینی مەسیحی لە جیهاندا بۆ بانگهێشت بکرێت، وبەسەرپەرشتی پاپا خۆی بەڕێوە بچێت.

لەگەڵ بپچڕێت وبەچاوی نامۆ وبێگانە سەیر بکرێت). وەئەم بڕیارە تا ماوەیەکی زۆر کاری پێکراو، ومەسیحیەکان پێوەی پابەند بوون.

بەڵام ئەوانیش بەهەمان شێوەی شوێنکەوتەکانی ئاینی جولەکە پاش ماوەیەك هەنگاو بەهەنگاو سوویان حەڵاڵ کرد، ئەوەبوو سەرەتا بۆ هەندێك حاڵەت وکەسی تایبەت حەلاڵیان کرد لەوانە: بۆ حاڵەتی پێویستی وکەسێك ناچار بێت، وە بۆ کەسی پێنەگەیشتو وەکو ژن وهەتیو، وە لەحاڵەتی غەرامە وبەمەبەستی ناچارکردنی کەسی قەرزار کە قەرزەکەی لەکاتی خۆیدا بگێڕێتەوە، بەم شێوەیە وتا کۆتاییەکانی سەدەی (١٣ز) سووخۆری بەشێوەیەکی بەرتەسك مایەوە. دواتر ولەژێر فشاری سەختی ژیان ودەرکەوتنی چینی دەرەبەگ وسەرمایەدارەکان لەلایەك، وکاڵبوونەوەی هەژموونی کەنیسە وپەراوێزکەوتنی لەکۆمەڵگەکاندا لەلایەکی تر، دیاردەی سووخۆری بەتەواوی پەرەی سەند تاکار گەشتە ئەوەی سوو بوو بەیەکێك لە کۆڵەکەکانی ئابووری کۆمەڵگەکان لە ئەورووپادا[(١)].

## چوارەم: سوو لەسەردەمی نەفامی پێش ئیسلامدا:

حاڵی کۆمەڵگە عەرەبییەکان کە سەدەها ساڵبوو هیچ پەیام وپێغەمبەرێکیان بۆ نەهاتبوو، لەحاڵی کۆمەڵگە ئەوروپییەکان کەسەدەها پێغەمبەریان بۆ هاتبوو لەڕووی سوخۆریەوە باشتر نەبوو، بەڵکو سووخۆری لای ئەمان کارێکی زۆر ئاسایی وڕێگە پێدراو بوو وە بەچەندین شێواز لەگەڵ یەکتر مامەڵەیان بەسوو دەکرد.

دیارترینی شێوازی سوو خۆری لە کۆمەڵگەی عەرەبیدا ئەمانە بوون:

١- سووی قەرز: ئەم جۆرە سووە بەربلاوترین جۆری سوو بوو لەو سەردەمانەدا وکاتێك دروست دەبوو کە کەسێك داوای قەرزی لە کەسێك بکردایە بەسوو قەرزی دەدایە وئەمیش دوو جۆری هەبوو:

أ- هەر لەسەرەتاوە خاوەن قەرز لەگەڵ قەرزارەکە ڕێك دەکەوت کەلەکاتی گەڕانەوەی قەرزەکەدا، زیاد لەو بڕە پارەیەی بۆ بگێڕێتەوە کەئەم پێیداوە.

---

١ - عبد العظيم جلال أبو زيد، فقه الربا، ص١١-٢٠. توفيق إسماعيل الجيوسي، مخاطر الربا: الإجتماعية، والإقتصادية، ص١-٥.

ب- خاوەن قەرزەکە مەرجی ئەوەی لەسەر قەرزارەکە دادەنا کە ئەگەر لەکاتی خۆیدا قەرزەکە نەگێڕێتەوە سووی دەخاتە سەر.

هەندێك جاریش خاوەن قەرزەکان هەر دوو جۆری سوودەکەیان لەسەر قەرزارەکان دادەنا.

٢- سووی مامەڵە: ئەمیش جۆرێکی تر بوو لەسوو کاتێك دروست دەبوو کەکەسێك شتێکی دەفرۆشت بەکەسێکی تر مەرجی ئەوەی لەسەر دادەنا ئەگەر لەکاتی خۆیدا پارەکەی نەداتێ ئەوە سووی دەخاتە سەر.

٣- سوویەکی تر هەبوو کەخەڵکی بەسوویان نەدەزانی ئەویش لەکاتی ئاڵوگۆڕکردنی ئاڵتون بەزیوو، یان گەنم بەجۆ، گوێیان نەدەدا بەوەی کە کاڵاکان کێش و سەنگیان هەرچۆن بێت، یانیش هەردوو کاڵاکە لەکاتی گرێبەستەکەدا ئامادە بن، بەڵام دواتر ئیسلام ڕوونی کردەوە کەئەمانەیش جۆرێکن لەسوو.

## پێنجەم: قۆناغەکانی قەدەغەکردنی سوو لەئیسلامدا:

یەکێك لە هەرە دیاردە جوانەکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئەوەیە کە مامەڵەیەکی واقیعییانە لەگەڵ خەڵك و حوکمە شەرعییەکاندا دەکات، هەر لەم ڕوانگەیەیشەوە کاتێك خوای گەورە ویستبێتی نەریتێك بگۆڕێت کەچەندین ساڵە خەڵکی لەسەردەمی نەفامییدا دەقیان پێوە گرتوە، ئەوە سەرەتا زەمینەسازی بۆ کردوە ودواتریش بەچەندین قۆناغ حوکمەکەی گۆڕیوە، بۆ نموونە عارەق خوای پەروەردگار هەر لەسەرەتاوە بەرنامەڕێژی بۆ کردوە کە قەدەغەی بکات؛ بەڵام یەکسەر ئەو بڕیارەی نەداوە؛ بەڵکو بەچەندین ساڵ و قۆناغ قەدەغەی کردوە. سوویش یەکێك بووە لەو حاڵەتانەی کە ئیسلام زۆر واقعیانە مامەڵەی لەگەڵ کردوە وبەچەند قۆناغێك ولەچەند ساڵێکدا قەدەغەی کردوە.

گرنگترینی ئەو قۆناغانەی کەخوای پەروەردگار سووی پێ قەدەغە کردوە ئەمانە بوون:

١- لە قۆناغی یەکەمدا خوای گەورە تەنها ئاماژەیەکی زۆر وورد دەکات بەوەی کە سوو لای خوا کارێکی نەخوازراوە وپاداشتی لەسەر نادات، بەڵام پاداشت لەسەر خێر وبەخشین

وچاکە دەدات، ولەو بارەیەوە لەسورەتی (روم)دا کە سورەتێکی مەکییە، دەفەرموێت: ﴿وَمَا آتَيْتُم مِّن رِّباً لِّيَرْبُوَ فِي أَمْوَالِ النَّاسِ فَلَا يَرْبُو عِندَ اللَّهِ وَمَا آتَيْتُم مِّن زَكَاةٍ[1] تُرِيدُونَ وَجْهَ اللَّهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُضْعِفُونَ﴾[2]. واتە: ئەو پارەیەی بەخەڵکی دەدەن بەسوو تا زیاد بکات، ئەوە لای خوای گەورە هیچ زیاد ناکات وبەرەکەتی تێ ناکات، بەڵام ئەو پارەیەی کە لە پێناو ڕەزامەندی خوای گەورەدا دەیبەخشن، خوای گەورە بەرەکەتی تێدەکات ولای خۆی چەند قات زیادی دەکات.

جا ئەگەر بەوردی سەرنج بدەن لێرەدا خوای گەورە هیچ ئاماژەیەك بەوە ناكات كە سوو كارێكی خراپە یان حەرامە وسزای هەیە، بەڵكو تەنها بەراوردێك لەنێوان سوو بەخشین دا دەكات.

٢- لەم قۆناغەیشدا دیسانەوە خوای گەورە سوو قەدەغە ناكات؛ بەڵام روونتر قسەی لەسەر دەكات و وەك یەكێك لە ئاكارە بەدەكانی نەتەوەكانی تر پۆلێنی دەكات ولەو بارەیەوە لەسورەتی (نساء) دا كەسورەتێكی مەدەنییە دەفەرموێت: ﴿وَأَخْذِهِمُ الرِّبَا وَقَدْ نُهُواْ عَنْهُ وَأَكْلِهِمْ أَمْوَالَ النَّاسِ بِالْبَاطِلِ﴾[3]. واتە: یەكێك لە ئاكاری بەدی جولەكەكان ئەوە بوو كە سوویان دەخوارد لەكاتێدا خوای گەورە قەدەغەی كردبوو لەسەریان، وماڵی خەڵكیشیان بەناحەق دەخوارد. لێرەدا ئایەتەكە دوو ئاماژە بەحەرامی سوو دەدات:

أ- بەوەی سوو لەسەر نەتەوەكانی پێش ئەمان قەدەغە كراوە، كەواتە ڕێی تێ دەچێت لەسەر ئەمانیش قەدەغە بكرێت.

ب- بەوەی خوای گەورە سوو لەگەڵ خواردنی ماڵی خەڵك بەناحەق باس دەكات، كە ئەوە ئەو كات حەرامبوو لەسەر موسوڵمانان.

بەڵام هێشتا خوای گەورە سوو بەحەرام ناوزەند ناكات وڕاشكاوانە ڕێگری لێ ناكات.

---

١ - وشەی زەكات لێرەدا مەبەست پێی بەخشینێكی ڕەهایە، نەك ئەو زەكاتەی كە ئێستا هەیە ویەكێكە لەپایەكانی ئیسلام؛ چونكە ئەو زەكاتەی ئێستا هەیە لەساڵی دووی كۆچیدا فەرز بووە، وسورەتی ڕۆم مەككیە وزۆر پێش ئەو هاتۆتە خوارەوە.

٢ - سورة الروم: الآية (٣٩).

٣ - سورة النساء: الآية (١٦١).

٣- قۆناغی قەدەغە کردن: لەم قۆناغەدا خوای گەورە بەڕوونی باس لەحەرامی سوو دەکات و لەسورەتی (آل عمران) دا لە بارەیەوە دەفەرمویێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَأْكُلُواْ الرِّبَا أَضْعَافاً مُّضَاعَفَةً وَاتَّقُواْ اللهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾[1]. واتە: ئەی گرۆهی باوەڕداران سوویەك مەخۆن کەچەند قاتی پارەکە خۆی زیادی کردوە ولەخوا بترسن بەڵکو خوای گەورە سەرکەوت وسەرفرازتان دەکات.

زانایان دەربارەی حوکمی ئەم ئایەتە دوو بۆچوونیان هەیە:

بۆچوونێکیان ئەوەیە کەئەم ئایەتە قۆناغێکی ترە لەقۆناغەکانی قەدەغە کردنی سوو، وئایەتەکە تەنها باس لەحەرامی ئەو سووە دەکات کەرێژەکەی زۆر بێت وچەندەها جار بێت؛ بەڵام ئەگەر یەك بەرامبەر یان دووبەرامبەر بێت کێشەی نییە.

بۆچوونی دووەمیش پێی وایە کە نەخێر ئەمە بۆ قەدەغەکردنی هەموو جۆرەکانی سووە؛ بەڵام کاتێك باسی ڕێژەکەی دەکات کەچەند قات بێت، ئەوە باسی واقیعی ئەو کاتەی سووە لەکۆمەڵگەی عەرەبییدا؛ بۆیە لێکدانەوەی پێچەوانەی بۆ ناکرێت.

بەڵام سەرەڕای قەدەغەکردن ئایەتەکە هیچ هەڕەشەیەکی تێدا نییە، وباسی هیچ سزایەکیش ناکات.

٤- لەم قۆناغەدا ولە سورەتی (بقرة) دا خوای گەورە زۆر بەتوندی باس لەقەدەغەکردنی سوو دەکات وهەڕەشەی توند لەو کەسانە دەکات کە بەسوو مامەڵە دەکەن ولەو بارەیەوە دەفەرمویێت: ﴿الَّذِينَ يَأْكُلُونَ الرِّبَا لاَ يَقُومُونَ إِلاَّ كَمَا يَقُومُ الَّذِي يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطَانُ مِنَ الْمَسِّ ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُواْ إِنَّمَا الْبَيْعُ مِثْلُ الرِّبَا وَأَحَلَّ اللهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا فَمَن جَاءهُ مَوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّهِ فَانتَهَى فَلَهُ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُ إِلَى اللهِ وَمَنْ عَادَ فَأُوْلَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ۞ يَمْحَقُ اللهُ الْرِّبَا وَيُرْبِي الصَّدَقَاتِ وَاللهُ لاَ يُحِبُّ كُلَّ كَفَّارٍ أَثِيمٍ﴾[2]. واتە: ئەو کەسانەی لەدونیا سوو دەخۆن، کاتێك لەقیامەت لەگۆڕەکانیان دێنە دەرەوە، وەکو کەسێکی شێتی سەرلێشێواو لەگۆڕەکانیان دێنە دەرەوە، ئەوەیش لەسزای ئەوەدا کە دەیانگوت قازانجی مامەڵە و سوو جیاوازیان نییە؛ بەڵام ئەوانە ڕاست ناکەن چونکە خوای گەورە قازانجی مامەڵەی حەڵاڵ کردوە وداهاتی سووی

١ - سورة آل عمران: الآية (١٣٠).

٢ - سورة البقرة: الآيتان (٢٧٥-٢٧٦).

حەرام و یاساغ کردوە، جا هەر کەس گوێی لەم ئامۆژگاری وفەرموودانەی پەروەردگاری بوو بەگوێی کرد ودەستی لەسوو هەڵگرت، ئەوە پێشتر هەر سوویەکی وەرگرتوە وخواردوە هی خۆیەتی ولێی ناسەندرێتەوە، چارەنووسی خاوەنەکەیشی لەدەستی خوای گەورەدایە، هەرکەسیش پاش ئەم فەرمانە بگەڕێتەوە سەر کاری سووخۆری ئەوە خوای گەورە دەیخاتە دۆزەخەوە وبەهەمیشەیی تێیدا دەمێنێتەوە، خوای گەورە فەڕ وبەرەکەت لەسوو هەڵدەگرێت، ولەبەرامبەردا پارەی چاکە و بەخشین گەشە پێدەکات وزیادی دەکات. وخوای گەورە خەڵکانی بێباوەڕ و تاوانکاری خۆشناوێت.

لەکۆتاییدا دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ الرِّبَا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ۞ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ فَأْذَنُواْ بِحَرْبٍ مِّنَ اللّهِ وَرَسُولِهِ وَإِن تُبْتُمْ فَلَكُمْ رُؤُوسُ أَمْوَالِكُمْ لاَ تَظْلِمُونَ وَلاَ تُظْلَمُونَ ۞ وَإِنْ كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَى مَيْسَرَةٍ وَأَنْ تَصَدَّقُوا خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ﴾[١]. واتە: ئەی گرۆهی باوەڕداران لەخوا بترسن ودەست لەسووخۆری کۆتا کەن وئەو سوودەی لای خەڵك هەتانە وەری مەگرن ئەگەر باوەڕدارن وخۆتان بەموسوڵمان دەزانن، خۆ ئەگەر واتان نەکرد ئەوە بزانن کە خوای گەورە و وپێغەمبەرەکەی ﷺ جەنگتان لەدژ بەرپا دەکەن، ئەگەریش پەشیمان بونەوە وتەوبەتان کرد، ئەوە دەسمایەکانی خۆتان بۆ خۆتان نەستەمتان لێ دەرکێت ونەستەمیش لەخەڵك بکەن. وئەگەریش قەرزارەکانتان دەستیان کورتبوو نەبوو بوون، ئەوە مۆڵەتی قەرزەکەیان بۆ درێژ بکەنەوە، خۆ ئەگەریش لەکۆی قەرزەکە یان لەهەندێکی گەردنیان ئازاد بکەن ئەوە بۆ خۆتان باشترە ئەگەر بزانن وهەست پێبکەن.

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەربارەی ئەم ئایەتانە دەفەرموویێت: (ئەمە کۆتا ئایەت بوو بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ هاتە خوارەوە وپاش ئەوە هیچ ئایەتی تر نەهاتۆتە خوارەوە)[٢].

بەم ئایەتانە کۆتایی بەحوکمی سووخۆری هێنرا.

---

١ – سورة البقرة: الآيات (٢٧٨-٢٨٠).

٢ – القرطبي (محمد بن أحمد)، تفسير القرطبي (الجامع لأحكام القرآن)، ج٦، ط٢٠٠٣، عالم الكتب، الرياض، تحقيق: هشام سمير، ص٢٨.

### شەشەم: حوکمی سوو و سزاکەی لە ئیسلامدا:

أ- بۆ زانینی قەبارە وگەورەیی تاوانی سوو لە ئیسلامدا لە ڕوانگەی دەقەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ قسەی لەسەر دەکەین وسەرەتا لەدەقەکانی قورئانەوە دەست پێ دەکەین، کە ئەگەر بەووردی سەرنجی ئایەتەکانی پێشوو بدەین دەبینین خوای گەورە لەچەندین ڕووەوە ئاماژەی بەحەرامی سوو کردوە لەوانە:

١- ئەو بارە دەروونیە ناهەموارەی کەلەقیامەتدا بۆ ئەو کەسانە دروست دەبێت کە لەدونیادا مامەڵەیان بەسوو کردوە، کەوەك شێت و سەرلێشێواو زیندوو دەکرێنەوە، ئەمەیش بەڵگە ونیشانەی تاوانبارییانە لەدونیادا.

٢- خوای گەورە بەئاشکرا دەفەرموێت قازانجی مامەڵە حەڵاڵە و سوو حەرامە وبەتوندیش وەڵامی ئەو کەسانە دەداتەوە کە دەڵێن جیاوزاییان نییە، وهەڕەشەی سەختیان لێدەکات.

٣- خوای گەورە هەڕەشەی سزای دۆزەخی هەمیشەیی دەکات لەو کەسانەی کەبەردەوام دەبن لەسەر سووخۆری ودیارە ئەم سزایەیش تەنها بۆ تاوانە گەورەکانە.

٤- خوای گەورە بەڵێنی ئەوە دەدات کە فەڕ وبەرەکەت لەسوو هەڵبگرێت، کەئەمەیش جۆرێکی ترە لەسزا وهەڕەشە وئاگادارکردنەوە بۆ دووركەوتنەوە لەسوو.

٥- خوای گەورە دوو وشەی تۆقێنەر بەرامبەر سووخۆرەکان بەکاردەهێنێت کە ئەوانیش: ﴿كَفَّارٍ﴾ و ﴿أَثِيمٍ﴾ کە دوو وشەن بۆ تاوانی زۆر گەورە وخراپ بەکاردێن.

٦- خوای گەورە داواکەی لەباوەڕداران دووبارە دەکاتەوە کەواز لەسوو بێنن ئەگەر باوەڕدارن، ئەمەیش هەڕەشەیەکی ترە بەوەی کەهەر کەس وازی لێنەهێنێت، ئەوە با لەباوەڕەکەی بترسێت وچاوێکی پێدا بخشێنێتەوە.

٧- سەرەڕای ئەمانە هەمووی خوای گەورە هەڕەشەی زۆر توندتر لەوانە هەمووی دەکات، وباس لەوەدەکات کەخوای گەورە و پێغەمبەرەکەی ﷺ جەنگ دژی ئەو کەسانە بەرپا دەکەن کەسەودا ومامەڵە بەسوو دەکەن، تا بزانن کە ئەوان سەنگەریان لەخوا گرتوە، ولەبەرەی شەیتاندان.

٨- لەکۆتاییدا خوای گەورە باسی تەوبە وگەڕانەوە دەکات لەسوو خواردن، دیارە تەوبەیش لەتاوان دەکرێت، بۆیە ئەمەیش ئاماژەیەکی ترە بەحەرامی سووخۆری لە ئیسلامدا.

جا ئەمانە هەمووی ئاماژەن بەمەترسی وحەرامی سووخۆری لە قورئاندا وگەورەیی ئەو تاوانە وهەر لەبەر خراپیەکەیشێتی کەخوای گەورە کۆتا ئایەتەکانی قورئانی بۆ تەرخان کردوە.

٩- پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: {اَلرِّبَا ثَلَاثَةٌ وَسَبْعُونَ بَابًا أَيْسَرُهَا مِثْلُ أَنْ يَنْكِحَ الرَّجُلُ أُمَّهُ}[١]. واتە: تاوانی سوو حەفتا وسێ پلەیە، نزمترینیان وەك ئەوە وایە کەمرۆڤ کاری داوێنپیسی (زینا) لەگەڵ دایکی خۆیدا بکات.

١٠- وە دەفەرموێت: {دِرْهَمُ رِبًا يَأْكُلُهُ الرَّجُلُ، وَهُوَ يَعْلَمُ، أَشَدُّ مِنْ سِتَّةٍ وَثَلاَثِينَ زَنْيَةً}[٢]. یەك درهەمی سوو لای خوای گەورە سی وشەش جار لەکاری داوێنپیسی وزینا قورسترە.

١١- وە دەفەرموێت: {إِذَا ظَهَرَ الزِّنَا وَالرِّبَا فِي قَرْيَةٍ ، فَقَدْ أَحَلُّوا بِأَنْفُسِهِمْ عذاب اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ}[٣]. واتا: هەرکات کاری داوێنپیسی وسووخۆری لەگوندێك یان شارێك یان شوێنێکدا بڵاوبویەوە، ئەوە ڕقی خوایان لەخۆیان هێناوەتە جۆش و سزای خوایان بەسەر خۆیان هێناوە.

١٢- لە فەرموودەیەکی تردا هاتوە: {لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ آكِلَ الرِّبَا، وَمُوكِلَهُ، وَكَاتِبَهُ، وَشَاهِدَيْهِ، وَقَالَ هُمْ سَوَاءٌ}[٤]. واتە: پێغەمبەری خودا ﷺ نەفرەتی کردوە لەو کەسەی کە سوو دەخوات و ئەو کەسەیش کە سوو دەدات، وئەو کەسەیش کەدەبێتە شاهید لەنێوانیاندا، وئەو

---

١ - الألباني (محمد ناصر الدين الألباني)، صحيح الترغيب والترهيب، ج٢، رقم الحديث (١٨٥١)، مصدر سابق، وقال في تخريجه: رواه الحاكم وقال: صحيح على شرط البخاري ومسلم، ورواه البيهقي من طريق الحاكم ثم قال: هذا إسناد صحيح لغيره، ص١٧٧.

٢ - الألباني، صحيح وضعيف الجامع الصغير وزيادته، المكتب الإسلامي، بيروت، رقم الحديث (وقال في تخريجه: رواه أحمد والطبراني: صحيح، ص٥٦٩.

٣ - الألباني، صحيح الترغيب والترهيب، ج٢، ص١٧٩، وقال في تخريجه: رواه الحاكم وهو حسن لغيره.

٤ - البخاري (محمد بن إسماعيل)، صحيح البخاري (الجامع المسند الصحيح المختصر من أمور رسول الله ﷺ وسننه، وأيامه)، ج٧،ط١، دار طوق النجاة، رقم الحديث (٥٩٦٢)، ص١٦٩، تحقيق: محمد زهير بن ناصر الناصر. مسلم (مسلم بن الحجاج القشيري)، صحيح مسلم، ج٣، دار إحيار التراث العربي، بيروت، ص١٢١٩، رقم الحديث (١٥٩٧)، تحقيق وتعليق: محمد فؤاد عبد الباقي. واللفظ لمسلم.

کەسەیش کەگرێبەستەکەیان بۆ دەنووسێت، وفەرمووی: هەموویان وەك یەك تاوانبارن. کەواتە ئەو دەڵەمەندەی کەتەنها بۆ زیاد بوونی داهاتی خۆی پارە بەسوو دەدات، لەگەڵ ئەو هەژارەی کە بەناوی ناچارییەوە وەری دەگرێت، لای خوی گەورە لەڕێژەی تاوانبارییاندا هیچ جیاوازییەکیان نییە و وەك یەك تاوانبارن، نەك ئەوان بەڵکو شاهید، ونووسینگە، وکەفیل، وکارمەندی کۆمپانیا یان بانکیش[١]، هەموو ئەمانە پەنا بەخوا وەك یەك تاوانبار دەبن. ئەمەیش لەبەر قورسی تاوانی سووخۆریەکەیە[٢].

هەر بۆیە و لە ژێر ڕۆشنایی ئەو دەقانەدا زانایانی ئیسلامیش زۆر بە گەورە لە تاوانی سوویان ڕوانیوە و زۆر لێی ترساون، دەگێڕنەوە جارێکیان پیاوێك سەرخۆشێك دەبینێت خۆی هەڵدەدا بۆ ئاسمان ودەڵێت من مانگ دەگرم ودەیهێنمە خوارەوە، پیاوەکەیش هەڵوێستی سەرخۆشەکەی زۆر پێ نامۆ دەبێت، بۆیە تەلاق دەخوات ودەڵێت: (تەلاقم کەوتبێت خوای گەورە لە عارق خراپتری دانەناوە بەقورگی خەڵکدا بچێتە خوارەوە). دواتر پەشیمان دەبێتەوە ودێت بۆلای ئیمامی مالیك بۆ حوکمی تەلاقەکەی، ئیمامی مالیك پێی دەفەرموێت مۆڵەتێکم پێبدە با بیری لێ بکەمەوە. سبەی هاتەوە فەرمووی: تەلاقەکەت

---

١ - بۆیە ئەو کەسانەی کە کارمەندی بانك یان کۆمپانیایەکن و پارە بەسوو دەدەن یان وەردەگرن، نابێت لەو شوێنانادا کاربکەن، ئەگەریش هەر ناچار بوون، ئەوە نابێت لەو بەشە یان کەرتە کار بکەن کەپەیوەندی ڕاستەوخۆی بەکاری سووخۆریەکەوە هەیە؛ بەڵکو بابچنە بەشەکانی تر، ئەگەر نا ئەو هەڕەشەیە ئەوانیش دەگرێتەوە.

٢ - هەندێك تاوان هەیە لەبەر قورسییەکەی بەو شێوەیە هەموو ئەو کەسانە دەگرێتە کەبەشێوەیەك لەشێوەکان بەشداری دەکەن لەجێبەجێکردنی تاوانەکەدا، وەکو عارەق بۆ نموونە، پێغەمبەری خودا ﷺ دەربارەی عارەقیش دەفەرمووێت: خوای گەورە نەفرەتی کردوە لەو کەسەی کە عارەق دروستدەکات، لەوەیش کەبۆی دروستدەکرێت، لەوەیش کەدەیخواتەوە، لەوەیش کە کارمەندە لەبارێکدا وعارەق دەگێڕێت، لەوەیش کە حەماڵە و سەیارەیەکی بارهەڵگر، یان تەکسی، یان عەرەبانەیەکی پێیە ودەیگوازێتەوە، لەوەیش کەبۆی دەگوازرێتەوە، لەوەیش کە دەیفرۆشێت، لەوەیش کە دەیکرێت، لەوەیش کە دەیبەخشێت وبەدیاری دەیدات بەخەڵکی، لەوەیش کەپارەی عارەق دەخوات، لەوەیش کە لەسەر مێز وخوانێك دادەنیشێت کەعارەقی لەسەر دانراوە.

جا مەرج نییە ئەمانە هەموویان عارەق خۆر بن بەڵام هەموویان یەك حوکمیان هەیە و وەك یەك بەر نەفرەتی خودا دەکەون، بەهۆی ئەوەی کەبەجۆرێك لەجۆرەکان پشکداربوون لە ئەنجامدانی تاوانەکەدا. بۆیە تاوانی سوخۆریش لەو بابەتەیە.

دیارە ئەو فەرموودانەی لەم بارەیەوە هاتوون زۆرن وبەچەند ڕێگەیەکی جیاواز هاتوون بەڵام ئەمە پوختەکەیانە. بڕوانە: إبن ماجة (محمد بن يزيد القزويني)، سنن إبن ماجة، ج٢، دار الفكر، بيروت، رقم الحديث (٣٣٨١)، تحقيق، وتعليق محمد فؤاد عبد الباقي، والأحاديث مذيلة بأحكام الألباني عليها، وقال في تخريجه: صحيح، ص١١٢٢. الترمذي، ج٣، رقم الحديث (١٢٩٥)، مصدر سابق، وقال الألباني في تخريجه: حسن صحيح، ص٥٨٩.

کەوتووە، چونکە من سەیری هەموو قورئانم کردوە، خوای گەورە جەنگی دژی هیچ تاوان و تاوانبارێك ڕانەگەیاندوە جگە لە بابەتی سوودا نەبێت؛ بۆیە سوو لە عارەق خراپترە وتەلاقەکەت کەوتووە[١].

ئەمڕۆ خەڵکانێکی زۆر عارەق ناخۆنەوە وپێیان وایە زۆر گوناهە؛ بەڵام سوو دەخۆن وگوێیشی پێ نادەن، لەکاتێکدا کۆی دەقەکان ئاماژە بەوە دەکەن، کە سوو لە عارەق ودزی وزینایش خراپترە.

ئیبن تەیمییە دەفەرموێت: سوو لە قومار زۆر خراپترە لەبەر ئەوەی:

- کەسی سووخۆر هەمیشە قازانج دەکات، بەڵام قومارکەر مەرج نییە قازانج بکات.

- لەقوماردا جاری واهەیە هەژارەکان دەیبەنەوە لە دەوڵەمەندەکان؛ بەڵام لەسوودا هەمیشە هەژارەکان دەیدۆڕێنن ودەوڵەمەندەکان دەیبەنەوە؛ هەر بۆیە سوو لە قومار خراپترە[٢].

## حەوتەم: هۆکارەکانی قەدەغەکردنی سوو لەئیسلامدا:

---

١ - أبو حيان الأندلسي، تفسير البحر المحيط، ج٢، دار الفكر، بيروت، ص٢٥٤.

٢ - إبن تيمية (أحمد بن عبد الحليم)، الفتاوى الكبرى،ج٤، ط١، ١٣٨٦، دار المعرفة، بيروت، ص٤٦٥، دراسة وتحقيق: حسنين محمد مخلوف.

هەمووان ئەو ڕاستییە دەزانین کە کاتێك خوای گەورە بڕیار دەربارەی هەر شتێك دەدات، ئامانجی سەرەکی بڕیارەکە هەمیشە پاراستنی بەرژەوەندی مرۆڤەکانە لە دونیا ودوارۆژیاندا، لەبابەتی سووخۆریشدا هەر وایە وزۆر هۆکار لەپشت قەدەغەکردنی سووخۆریەوە هەن، وهۆکارەکانیش ڕەهەندی جیاوازیان هەیە وئێمە لێرەدا تەنها چەند هۆکارێك لەوانە دەخەینە ڕوو وسەرەتا لە هۆکارە کۆمەڵایەتییەکانەوە دەستپێدەکەین کە ئەمانەن:

أ- هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان:

١- لەڕووی دەروونیەوە کاتێك کەسێکی موسوڵمان تاوانێکی وەکو سوو ئەنجام دەدات، لەگەڵ ئەو هەموو هەڕەشەیەی لەسەری هاتووە، ئەمە ڕێخۆشکەر دەبێت بۆ ئەوەی هەرتاوانێکی تر ئەنجام بدات، چونکە پێگە و ترسی تاوان لەناخیدا کەم وکاڵ دەبێتەوە.

٢- سوو جیاوازی چینایەتی لەنێو تاکەکانی کۆمەڵگادا زیاد دەکات وقوڵدەکاتەوە؛ چونکە هەژارەکان دەکات بەژێر باری قەرزێکی درێژ خایەنی نەبڕاوەوە کە زەحمەت دەتوانن لێی دەربازبن و لەولایشەوە درێژە وبرەو بەسەروەتی دەوڵەمەندەکان دەدات لەسەر چارەنووسی ئەوان.

بۆنموونە: لەساڵی (١٩٤٥) ولەدوای جەنگی جیهانی دووەم، وبەپێی ڕێکەوتننامەیەکی نێو دەوڵەتی سندوقی دراوی نێو دەوڵەتی (International Monetary Fund) لەلایەن (٢٩) وولاتی جیهانەوە دامەزرا، ئامانج لەدروستکردنی سندوقەکە بەناو بۆ هاوکاری کردنو و دەستگیرۆیی کردنی ولاتە هەژارەکان بوو، هەرچەندە لەڕاستیدا بەپێچەوانەوە بۆ تێشکاندن ودرێژەدان بوو بەباری هەژاری ودەستەوخواریان بۆ ولاتە زلهێزەکان.

چونکە ئەم سندوقە هەرگیز بەبێ مەرج قەرز بەکەس نادات، وهیچ قەرزێکیشی بێ بەرامبەر نییە، لەم قەیرانەی ئەم دواییەی میسردا، میسر داوای (٥) ملیار دۆلاری لەسندوقەکە کردوە، وئەوانیش ڕازیبوون بۆ ماوەی (٥) ساڵ قەرزەکەی بدەنێ، خۆ ئەگەر ڕێژەی سووی ئەو قەرزە (٪١.١) یش بێت، ئەوە ساڵی زیاتر لە (٣٠) ملیۆن دۆلار سووی دەچێتە سەر، وپاش پێنج ساڵەکە قەرزەکە (١٥٢) ملیۆن دۆلار سووی دەچێتەسەر.

ئایا ئەمە چ جۆرە هاوکارییەکی پێ دەڵێن، ئێستا ئەم سندوقە هەندێك قەرزی هەیە لەلای هەندێك وڵات سودەکەی زۆر زیاترە لەبری ئەو قەرزەی کەکاتی خۆی پێی داون.

هەر کاتێکیش بابەتێکی پەیوەست بەو سندوقە دەخرێتە دەنگدانەوە، کێ پارەی لەسندوقەکەدا زیاترە ئەوە ڕێژەی دەنگیشی زیاترە، بۆ نموونە: ئەمەریکا بەتەنها (٪١٧.٨) دەنگی هەیە، پاش ئەو یابان دێت کە ( ٪٦.١٣) ی ڕێژەی دەنگی هەیە، پاش ئەوان ئەڵمانیا دێت کە (٪٥.٩٩) ی ڕێژەی دەنگی هەیە، پاش ئەوان فەرەنسا دێت کە (٪٤.٩٥) ی ڕێژەی دەنگی هەیە، لەو لایشەوە بە هەر (٢٤) وڵاتە هەژارەکەی ئەفەریقیا کە سەدەها ملیۆن هاوڵاتیان هەیە بەهەموویان تەنها (٪١.٤١)ی ڕێژەی دەنگیان هەیە[١].

هەر بۆیە هەمیشە هەژموون وسیاسەتی ئەو زلهێزانە بەسەر وڵاتە هەژارەکاندا زاڵە وهەرگیز بواری هەستانەوە وسەربەخۆیی ئابووریيان پێنادەن، تا لەو ڕێیەوە لەپێناو بەرژەوەندی خۆیان بەکاریان بهێنن.

٤-سوو سۆزو بەزەیی وهەستی مرۆڤ دۆستی لەناو تاکەکانی کۆمەڵگەدا بنبڕ دەکات و وا لەدەوڵەمەندەکان دەکات، کە هەژارەکان بکەنە سوتەمەنی بۆ گەرمکردنی بازاڕی قازانجی خۆیان ولەولایشەوە هەژارەکان دەکاتە دوژمنی دەوڵەمەندەکان وهەمیشە بەچاوی ڕق وکینە سەیریان دەکەن و هەژاری خۆیان لەچاوی ئەوان دەناسن.

ب- هۆکارە ئابوورییەکان:

جگە لەو هۆکارە کۆمەڵایەتییانە چەندین هۆکاری ئابووری تر هەن بۆ قەدەغەکردنی سوو لەوانە:

١- نرخی شت ومەك وکاڵاکان بەرز دەکاتەوە؛ چونکە ئەو پارەیەی کە وڵاتە زلهێزەکان بەسوویەکی زۆر دەیدەن بەوڵاتە هەژارەکان، ئەو وڵاتانە ناچار دەکات نرخی شت ومەك، وکاڵاکان، وخزمەتگوزارییەکان لەسەر هاووڵاتییەکانیان زیاد بکەن تابتوانن قەرزەکە وقازانجی سووەکە لەکاتی خۆیدا بدەنەوە.

---

١ - د. محمد توفيق سماق، مقال بعنوان: رؤية صندوق النقد والبنك الدوليان بين التغريب والتدويل، موقع البيان الإقتصادي، تأريخ نشر المقال: ٣٠ أبريل ١٩٩٩.

٢- دیاردەی بێکاری زیاد دەکات؛ چونکە خاوەن دەسمایەکان لەبری ئەوەی پارەکانیان بخەنە بازاڕەوە ولەپرۆژە پیشەسازی وئاوەدانکاری وخزمەتگوزارییەکاندا بیخەنە گەڕ، دەیدەن بەسوو بەکۆمپانیا یان بانکەکان وبەمەیش دیاردەی بێکاری لەبازاڕدا زیاد دەکات.

٣- ئاستی وەبەرهێنان کەم دەکاتەوە؛ لەبەر ئەوەی نرخی شتومەك بەرزدەبێتەوە ولەبەرامبەریشدا خەڵك هەلی کاری دەست ناکەوێت وپارەی پێ نابێت تا بیکڕێت، ئەو کات کاڵاکان لەگەنجینەکاندا کەڵەکە دەبن وبەمەیش وەبەرهێنان کەم دەبێتەوە.

٤- سوو وادەکات پارە لەدەستی کۆمەڵێك بازرگان وسەرمایەداری گەورەدا کەڵەکە بێت وئەوان دەستبگرن بەسەر بازاڕەکاندا وبڕیاری چارەنووسی خەڵك وبژێوی ژیانیان بکەوێتە دەستی ئەوانەوە.

٥-سەردەکێشێت بۆ ئەوەی وڵاتانی هەژار سەروەری وسەربەخۆی خۆیان لە بڕیاری سیاسی وئابووری ورۆشنبیری وهتد لەدەست بدەن وبکەونە ژێر بەزەیی وکاریگەریی سیاسەتی وڵاتە خاوەن دەسمایە وقەرزدەرەکانەوە وئەو وڵاتانە ڕاستەوخۆ یان نا ڕاستەوخۆ ولەڕوانگەی بەرژەوەندییەکانی خۆیانەوە نەخشەی بەڕێوەبردنی وڵاتەکەیان بۆ دابڕێژنەوە.

٦- سوو زۆر کات قەیرانی ئابووری کەمەرشکێنی لەسەر ئاستی جیهان دروست کردوە، بۆ نموونە لەساڵی (١٩٢٩)دا (٥) هەزار بانك لە ئەمەریکا مایەپووچی خۆیان ڕاگەیاندوە، و زیاتر لە (٣) بلیۆن دۆلار زەرەریان لێکەوتووە، تا (ڕۆزفڵت) ناچاربوو تا ماوەیەك هەموو بانکەکانی ئەمریکا دابخات.

هەروەها لەساڵی (١٩٩٧) دا وڵاتە پێشکەوتوەکانی ئاسیا ڕووبەڕووی قەیرانێکی ئابووری سەخت بوونەوە ولەساڵی (٢٠٠٧) قەیرانێکی ئابووری سەختتر جیهانی هەژاند وبەهۆیەوە ئابووری جیهان زیاتر لە (٧١) تریلیۆن دۆلار زیانی بەرکەوت. ئەمە جگە لەوەی کە ملیۆنەها هاووڵاتی لەسەر ئاستی جیهان هەلی کارەکانیان لەدەستدا وئەوانیش چوونە ڕیزی هەژارانەوە وبوون بە بار بەسەر ئابووری وڵاتەکانیانەوە. ئابووریناسەکانیش هۆکاری سەرەکی ئەم قەیرانانە بۆ دیاردەی سوو وقازانجی وەهمی پرۆژە بێ بنەماکان دەگێڕنەوە[1].

ئەمانە وچەندین هۆکاری تر لەپشت قەدەغەکردنی کاری سووخۆریەوەن لەڕوانگەی ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە.

---

١ - الأزمة المالية العالمية: أسبابها؛ أبعادها ؛ تداعياتها: موقع: http://abamayssae٢٠١٤.ywaaw.com/٢٠١٣/٠٤/٢٥/١٤٨

## بەشی سێ[1]

## ئاڵۆزی بابەتی سوو و جۆرەکانی

لەم بەشەدا قسە لەسەر ئەم تەوەرانە دەکەین:

**یەکەم:** ئاڵۆزیی بابەتی سوو و وردەکارییەکانی.

**دووەم:** جۆرەکانی سوو و شێوازەکانی.

**سێیەم:** پێناسەی قەرز.

**چوارەم:** سروشتی قەرز بەپێی بنەما شەرعییەکان.

**پێنجەم:** حوکمی قەرزدان.

**شەشەم:** مەرجەکانی قەرزی شەرعی.

**حەوتەم:** پێناسەی سووی قەرز.

### یەکەم: ئاڵۆزیی بابەتی سوو و وردەکارییەکانی:

بابەتی سوو یەکێکە لەو بابەتانەی کەچەند گرنگن لەئیسلامدا، ئەوەندەیش ئاڵۆزن و وردەکاریان هەیە و زۆر کەس سەری لێدەرناکات و تێیدا دەکەوێتە هەڵەوە، هەر بۆیە پێویستە موسوڵمانان زۆ لێی بەئاگا بن.

پێشەوا عومەر لەو بارەیەوە دەڵێت: (ثَلَاثٌ وَدِدْتُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمْ يُفَارِقْنَا حَتَّى يَعْهَدَ إِلَيْنَا عَهْدًا: الْجَدُّ، وَالْكَلَالَةُ، وَأَبْوَابٌ مِنْ أَبْوَابِ الرِّبَا)[2]. واتە: سێ شت هەیە بەئاواتەوە بووم کە پێغەمبەری خودا ﷺ جێی نەهێشتینایە تا تەواو بۆمان ڕوون دەبووەوە: بەشە میراتی باپیرە[3] ومیراتی کەلالە[4] لەگەڵ چەند بابەتێکی سوو.

---

١ - ئەم بەشە ڕۆژی (٢٠١٤/١٢/١٣) تۆمار کرا.

٢ - البخاري، صحيح البخاري، ج٧، رقم الحديث (٥٥٨٨)، ص١٠٦.

٣ - مەبەستی میراتی باپیرەیە لەگەڵ خوشك وبرادا لەکاتی نەمانی باوکدا.

٤ - کەلالە: بە کەسێك دەگوترێت بمرێت، نەباوك ودایك ونەمنداڵی نەبێت.

هەر لەسەر ئەو بابەتە دەڵێت: (إِنَّ آخِرَ مَا نَزَلَتْ آيَةُ الرِّبَا، وَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قُبِضَ وَلَمْ يُفَسِّرْهَا لَنَا فَدَعُوا الرِّبَا وَالرِّيبَةَ)[١]. واتە: کۆتا ئایەت کە بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ هاتە خوارەوە ئایەتی سوو بوو، وە پێغەمبەری خودا ﷺ بەر لەوەی بەتەواوی بۆمان ڕوون بکاتەوە کۆچی دوایی کرد، بۆیە واز لەسوو لەهەر شتێکیش کە گومانتان لێی هەبوو بهێنن.

بەم فەرموودانەی پێشەوا عومەردا دەردەکەوێت، کەزۆرێك لەبابەتەکانی سوویان بۆ ڕوون بۆتەوە، بەڵام ئاڵۆزیان لەهەندێك بابەتدا بۆ دروستبووە، وئاڵۆزیەکەیش بۆ دوو هۆکاری سەرەکی دەگەڕێتەوە:

یەکەمیان: ئایەتەکانی سوو وەکو خۆی ئاماژەی پێدەکات، کۆتا ئایەتەکانی قورئان بوو لە هاتنەخوارەوەدا، وپێغەمبەری خودا ﷺ پاش هاتنە خوارەوەیان بەماوەیەکی کەم کۆچی دوایی کردوە، وهاوەڵەکانی بەجێ هێشتوە وئەوەندە نەماوەتەوە تا هەموو وردەکاریەکانیان بۆ ڕوون بکاتەوە.

دووەمیان: بابەتی سوو پەیوەندی هەیە بەشێوازی مامەڵەی خەڵکەوە، کە ئەویش بەردەوام لە گەشەکردن و گۆڕاندایە و حاڵەتێکی جێگیری نییە؛ بۆیە پێدەچێت لەپاش وەفاتی پێغەمبەر ﷺ چەند شێوازێك لەمامەڵە کردن هاتبێتە ئاراوە کە لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ بوونیان نەبووە، وهاوەڵانیش تەواو بەرچاو ڕوون نەبوون لەسەری وئەمەیش وای کردوە بۆچوونی جیاوازیان هەبێت لەبارەیەوە.

ئیبن کەثیریش دەربارەی گرنگی بابەتی سوو وئاڵۆزیەکانی دەڵێت: (باب الربا من أشكل الأبواب على كثير من أهل العلم)[٢]. واتە: بابەتی سوو لەهەرە ئاڵۆزترینی بابەتە فیقهییەکانە بەلای زۆربەی زانایانەوە.

پێشەوا شاطبیش لەو بارەیەوە دەڵێت: (وهو من أخفى الأمور التي لم يتضح معناها إلى اليوم)[٣]. واتە: سوو لەشاراوەترینی ئەو بابەتانەیە کە تا ئەمڕۆیش واتاو چەمکەکانی زۆر ڕوون نییە.

---

١ - إبن ماجة، سنن إبن ماجة، ج٢، رقم الحديث: (٢٢٧٦). وقال الألباني في تخريجه: صحيح، ص٧٦٤.

٢ - إبن كثير، تفسير إبن كثير (تفسير القرآن العظيم)، ج١،ط٢، دار طيبة للنشر،١٤٢٠، ١٩٩٩، ص٧١٠.

٣ - الشاطبي (إبراهيم بن موسى بن محمد اللخمي)، الموافقات في أصول الشريعة، ج٤، ط١، دارإبن عفان،١٩٩٩،١٤١٧، تحقيق: أبو عبيدة مشهور بن حسن آل سلمان، ص٣٨٢.

شێخ محمد رشید ڕەزایش لەبارەیەوە دەڵێت: (وليس في الشريعة الإسلامية مسألة مدنية وقع فيها الخلاف والاضطراب منذ العصر الأول، ثم مازالت تزداد إشكالا وتعقيدا بكثرة بحث العلماء إلا مسألة الربا، فهي تشبه مسألة القدر في العقائد)[1]. واتە: لەشەریعەتی ئیسلامییدا بابەتێکی مەدەنی تری وانییە کە هەر لەسەدەی یەکەمەوە هێندە جیاوازی وئاڵۆزی تێدا بێت، وبەردەوامیش چەند زانایان لێکۆڵینەوە وتوێژینەوەی زیاتری لەسەر دەکەن ئەو قورستر وئاڵۆزتر دەبێت جگە لە بابەتی سوو نەبێت، بۆیە ئاڵۆزی سوو لە فیقهدا وەك ئاڵۆزی قەزاوقەدەر وایە لە بیروباوەڕدا.

جا بەڕێزان: ئەمە بۆچوونی پێشەوا وزانایان وکەڵەپیاوانی ئەم ئوممەتەیە لەسەر بابەتی سوو، بۆیە پێویستە زانایان بەتایبەتی وموسوڵمانان بەگشتی زۆر بە ئاگاییەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکەن، تا تووشی حەرام وسنوورشکێنی فەرمانەکانی خوای گەورە نەبن.

## دووەم: جۆرەکانی سوو و شێوازەکانی:

سوو بەشێوازێکی گشتی دوو جۆری هەیە:

جۆری یەکەم: سووی قەرز (ربا القرض).

جۆری دووەم: سووی کڕین وفرۆشتن (ربا البيع).

سەرەتا قسە لەسەر جۆری یەکەم دەکەین، کە هەرچەندە ئەم جۆرە سووە زۆر کۆنە؛ بەڵام بەردەوام شێوازی بەکارهێنانی گۆڕانکاریی تێدا دروست دەبێت وهەر سەردەمە ولەهەر کۆمەڵگەیەکدا بەشێوازێك لەشێوازەکان سەرهەڵدەدات وخەڵکانێکی زۆر گیرۆدەی دەبن.

بۆیە لێرەدا هەوڵ دەدەین بەپێی توانا ولەچەند خاڵێکدا تیشك بخەینە سەر سەرجەم چەمکەکانی و سەرەتا لە پێناسەکەیەوە دەست پێدەکەین.

---

١ - مجلة المنار، محمد رشيد رضا، ج٣٠، ص٥٨٥.

**سێیەم: پێناسەی قەرز:**

قەرز (القرض): لەڕووی زمانەوانییەوە بەواتای بڕین ولێکردنەوە دێت، کەدەڵێین: (أقرضه من ماله). واتە: بەشێك لەماڵەکەی خۆی بڕی ودای بەکەسێکی تر.

لەڕووی زاراوەیشەوە حەنەفییەکان لەپێناسەی قەرزدا دەڵێن: (مَا تُعْطِيهِ مِنْ مِثْلِيّ لِتَتَقَاضَاهُ)[1]. واتە: بریتییە لەپێدانی شتێك کە هاوشێوەی هەیە، وپاشتر وەك خۆی وەری دەگریتەوە. بۆنمونە: تۆ (١٠٠٠$) بەکەسێك دەدەیت بەقەرز، دواتر هەمان بڕە پارەی بەهەمان دراو لێوەردەگریتەوە بەبێ زیاد وکەم. بەپێی ئەم پێناسەیەیش بێت لای حەنەفییەکان قەرزی شتێك دروست نییە کە هاوشێوەی نەبێت، وەکو ئاژەڵ، وخانوو، لەبەر ئەوەی هەرگیز ناتوانیت وەکو خۆی وبەبێ زیاد وکەم بۆ خاوەنەکەی بگێڕیتەوە.

مالکییەکانیش دەڵێن: (دَفْعُ الْمَالِ عَلَى وَجْهِ الْقُرْبَةِ لِلَّهِ تَعَالَى؛ لِيَنْتَفِعَ بِهِ آخِذُهُ، ثُمَّ يَرُدُّ لَهُ مِثْلَهُ أَوْ عَيْنَهُ)[2]. واتە: بریتییە لەپێدانی پارە بەنیەتی چاکە ونزیکبوونەوە لەخوای گەورە، تا وەرگرەکەی سوودی لێ ببینێت، ودواتر هاوشێوەی قەرزەکە یان خودی قەرزەکە بگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی.

لای شافیعییەکانیش بریتییە لە: (تَمْلِيكُ الشَّيْءِ عَلَى أَنْ يُرَدَّ بَدَلُه)[3]. واتە: پێدانی شتێکە بەکەسێکی تر بۆ ئەوەی بەرامبەرەکەی بگێڕێتەوە.

حەنبەلییەکانیش دەڵێن: (دَفْعُ مَالٍ إرْفَاقًا لِمَنْ يَنْتَفِعُ بِهِ وَيَرُدُّ بَدَلَهُ)[4]. واتە: پێدانی پارەیەکە بەنیەتی چاکە بەکەسێك کەسوودی لێدەبینێت ودواتر بەرامبەرەکەی دەگێڕێتەوە.

ئەگەر بەراوردێکی نێوان پێناسەکان بکەین دەبینین زۆرینەی زانایان لە مالیکی، وشافیعی، وحەنبەلییەکان بەپێچەوانەی حەنەفییەکانەوە مەرجی ئەوە دانانێن کەدەبێت قەرز هاوشێوەی هەبێت، بەڵکو دەکرێت هاوشێوەی نەبێت ودواتر قەرزارەکە نرخەکەی یان بەرامبەرەکەی بگێڕێتەوە ودیارە بۆچوونی زۆرینەی زانایانیش لەم بابەتەدا لە بۆچوونی حەنەفییەکان پەسەند ترە.

---

١ - إبن عابدين، حاشية إبن عابدين (رد المحتار على الدر المختار)، ج٥، ط٢، دار الفكر، بيروت، ١٤١٢، ص١٦١.

٢ - العدوي (علي بن أحمد)، ج٢، حاشية العدوي على شرح كفاية الطالب الرباني، دار الفكر، بيروت،١٤١٤، ص١٦٤، تحقيق: يوسف البقاعي.

٣ - الشربيني، مغني المحتاج إلى معرفة معاني ألفاظ المنهاج، ج٣، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤١٥، ص٢٩.

٤ - البهوتي (منصور بن يونس)، كشاف القناع عن متن الإقناع، ج٣، دار الكتب العلمية، بيروت، ص٣١٢.

**چوارەم: سروشتی قەرز بەپێی بنەما شەرعییەکان:**

بیرۆکەی قەرز بەپێی بنەما شەرعییە گشتییەکان دروست نییە ولەگەڵ هەندێك لەو بنەمایانە دژ دەوەستێتەوە لەوانە:

١- قەرز بەجۆرێك لەجۆرەکان سووی تێدایە بەتایبەت ئەگەر قەرزەکە بەو کانزا یان شتانە بێت کە سوویان تێدا دروست دەبێت، وکو (ئاڵتون، زیو، پارە، گەنم، جۆ، برنج، هتد) بۆ نموونە: ئەگەر برِی (١٠٠٠$) دۆلار بدەین بەکەسێك بەقەرز بۆ ماوەیەك، پاش ماوەکە ئەو برِی (١٠٠٠$) ی گەرِاندەوە، یان نرخەکەی بەدراوێکی تری وەکو دینار یان تومەن گەرِاندەوە، ئەمە لەشەرعدا وەکو گۆرِینەوەی پارە بەپارە وایە؛ چونکە ئێمە هەزار دۆلارمان داوەتێ بەهەزار دۆلار وئەویش پاش ماوەیەك هەزار دۆلارەکە یان نرخەکەی گەرِاندۆتەوە، حوکمی پارە گۆرِینەوەیش وەهایە کەدەبێت لەکاتی گۆرِینەوەی پارەکە و ئەنجامدانی گرێبەستەکە، هەردوو پارەکە ئامادەبن، بۆیە قەرز پێچەوانەی ئەم بنەما شەرعیەیە.

٢- قەرز گۆرِینەوەی شتێکی زانراوە بەشتێکی نەزانراو بەتایبەتی لەو شتانەی کە هاوشێوەیان نییە، وەکو ئاژەڵ، بۆ نموونە تۆ بەرخێك یان وشترێك بەقەرز دەبەیت، دواتر مەحاڵە بتوانیت بەرخێك یان وشترێك بەهەمان کێش وهەمان شێوە وهەمان تەمەن بگێرِیتەوە، بۆیە ئەوەی تۆ دواتر دەیهێنیتەوە ئێستا کۆمەڵێك سیفەتی زۆر گرنگی نەزانراوە وئەمەیش لەشەرعدا رِێگە پێنەدراوە؛ چونکە شەرع لەکاتی مامەڵە و ئاڵوگۆرِکردنی هەر شتێکدا - نەك تەنها پارە و ئاڵتون- مەرجی ئەوە دادەنێت کە دەبێت شتەکان زانراوبن.

٣- قەرز فرۆشتنی شتێکە کە تۆ ئێستا خاوەنی نیت ولەداهاتوودا ئەگەر هەیە ببیتە خاوەنی یان نا، بۆ نموونە: کاتێك تۆ پارەیەك، یان گەنمێك، یان ئاژەڵێك بەقەرز وەردەگریت، تۆ ئێستا نیتە یان پێویستتە بۆیە بەقەرز وەری دەگریت، وبەڵێنیش دەدەیت پاش ماوەیەك بیگێرِیتەوە[1]، کەواتە تۆ چۆن شتێکت فرۆشتوە وچویتەتە ژێر باری ئەوەی

---

١ - تەنانەت لەو شتانەی کەهاوشێوەیشیان هەیە وەك ئاڵتون وپارە وگەنم وهتد، زۆر ئاستەمە کەسەکە هەمان ئەو شتە بۆ خاوەن قەرزەکە بگێرِیتەوە کەکاتی خۆی لێی قەرز کردوە، بۆ نموونە هەمان پارە بەهەمان ئەو کاغەزانەی کە وەریگرتون، یان هەمان ئاڵتون، رِاستە قەرزارەکە هەمان برِی پارە یان ئاڵتون دەگێرِیتەوە، بەڵام ئەو پارانە هەمان ئەو کاغەزانە نین کەکاتی خۆی وەرت گرتوە، بەڵکو هاوشێوەیەتی لەبرِو جۆر وقەبارەدا.

کەبیدەیتەوە بەخاوەن قەرزەکە لەکاتێکدا ئێستا خاوەنی نیت، لە ڕووی شەرعەوە ئەم خاڵەیش کێشەیەکی ترە لەقەرزدا[1].

بەڵام سەرەڕای ئەمانە هەمووی ولەبەر بەرژەوەندی هەژاران خوای گەورە نەك هەر ڕێگەی بەقەرز کردن داوە؛ بەڵکو زۆر هانی دەوڵەمەندەکانی داوە ومژدەی زۆر گەورە وبەڵێنی زۆر دڵخۆشکەری پێ داون، تا قەرز بدەن بەهەژاران وکۆمەکیان بکەن وپێداویستییەکانیان پڕ بکەنەوە.

## پێنجەم: حوکمی قەرزدان:

حوکمی قەرزدان بەخەڵکی بەشێوەیەکی گشتی کارێکی چاکە و خوازراوە (مندوب) و زۆرێك لەدەقە شەرعییەکان جەختی لەسەر دەکەنەوە ومژدەی زۆر دڵخۆشکەر دەدەن بەو کەسانەی کە لەم ڕێیەوە هاوکاری خەڵکی دەکەن؛ بەڵام ئەم حوکمە جێگیر ونەگۆڕ نییە؛ بەڵکو بەپێی کات وکار وشوێن وکەسەکان دەگۆڕێت، بەشێوازێك کە هەر پێنج حوکمەکە لە (واجب، حرام، مندوب، مکروه، مباح) دەیگرێتەوە.

بۆ نموونە: کاتێك هەژارێك بۆ کارێکی پێویستی وەکو خواردن، یان چارەسەری نەخۆشی، یان پارەی کرێ خانوو، ڕوو لەدەوڵەمەندێك دەنێت، کە لەوانەیە لەو شوێنەدا تەنها ئەو دەوڵەمەندە هەبێت کەبتوانێت هاوکاری بکات، وئەگەر قەرزی پێنەدات تووشی ناڕەحەتییەکی زۆر دەبێت، پێدانی قەرز بۆ ئەم حاڵەتە پێویستە (واجب)، وئەگەر نەیداتێ ئەوە گوناهبار دەبێت.

بەڵام ئەگەر هەژارێك یان هەرکەسێکی تر بۆ کارێکی حەرام داوای قەرزی کرد، وەکو کڕینی تلیاك، یان عارەق، یان کاری بەدڕەوشتی، یان بۆ مامەڵەیەك کە سووی تێدایە، یان بۆ جل وبەرگێکی ناشەرعی، یان هەر کارێکی حەرامی تر، لەهەموو ئەم حاڵەتانەدا بەپێچەوانەی حاڵەتی پێشوو (حرام) ە و دروست نییە قەرز بدرێت بەو جۆرە کەسانە ودەستگیرۆیی بکرێن، وهەر کەس هاوکاریان بکات دەبێتە هاوبەشی تاوانەکانیان.

---

١ - القرافي (أحمد بن إدريس)، أنوار البروق في أنواع الفروق، ج٤، دار الكتب العلمية، بيروت، ط١٤١٨/١٩٩٨، ص٢، تحقيق خليل المنصور.

خۆ ئەگەر بازرگانێك بۆ فراوانکردنی سنووری بازرگانییەکەی داوای قەرزی کرد، وهیچ پێویستییەکی ئەوتۆی پێ نەبێت وئەگەر نەیدەیتێ تووشی هیچ زیانێك نەبێت، حوکمی پێدانی قەرز بۆ ئەم جۆرە حاڵەتانە ڕێگەپێدراوە (مباح) ە، واتە ئەو کەسە خۆی ئازادە لەوەی دەیداتێ یان نا.

هەندێك جاریش لەوانەیە پێدانی قەرز باش نەبێت (مكروه) بێت، ئەویش ئەگەر گومانی ئەوەمان هەبوو کەسەکە بۆ کاری ناشەرعی بەکاری دەهێنێت، بەڵام تەواو دڵنیا نەبووین.

جاری وایش هەیە لەوانەیە پێدانی قەرز باشتر بێت (مندوب) بێت، بۆ نموونە: ئەگەر گومانی ئەوەمان هەبوو ئەو کەسەی داوای قەرزەکەی کردوە تووشی زیان دەبێت ئەگەر نەیدەینێ.

بۆیە پێویستە هەر قەرزێك هەڵسەنگاندنی سەربەخۆی بۆ بکرێت، تا بزانین حوکمەکەی چییە وچۆنە.

### شەشەم: مەرجەکانی قەرزی شەرعی:

ئەو مەرجانەی کەپێویستە ڕەچاو بکرێن لەکاتی پێدانی قەرزدا بریتین لە:

١- دەبێت قەرزەکە تەنها لەپێناو ڕەزامەندی خوای گەورە و پڕکردنەوەی پێداویستی خەڵکیدا بێت ونابێت دەوڵەمەندەکان هیچ سوویەك یان زیادەیەك یان بەرژەوەندییەکیان لەقەرزەکانیاندا هەبێت، ئەگەر نا حەرامە ودروست نییە، لەبەر ئەو خاڵانەی کەپێشتر باسمان کرد. هەر بۆیە خوای گەورە کەباسی قەرز وپاداشتەکەی دەکات لە قورئاندا هەمیشە وابەستەی وشەی (حسن) ی دەکات، کەمەبەست پێی چاکە وخێرە نەك شتێکی تر، بۆ نموونە لەسورەتی (التغابن) دا دەفەرموێت: ﴿إِنْ تُقْرِضُوا اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَاعِفْهُ لَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ﴾[1]. واتە: ئەگەر قەرزێك بەمەبەستی چاکە وخێر بدەن بەخوای گەورە، خوای گەورە

---

١ - سوره التغابن: الآية (١٧). ئەمەو لەچەندین ئایەتی تردا خوای گەورە بەهەمان شێوە باسی قەرز دەکات بۆ نموونە: ﴿مَّن ذَا الَّذِي يُقْرِضُ اللهَ قَرْضاً حَسَناً فَيُضَاعِفَهُ لَهُ أَضْعَافاً كَثِيرَةً﴾. سورة البقرة: الآية (٢٤٥). ﴿وَأَقْرَضْتُمُ اللهَ قَرْضاً حَسَناً لَّأُكَفِّرَنَّ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ﴾. سورة المائدة: الآية (١٢). ﴿مَن ذَا الَّذِي يُقْرِضُ اللَّهَ قَرْضاً حَسَناً فَيُضَاعِفَهُ لَهُ وَلَهُ أَجْرٌ كَرِيمٌ﴾. سورة الحديد: الآية (١١). ﴿إِنَّ الْمُصَّدِّقِينَ وَالْمُصَّدِّقَاتِ وَأَقْرَضُوا اللَّهَ قَرْضاً حَسَناً يُضَاعَفُ لَهُمْ وَلَهُمْ أَجْرٌ كَرِيمٌ﴾. سورة الحديد: الآية (١٨). ﴿وَأَقْرِضُوا اللَّهَ قَرْضاً حَسَناً﴾. سورة المزمل: الآية (٢٠).

چەند هێندی قەرزەکە پاداشتتان دەداتەوە ولێتان خۆش دەبێت. جا ئەگەر سەرنجی ئایەتەکان بدەین خوای گەورە لەهیچ کامیاندا نافەرموێت قەرز بدەن بەهەژاران، بەڵکو دەفەرموێت بیدەن بەخوای گەورە، ئەمەیش بۆ هەڵنانی دەوڵەمەندەکانە تا بزانن ئەو قەرزەی دەیدەن بە هەژاران بەخوای گەورەیان داوە وئەو پاداشتیان دەداتەوە نەك هەژارەکان، ئەمەیش مژدەیەکی دڵخۆشکەرە بۆ ئەوان.

پێغەمبەری خودایش ﷺ دەربارەی خێری قەرزدان دەفەرموێت: {مَا مِنْ مُسْلِمٍ يُقْرِضُ مُسْلِماً قَرْضاً مَرَّتَيْنِ إلاَّ كانَ كَصدَقَتِهَا مَرَّةً }[١]. واتە: هەر مسوڵمانێك دووجار قەرز بداتە هەر موسوڵمانێك، وەك ئەوە وایە پارەکەی کردبێت بەخێر، ئەمەیش دیسان مژدەیەکی گەورەیە وپێویستە خاوەن دەسمایەکان لەدەست خۆیانی نەدەن.

عەبدوڵلای کوڕی عومەر دەربارەی قەرز دەفەرموویێت: (السَّلَفُ عَلَى ثَلَاثَةِ وُجُوهٍ: سَلَفٌ تُرِيدُ بِهِ وَجْهَ اللهِ فَلَكَ وَجْهُ اللهِ، وَسَلَفٌ تُرِيدُ بِهِ وَجْهَ صَاحِبِكَ فَلَكَ وَجْهُ صَاحِبِكَ، وَسَلَفٌ تُسْلِفُهُ لِتَأْخُذَ خَبِيثًا بِطَيِّبٍ فَذَلِكَ الرِّبَا)[٢]. واتە: قەرز سێ جۆرە: قەرزێك مەبەستت پێی ڕەزامەندی خوای گەورە بێت، ئەوە خوا لەخۆت ڕازی دەکەیت، قەرزێك مەبەستت پێی ڕەزامەندی برادەرەکەت بێت، ئەوە برادەرەکەت لەخۆت ڕازی دەکەیت، قەرزێك مەبەستت پێی گۆڕینەوەی پیس بێت بەپاك[٣]، ئەوەیان سووە.

٢- دەبێت ئەو پارەیەی کە دەدرێت بە قەرز لەڕێگەی حەڵاڵەوە پەیدا کرابێت وسەرچاوەی داهاتەکەی حەرام نەبێت؛ چونکە خوای گەورە پارەی حەرام بۆ کاری چاکە قبوڵ ناکات، هەر وەك پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: {أيُّها الناس إنَّ الله طيّبٌ لا يَقْبَلُ إلا طيّباً}[٤]. واتە: ئەی خەڵکینە خوای گەورە پاکە وتەنها پاکیش لە بەندەکانی قبوڵ دەکات. پارەی حەرامیش پاك نییە؛ بۆیە خوای گەورە قبوڵی ناکات، نەك تەنها بۆ قەرز تەنانەت بۆ خێر وزەکاتیش خوای گەورە قبوڵی نییە وزەکاتی لێ دەرناچێت.

---

١ - الألباني (محمد ناصر الدين الألباني)، إرواء الغليل في تخريج أحاديث منار السبيل، ج٥، ط٢، المكتب الإسلامي، بيروت، ط ١٤٠٥، ص٢٢٥. وقال في تخريجه: رواه إبن ماجة واسناده حسن.

٢ - البيهقي (أبو بكر أحمد)، السنن الكبرى، ج٥، ط١، الناشر مجلس دائرة المعارف النظامية، حيدر آباد، ١٣٤٤، ص٣٥٠.

٣ - مەبەستی ئەوەیە پارەیەکی حەڵاڵ کە بەڕەنجی شان پەیدات کردوە بیدەیت بەسوو.

٤ - مسلم، صحيح مسلم، ج٢، رقم الحديث (١٠١٥)، ص٧٠٣.

٣- نابێت خاوەن قەرزەکە پاداشتی قەرزەکەی بەقسەی ڕەق وناخۆش یان بە منەت کردن وچاوشکاندن یان بە غەیبەت کردن وناو زڕاندنی قەرزارەکە بەتاڵ بکاتەوە؛ چونکە هەموو ئەوانە پاداشتی قەرز کەم دەکەنەوە وبەتاڵی دەکەنەوە؛ بۆیە خوای گەورە لەقورئاندا دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تُبْطِلُواْ صَدَقَاتِكُم بِالْمَنِّ وَالأذَى﴾[١]. واتە: ئەی گرۆهی باوەڕداران پاداشتی چاکەکانتان بەمنەت وئازاردانی ئەو کەسانەی چاکەتان لەگەڵ کردون بەتاڵ مەکەنەوە، جاری وا هەیە کەسێك قەرزێکی داوە بە کەسێك، هێندە سەرکۆنەی دەکات لەناو خەڵکدا ئابڕوی دەبات، ئەمە هەرگیز پێی ناگوترێت قەرزی حەسەنە، ئەو قەرزە شەڕی لەخێری زیاترە.

پێغەمبەری خودا ﷺ لە فەرمووده‌یەکدا دەفەرموێت: {مَنْ نَفَّسَ عَنْ مُؤْمِنٍ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ الدُّنْيَا نَفَّسَ اللَّهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ، وَمَنْ يَسَّرَ عَلَى مُعْسِرٍ يَسَّرَ اللَّهُ عَلَيْهِ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ}[٢]. واتە: هەر کەسێك گرفتێك لەگرفتەکانی دونیای باوەڕدارێك چارەسەر بکات، خوای گەورە گرفتێك لەگرفتەکانی قیامەتی بۆ ئاسان دەکات وچارەسەر دەکات، وە هەرکەس چاوپۆشی لە قەرزارێکی نەدار وهەژار بکات، خوای گەورە چاوپۆشی لەتاوان وهەڵەکانی دەکات لە دونیاو دوارۆژدا و لێیان خۆش دەبێت.

لەفەرمووده‌یەکی تردا باسی پیاوێکی دەوڵەمەندمان بۆ دەگێڕێتەوە ودەفەرموێت: {كَانَ رَجُلٌ يُدَايِنُ النَّاسَ فَإِذَا أَعْسَرَ الْمُعْسِرُ قَالَ لِفَتَاهُ: تَجَاوَزْ عَنْهُ فَلَعَلَّ اللَّهَ يَتَجَاوَزُ عَنَّا، فَلَقِيَ اللَّهَ فَتَجَاوَزَ عَنْهُ}[٣]. واتە: پیاوێکی دەوڵەمەند هەبوو قەرزی دەدا بەخەڵکی، ئەگەر قەرزارێك نەیبوایە قەرزەکەی بداتەوە بەشاگردەکەی دەگوت: وازی لێبێنە وچاوپۆشی لێبکە؛ بەڵکو خوای گەورە چاوپۆشی لەهەڵە وتاوانەکانمان دەکات، کەوەفاتی کرد وگەڕایەوە لای خوای گەورە، خوای گەورە لێی خۆشبوو.

٤ - ئەم مەرجەیان پەیوەندی بەقەرزارەکانەوە هەیە، کە مەرجە ئەمانیش لەلای خۆیانەوە پابەند بن بەوەی لەکاتی خۆیدا قەرزی دەوڵەمەندەکان بگێڕنەوە وپابەند بن بە

---

١ - سورة البقرة: الآية (٢٦٤).

٢ - مسلم، صحيح مسلم، ج٤، ص٢٠٧٤، رقم الحديث (٢٦٩٩).

٣ - مسلم، صحيح مسلم، ج٣، رقم الحديث (١٥٦٢)، ص١١٩٦.

بەڵێنەکانیانەوە، خۆ ئەگەر وانەکەن ئەو کات قەرزەکە بۆ ئەمان حەرام دەبێت وناببێت وەریبگرن.

پێغەمبەری خودا ﷺ لەو بارەیەوە دەفەرموێت: {مَطْلُ الْغَنِيِّ ظُلْمٌ}[١]. واتە: گرتنی پارەی قەرز ونەگێڕانەوەی لەکاتی خۆیدا بەبێ هۆ ستەمە وحەرامە. لەفەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت: {لَيُّ الْوَاجِدِ يُحِلُّ عِرْضَهُ وَعُقُوبَتَهُ}[٢]. واتە: هەر کەس دەیتوانی قەرزەکەی سەری بداتەوە؛ بەڵام بە ئارەزوو نەیدەدایەوە، ئەوە مافی خاوەن قەرزەکەیە کە باسی بکات[٣] وسکاڵای لەدژ تۆمار بکات وسزایشی بدات. ئەم سزایەش تەنها بۆ دونیا نییە؛ بەڵکو لەگەڵی دەڕواتە قیامەت و لەوێش لێپێچینەوەی لەسەر قەرزەکەی لەگەڵ دەکرێت، هەر وەك پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: {نَفْسُ الْمُؤْمِنِ مُعَلَّقَةٌ بِدَيْنِهِ حَتَّى يُقْضَى عَنْهُ}[٤]. واتە: ڕۆحی مرۆڤی باوەڕدار کە شایەنی بەهەشتیش بێت، ڕادەگیرێت وناچێتە بەهەشتەوە تا قەرزەکانی دونیای بۆ نەدرێتەوە.

ئەم فەرموودانە وچەندین فەرموودەی تر هەن کە هەڕەشە لەخەڵکی دەکەن، بەوەی پێویستە بۆ کاتی پێویست نەبێت قەرز نەکەن، وهەر کاتیش قەرزیان کرد پێویستە لەکاتی خۆیدا قەرزی خاوەن قەرزەکان بگێڕنەوە.

ئەمانە ئەو مەرجانەن کە پێویستە لەهەر قەرزێکدا هەبن بۆ ئەوەی قەرزەکە شەرعیی بێت.

---

١ - البخاري، صحيح البخاري، ج٣، رقم الحديث (٢٢٨٧)، ص٩٤. مسلم، صحيح مسلم، ج٣، رقم الحديث (١٥٦٤)، ص١١٩٧.

٢ - البخاري، صحيح البخاري، ج٣،ص١١٨.

٣ - لەم حاڵەتەیشدا نابێت باسکردنەکە بچێتە قاڵبی غەیبەت وناوزڕاندنەوە؛ بەڵکو ئەبێت بەمەبەستێکی شەرعی بێت، بۆ نموونە لای کەسێك باسی بکات وسکاڵای بکات کە بتوانێت مافەکەی بۆ وەربگرێتەوە، یان بۆ ئەوە بێت خەڵکی تری لێ ئاگادار بکاتەوە تا قەرزی نەدەنێ وئەوانیش تووشی کێشە نەبن.

٤ - إبن حبان (محمد بن حبان)، صحيح ابن حبان بترتيب ابن بلبان، ج٧، ط٢، مؤسسة الرسالة، بيروت، ١٤١٤،١٩٩٣، ص٣٣١، تحقيق: شعيب الأرنؤوط. رقم الحديث (٣٠٦١)، وقال الأرنؤوط في تخريجه: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

حەوتەم: پێناسەی سووی قەرز:

سووی قەرز بریتییە لەو سوودەی کەبەهۆی قەرزەوە دروست دەبێت، جا هەر لەسەرەتاوە بەسوو قەرزەکەی پێبدات و مەرجی ئەوەی لەسەر دابنێت کە ڕێژەیەکی زیاتر لەقەرزەکەی بۆ بگێڕێتەوە.

یانیش سەرەتا بەسوو قەرزەکەی نەداتێ بەڵام کاتێك قەرزارەکە ناتوانێت لەکاتی خۆیدا پارەی قەرزەکە بگێڕێتەوە، ئەم لەبەرامبەر درێژکردنەوەی ماوەی قەرزەکە پارەی زیاتری لێ وەربگرێت.

سووی قەرزیش سروشتی وایە کە تایبەت نییە بەشتێکی دیاری کراوەوە؛ بەڵکو لەهەموو شتێکدا دروست دەبێت، لەو بارەیەوە زانایان بنەمایەکی فیقهییان داڕشتوە دەڵێت: (كل قرض جر نفعا فهو ربا)[1]. واتە: هەر قەرزێك سوودی ڕاکێشا بۆ خاوەن قەرزەکە ئەو سوودە بەسوو ئەژمار دەکرێت.

کەواتە دەبێت خاوەن قەرزەکان زۆر ئاگاداری ئەم خاڵە بن کاتێك لەبەر خوای گەورە قەرز دەدەنە هەر کەسێك نابێت بەهیچ شێوەیەکی چاوەڕێی سوود یان پاداشتێکی دونیایی لەقەرزەکەیان بکەن.

دەگێڕنەوە جارێکیان پیاوێك (٢٠) درهەمی بەقەرز دابوو بەکەسێك، قەرزارەکە هەموو جارێك دەچوو دیاری دەدا بە خاوەن قەرزەکە، وخاوەن قەرزەکەیش دیارییەکانی دەفرۆشت، ڕۆژێکیان خاوەن قەرزەکە هات بۆ لای عەبدوڵلای کوڕی عەبباس وبابەتەکەی بۆ گێڕایەوە وپێی گوت: ئەو دیاریانەی کەبۆی هێناوم فرۆشتومە بایی (١٣) درهەمە، عەبدوڵلای کوڕی عەبباس پێی گوت: حەرامە لە (٧) درهەم زیاتری لێوەربگریتەوە[2].

کەواتە عەبدوڵلای کوڕی عەبباس پێی وایە ئەوانەی قەرزارەکە بەناوی دیارییەوە هێناویەتی بۆ خاوەن قەرزەکە لەڕاستییدا بەسوو ئەژمار دەکرێن و وەرگرتنی حەرامە ودروست نییە.

سالمی کوڕی ئەبی جەعد دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پیاوێکمان هەبوو ماسیگر بوو (٥٠) درهەمی پیاوێکی دراوسێیان قەرزداربوو، خاوەن قەرزەکە هاتە لای عەبدوڵلای کوڕی

---

١ - زانایان بۆچوونیان جیاوازە لەسەر ئەوەی کە ئایا ئەوە فەرموودەیە یان نا، بەڵام هەموویان کۆکن لەسەر کارپێکردنی وەکو بنەمایەکی شەرعی، چونکە لەڕاستیدا وەکو فەرموودە لاوازە.

٢ - البيهقي، السنن الكبرى، ج٥، ص٣٤٩، وصححه الألباني في: إرواء الغليل، ج٥، قال. وإسناده صحيح، ص٢٣٤.

عەبباس وپێی گوت: من پارەم لای ئەو پیاوەیە، و جار جار کە لەڕاوە ماسی دێتەوە هەندێك ماسیمان بۆ دەنێرێت، عەبدوللای کوڕی عەبباس گوتی: (قَاصَّةُ بِمَا أَهْدَى لَكَ)[١]. واتە: چی ماسی بەدیاری بۆ ناردویت پارەکەی لەپارەی قەرزەکە بشکێنە، وچەندی مایەوە ئەوەندەی لێ وەربگرەوە.

ئیبن عبد البر لەبارەی سووی قەرزەوە دەڵێت: (وَكُل زِيَادَةٍ فِي سَلَفٍ أَوْ مَنْفَعَةٍ يَنْتَفِعُ بِهَا الْمُسَلِّفُ فَهِيَ رِبًا، وَلَوْ كَانَتْ قَبْضَةً مِنْ عَلَفٍ، وَذَلِكَ حَرَامٌ إنْ كَانَ بِشَرْطٍ)[٢]. واتە: هەر زیادەیەك یان سوودێك بە خاوەنی قەرزەکە بگات ولەبەرژەوەندی ئەو بێت ئەوە سووە. با ئەو زیادەیە مشتێك بڕوێش بێت؛ چونکە ئەگەر بەمەرج گیرابوو حەرامە.

ئیبن لمنذریش دەڵێت: (أَجْمَعُوا عَلَى أَنَّ الْمُسَلِّفَ إِذَا شَرَطَ عَلَى الْمُسْتَسْلِفِ زِيَادَةً أَوْ هَدِيَّةً، فَأَسْلَفَ عَلَى ذَلِكَ، أَنَّ أَخْذَ الزِّيَادَةِ عَلَى ذَلِكَ رِبًا)[٣]. واتە: زانایان بەکۆی دەنگ پێیان وایە کە ئەگەر خاوەن قەرزەکە مەرجی ئەوەی لەسەر قەرزارەکە دانا کە زیاد لە قەرزەکەی بۆ بگێڕێتەوە، یان دیارییەکی لەگەڵ قەرزەکەی بۆ بێنێتەوە ولەسەر ئەو مەرجە قەرزی دایە، ئەگەر ئەو زیادەیە یان دیارییە لەقەرزارەکە وەربگرێتەوە سووە.

قورطوبیش دەڵێت: (أجمع المسلمون نقلا عن نبيهم ﷺ أن اشتراط الزيادة في السلف ربا. ولو كان قبضة من علف.. أو حبة واحدة)[٤]. واتە: زانایان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کە لەپێغەمبەرکەیانەوە ﷺ پێیان گەیشتوە، کە مەرجی گێڕانەوەی شتێکی زیاتر لەبڕی قەرزەکە سووە، با مشتێك بڕوێشیش بێت، یان تەنها یەك دەنکیش بێت.

ئیبن قودامەیش دەڵێت: (وَكُلُّ قَرْضٍ شَرَطَ فِيهِ أَنْ يَزِيدَهُ، فَهُوَ حَرَامٌ بِغَيْرِ خِلَافٍ)[٥]. واتە: هەر قەرزێك مەرجی ئەوەی تێدا بێت، قەرزارەکە شتێکی زیاتر بۆ خاوەن قەرزەکە بگێڕێتەوە، ئەوە بەکۆی دەنگ حەرامە ودروست نییە.

سەبارەت بەحوکمی دیاری لەنێوان کەسی قەرزدار وخاوەن قەرزدا، ئەگەر ئەو دوو کەسە بەر لەقەرزەکە عادەتیان وابوو دیاری لەگەڵ یەکتر بگۆڕنەوە ویەکتر بەسەر

---

١ - البيهقي، السنن الكبرى، ج٥، ص٣٥٠، مصدر سابق. وصححه الألباني في: إرواء الغليل، ج٥، ص٢٣٤.

٢ - إبن عبد البر (يوسف بن عبد الله)، الكافي، ج٢، ط٢، مكتبة الرياض ، ١٤٠٠، ص٧٢٨، تحقيق: محمد محمد أحيد.

٣ - إبن قدامة (موفق الدين عبد الله بن أحمد)، المغني، ج٤، مكتبة القاهرة، ط١٣٨٨،١٩٦٨، ص٢٤٠.

٤ - القرطبي، تفسير القرطبي، ج٣،ص٢٤١، مصدر سابق.

٥ - إبن قدامة، المغني، ج٤،ص٢٤٠، مصدر سابق.

بکەنەوە، ئەوە ئاسییە لەکاتی بوونی قەرزەکەیش لەنێوانیاندا لەسەر هەمان عادەتی خۆیان بەردەوام بن؛ بەڵام بەمەرجێك لە حاڵەتە ئاساییەکەی پێش قەرزەکە دەرنەچێت، خۆ ئەگەر زیادی کر بەتایبەتی لەلایەن کەسی قەرزدارەوە بۆ خاوەن قەرزەکە، ئەوە پێویستە خاوەن قەرزەکە وەری نەگرێت؛ چونکە گومانی سووی لێ دەکرێت.

خۆ ئەگەریش ئەو دوو کەسە بەر لە قەرزەکە هیچ دیارییان بەیەکتر نەدابوو، ئەوە حەرامە لەکاتی بوونی قەرزەکەدا، کەسی خاوەن قەرز هەر دیارییەك لە قەرزارەکە وەربگرێت چونکە گومانی سووی لێدەکرێت.

بەڵام پاش کۆتایی هاتنی وادەی قەرزەکە ئەگەر قەرزدار لەکاتی هێنانەوەی قەرزەکەدا دیارییەکی لەگەڵ خۆی هێنابوو بەبێ ئەوەی کەس پێی گوتبێت، یان مەرجی لەسەر دانابێت، ئەوە نابێتە سوو وئاساییە خاوەن قەرزەکە لێی وەربگرێت. ئەو دوو بابەتەیش کە لەعەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە گێڕامانەوە، بەم شێوازە ڕاڤەی بۆ دەکرێت. نەك بە ڕەهایی.

بابەتێکی فیقهی تر هەیە کە هەر پەیوەندی بەم بابەتەوە هەیە وکاتی خۆی زانایان زۆر قسەیان لەسەر کردوە، ئەویش بابەتی (سفتجة) یە، کە بریتییە لەوەی کەسێك بڕێك پارە بەقەرز بداتە کەسێکی تر بابڵێین لە سلێمانی، بەڵام مەرجی ئەوە لەسەر قەرزارەکە دابنێت کە لە هەولێر قەرزەکەی بداتەوە؛ چونکە بردنی پارە لێرەوە بۆ هەولێر مەترسی لەسەرە ولەوانەیە بدزرێت. زانایان لێرەدا قسە لەسەر ئەو مەرجە دەکەن کە خاوەن قەرزەکە لەبەرژەوەندی خۆی لەسەر قەرزارەکەی داناوە، ئایا دەبێت بە سوو یان نا؟. کە هەرچەندە سوودەکە سوودێکی مادی نییە، لەگەڵ ئەوەیشدا زۆرینەی زانایان لە مالیکی[١]، وشافیعی[٢]، وظاهیرییەکان[٣] پێیان وایە ئەوەیش هەر سووە وحەرامە، وبەلای حەنەفییەکانیشەوە[٤] باش نییە (مکروه)[٥].

---

١ - مالیکییەکان تەنها لە حاڵەتی ناچاریدا ولەبەر بەرژەوەندی گشتی وپاراستنی ماڵی موسوڵمانان ڕێگەی پێدەدەن. الحطاب (محمد بن محمد)، مواهب الجليل ، ج٤، ط٣، دار الفكر، بيروت، ١٩٩٢، ص٥٤٨.

٢ - الماوردي (أبو الحسن علي بن محمد بن محمد)، الحاوي الكبير، ج٦، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت. ط١٤١٩،١٩٩٩، ص٤٦٧، تحقيق: علي محمد معوض، عادل أحمد عبد الموجود.

٣ - إبن حزم (علي بن أحمد بن سعيد)، المحلى بالآثار، ج٨، دار الفكر، بيروت، ص٧٧، تحقيق: أحمد محمد شاكر.

٤ - إبن نجيم، البحر الرائق شرح كنز الدقائق، ج٦، ط٢، دار الكتاب الإسلامي، بيروت، ص٢٧٦.

٥ - بەڵام بەلای ئیبن تەیمیە وئیبن قەییم وئیبن قودامە وچەند زانایەکی ترەوە ئەم مەرجە دروستە وکێشەی نییە. بڕوانە. إبن قدامة، المغني، ج٤،ص٢٤٠، مصدر سابق.

## بەشی چوار[1]

## گەڕاندنەوەی قەرز و حوکمی فرۆشتن بەگوژمە

تەوەرەکانی ئەم بەشە بریتین لە:

**یەکەم:** گەڕاندنەوەی قەرز بەهاوشێوەی قەرزەکە دەبێت لە ڕووی چەندێتی وچۆنێتیەوە.

**دووەم:** ڕێکەوتن لەسەر گەڕاندنەوەی قەرز بە دراوێکی تر.

**سێیەم:** لەکارکەوتنی دراوێکی یاسایی.

**چوارەم:** حوکمی کڕینو فرۆشتن بەقەرز وبە گوژمە (البیع بالتقسیط) بەپارەی زیاتر.

**پێنجەم:** مەرجەکانی کڕینو فرۆشتن بەقەرز وبە گوژمە.

### یەکەم: گەڕاندنەوەی قەرز:

گەڕاندنەوەی قەرز بەهاوشێوەی قەرزەکە دەبێت لە ڕووی چەندێتی وچۆنێتییەوە؛ بۆیە ئەگەر کەسێك قەرزی دا بەکەسێك بەدراوێکی دیاریکراوی وەکو دۆلار، دواتر نرخی ئەم دراوە بەرز ونزمی کرد ونرخەکەی گۆڕا، کەسی خاوەن قەرز بۆی نییە کەسی قەرزار ناچار بکات بەدراوێکی تری وەکو دینار یان یۆرۆ قەرزەکەی بۆ بگێڕێتەوە، یان قەرەبووی زیانەکەی بۆ بکاتەوە. یان بە پێچەوانەوە کەسی قەرزار بۆی نییە خاوەن قەرز ناچار بکات، کە بەدراوێکی تر قەرزەکەی لێ وەربگرێتەوە؟ یان برێك لەقەرزەکەی بۆ دابشکێنێت. بەڵکو هەردووکیان پابەند دەبن بەوەی کە قەرزەکە چەند بووە وبەچ دراوێك کراوە وکاتی گەڕانەوەی قەرزەکە کەیە، لەکاتی خۆیدا هەمان بڕ وبەهەمان جۆری دراو قەرزەکە بدرێتەوە.

حەنەفییەکان لەم بارەیەوە دەڵێن: (عَلَى الْمُسْتَقْرِضِ رَدُّ مِثْلِ ما قبض)[1]. واتە: پێویستە قەرزار هاوشێوەی ئەوە بگێڕێتەوە بۆ خاوەن قەرز کە لێی وەرگرتوە.

---

١ - ئەم بەشە ڕۆژی (٢٠١٤/١٢/٢٠) تۆمار کرا.

مالیکییەکانیش دەڵێن: (..(وَ) جَازَ (قَضَاءُ قَرْضٍ)..(بِ) شَيْءٍ (مُسَاوٍ) لِمَا فِي الذِّمَّةِ قَدْرًا وَصِفَةً)(٢). واتە: گێڕانەوەی قەرزەکە بەشتێکی هاوشێوەی خۆی لەبڕ وشێوەدا دەبێت.

شافیعییەکانیش دەڵێن: (ویجب على المستقرِض ردُّ المثل فيما له مثل)(٣). واتە: پێویستە لەسەر کەسی قەرزار هاوشێوەی قەرزەکەی بگێڕێتەوە لەو شتانەی هاوشێوەی هەیە.

حەنبەلییەکانیش دەڵێن: (وَيَجِبُ رَدُّ الْمِثْلِ فِي الْمَكِيلِ وَالْمَوْزُونِ إجماعا)(٤). واتە: کۆدەنگی زانایان لەسەر ئەوەیە کە پێویستە هاوشێوەی قەرزەکە لە پێوانە وکێشانەدا بگێڕدرێتەوە.

ظاهیرییەکانیش دەڵێن: (فلا يحل إقراض شيء ليرد إليك أقل ولا أكثر ولا من نوع آخر أصلاً...لكن مثل ما أقرضت في نوعه ومقداره.... وهذا إجماع مقطوع به)(٥). واتە: دروست نییە شتێك بدەیت بەقەرز بۆ ئەوەی کەمتر یان زیاتر یان شتێکی ترت بۆ بهێنێتەوە، بەڵکو هاوشێوەی ئەوەی بەقەرز پێت داوە لەجۆنێتی وچەندێتیدا، وئەمەیش کۆدەنگی زانایانی لەسەرە وبڕاوەتەوە.

کۆمکاری فیهقی ئیسلامیش لەو بارەیەوە دەڵێن: (وفاء الديون الثابتة بعملة ما: هي بالمثل وليس بالقيمة؛ لأن الديون تُقضى بأمثالها، فلا يجوز ربط الديون الثابتة في الذمة أياً كان مصدرها بمستوى الأسعار)(٦). واتە: گێڕانەوەی قەرزە جێگیرەکان بەدراوێك لە دراوەکان بە هاوشێوەی خۆی دەبێت، نەك بەنرخەکەی؛ چونکە قەرز بەهاوشێوەی خۆی دەدرێتەوە، بۆیە دروست نییە ئەو قەرزانەی کەهەن سەرچاوەکەیان هەرچی بێت ببەسترێنەوە بەئاستی نرخەکانیانەوە.

---

١ - إبن مازة (محمود بن أحمد بن عبد العزيز)، المحيط البرهاني في الفقه النعماني، ج٧، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت، ٢٠٠٤،١٤٢٤، تحقيق: عبد الكريم سامي الجندي، ص١٢٩.

٢ - إبن عليش (محمد بن أحمد)، منح الجليل شرح مختصر خليل، ج٤، دار الفكر، ط١٩٨٩،١٤٠٩، بيروت، ص٥٢٨.

٣ - الشيرازي (أبو اسحاق إبراهيم بن علي)، المهذب، ج٢، دار الكتب العلمية، بيروت، ص٨٥.

٤ - إبن مفلح (إبراهيم بن محمد)، المبدع في شرح المقنع، ج٤، ط١، دار الكتب العلمية، ١٩٩٧،١٤١٨، ص١٩٧.

٥ - إبن حزم، المحلى بالآثار، ج٨، ص٤٦٧، مصدر سابق.

٦ - مجلة مجمع الفقه الإسلامي، ع ٥، ج٣، ص١٦٠٩. القرار رقم:٤٢ (٤ /٥) في دورة مؤتمره (٥) بالكويت.

بەڵام حاڵەتێکی نا ئاسایی هەیە کە لەوانەیە ڕووبدات، ئەویش ئەوەیە ئەگەر نرخی ئەو دراوە یان شتەی بووە بەقەرز، یەك لەسەر سێی (٣/١)[١] و زیاتری بەهاکەی گۆڕا، جا زیادی کرد وقەرزارەکە زۆر زیانی بەر دەکەوت، یان بەپێچەوانەوە کەمی کرد وخاوەن قەرزەکە زۆر زیانی بەردەکەوت و لایەنی زیان لێکەوتوو ڕازی نەبوو[٢] بەوەی هەمان دراو بداتەوە یان وەربگرێتەوە، لەم حاڵەتەدا هەردوکیان ناچار دەکرێن بەوەی پێك بێن وزیانەکە بەشێوەیەکی گونجاو وادوەرانە دابەش بکرێت بەسەریاندا وتەنها بەر لایەنێك نەکەوێت، وکۆمکاری فیقهی ئیسلامی لەو بارەیەوە دەڵێت: (إذا كان التضخم كثيراً –وضابط التضخم الكثير أن يبلغ ثلث مقدار الدين الآجل–، فإن وفاءَ الدين الآجل حينئذ بالمثل يُلحق ضرراً كثيراً بالدائن يجب رفعه. والحل لمعالجة ذلك: اللجوءُ إلى الصلح، وذلك باتفاق الطرفين على توزيع الفرق الناشئ عن التضخم بين المدين والدائن بأي نسبة يتراضيان عليها)[٣]. واتە: ئەگەر ڕێژەی هەڵاَیسان زۆر بوو – پێوەری هەڵاَیسانی زۆریش ئەوەیە کە بگاتە (٣/١)ی ڕێژەی قەرزەکە-گێڕانەوەی قەرز لەم حاڵەتەدا بەهەمان شێوە وڕێژەی خۆی زیانێکی زۆر لەخاوەن قەرزەکە دەدات وپێویستە لەسەری لاببرێت، چارەسەری ئەو حاڵەتەیش بەوە دەبێت قەرزار وخاوەن قەرز لەناو خۆیاندا ڕێکەون و بەڕەزامەندی هەردوو لا ئەو جیاوازییەی بە هۆی هەڵاَیسانەکەوە دروست بووە دابەشی کەن لەنێوانیاندا بە ڕێژەیەك کە هەردوو لا پێی ڕازی بن.

خۆ ئەگەر لایەنێکیان هەر ڕازی نەبوو ئەو کات دەکرێت پەنا ببرێتە بەر دادگا وحوکمی شەرع ولەو ڕێیەوە کەسی ناڕازی ناچار بکرێت لەسەر لە ئەستۆگرتنی بەشێك لە زیانەکە.

---

١ – دیاریکردنی ڕێژەی (٣/١) وەك بنەمایەك لەوەوە سەرچاوەی گرتوە کەشەرع لەزۆر بابەتدا ئەو ڕێژەیەی وەك هێڵی جیاکەرەوەی زۆری وکەمی دیاری کردوە، بۆ نموونە، لە وەسیەتدا شەرع ڕێگەی داوە کەسێك تا (٣/١) ی ماڵەکەی وەسیەت پێ بکات بەڵام زیاتر نا، وەبۆ هەڵسوکەوتی ئەو کەسانەیش کەلەنەخۆشی مردندان (مرض الموت) هەر بۆیان هەیە تا ئەو ڕێژەیە مامەڵە بەپارەکانیانەوە بکەن، بۆیە لێرەشدا زانایان ئەو ڕێژەیەیان داناوە.

٢ – خۆ ئەگەر هەردوو لا ڕازیبوون ئەوە ڕێژەی زیانەکە هەرچەند وهەرچۆن بێت ئاساییە.

٣ – مجمع الفقه الإسلامي، الندوة الفقهية الاقتصادية لدراسة قضايا التضخم، جدة، عام (١٤٢٠- ١٩٩٩م).

دووەم: ڕێکەوتن لەسەر گەڕاندنەوەی قەرز بە دراوێکی تر:

ئێمە پێشتر باسی ئەوەمان کرد کە هیچ کام لەخاوەن قەرز وکەسی قەرزار بۆیان نییە بەرامبەرەکەیان ناچار بکەن لەسەر دانەوەی قەرزەکە بەدراوێکی تر، بەڵام ئەگەر هەردووکیان بەڕەزامەندی خۆیان ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی کە قەرزەکە بەدراوێکی تر بدرێتەوە ئەو کات دروستە و هیچ کێشەی نابێت.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر فەرموودەیەکمان لەو بارەیەوە بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێت: (كُنْتُ أَبِيعُ الإِبِلَ بِالْبَقِيعِ، فَأَبِيعُ بِالدَّنَانِيرِ، وَآخُذُ الدَّرَاهِمَ، وَأَبِيعُ بِالدَّرَاهِمِ، وَآخُذُ الدَّنَانِيرَ، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ يُرِيدُ أَنْ يَدْخُلَ بَيْتَ حَفْصَةَ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي أَبِيعُ الإِبِلَ بِالْبَقِيعِ فَأَبِيعُ بِالدَّنَانِيرِ، وَآخُذُ الدَّرَاهِمَ، وَأَبِيعُ بِالدَّرَاهِمِ، وَآخُذُ الدَّنَانِيرَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ : {لا بَأْسَ أَنْ تَأْخُذَهَا بِسِعْرِ يَوْمِهَا، مَا لَمْ تَتَفَرَّقَا وَبَيْنَكُمَا شَيْءٌ..}[1]. واتە: من حوشترم دەفرۆشت لە بەقیع، هەندێك جار بەدینار دەمفرۆشت و دواتر درهەمم لەکڕیارەکە وەردەگرت، هەندێك جاریش بەپێچەوانەوە، بەدرهەم دەمفرۆشت و دواتر دینارم وەردەگرت[2]، چوومە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ دەیویست بڕواتەماڵی حەفصە پێم گوت: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ من لەبەقیع حوشتر دەفرۆشم، هەندێك جار بەدینار دەفرۆشم ودواتر درهەم وەردەگرم، جاری وایش هەیە بە درهەم دەفرۆشم ودواتر دینار وەردەگرم، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ئاساییە بەمەرجێك بەنرخی ئەو ڕۆژە دینار یان درهەمەکە بشکێنیتەوە کەوەری دەگریت، وەهەموو پارەکەیش وەربگریت وهیچ لەنێوانتاندا نەمێنێت.

ئەم فەرموودەیە بەڵگە وبنەمای  ئەم خاڵەیە کە ئێمە باسی دەکەین و بە چوار مەرج ڕێگە بەو جۆرە مامەڵەیە دەدات:

١- پێویستە هەردوولا (خاوەن قەرز وکەسی قەرزار) ڕازی بن بەوەی کە بەدراوێکی تر قەرزەکە بدرێتەوە و هیچ کامیان ئەوی تر ناچار نەکات لەسەر ئەم حاڵەتە.

٢- نابێت ئەو کاتەی کە قەرزەکەی دەداتێ یان شتەکەی پێ دەفرۆشێت لەسەر ئەوە ڕێبکەون کە دواتر بەدراوێکی تر قەرزەکەی لێ وەربگرێتەوە؛ چونکە دەبێت بەدوو مامەڵە:

---

١ - الإمام أحمد، المسند، ج٥، ص١١١، وقال الشيخ أحمد محمد  شاكر في تخريجه: إسناده صحيح.

٢ - دینار و درهەم دوو دراو بوون لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ کانزاکانیان جیاواز بووە، دینار ئاڵتون بووە ودرهەمیش زیو.

یەكەم فرۆشتن یان قەرز پێدان بەدراوێكی دیاری كراو، لەهەمان كاتیشدا فرۆشتنەوەی دراوەكە وگۆڕینەوەی بەدراوێكی تر كە ڕیكەوتون لەسەری، ولەكاتی ڕێكەوتنەكەدا ئامادە نییە؛ بۆیە ئەمە یەكسەر دەبێت بەسوو وحەرامە. بۆیە پێویستە ئەم ڕێكەوتنە ڕۆژی دانەوەی قەرزەكە بێت كەپارەكە ئامادەیە ویەكسەر قەرزارەكە دەیگێڕێتەوە بۆ خاوەن قەرزەكەی، نەك لەسەرەتاوە.

٣- پێویستە دراوەكە بەنرخی ئەو كاتە بشكێنرێتەوە كەقەرزەكەی تێدا دەدرێتەوە، نەك نرخی ئەو ڕۆژەی كە پارەكەی كەوتۆتە لا، بۆ نموونە: تۆ بڕی (٢٠٠$) كەوتە لای كەسێك، جا یان هەر لەسەرەتاوە بەقەرز پێت دا، یان شتێكت پێ فرۆشت بەقەرز، گریمان ئەو ڕۆژەی پارەكەی كەوتە لا (٢٠٠$) بەرامبەر (٢٥٠٠٠٠) هەزار دیناری عێراقی بوو، بەڵام ئەمرۆ كەرێكەوتون بەدینار قەرزەكەی لێ وەربگریتەوە، نرخی (٢٠٠$) بەرامبەر (٢٠٠٠٠٠) هەزار دینارە، كەواتە تۆ بۆت هەیە تەنها (٢٠٠٠٠٠) هەزاری لێوەربگریت، چونكە پێغەمبەری خودا ﷺ بە عەبدوڵلای فەرموو: {لا بَأْسَ أَنْ تَأْخُذَهَا بِسِعْرِ يَوْمِهَا}.

٤- دەبێت ئەو كاتەی ڕێدەكەون لەسەر شكاندنەوەی دراوی قەرزەكە بەدراوێكی تر، ئەو دراوەی تر ئامادەبێت ویەكسەر قەرزارەكە بیداتەوە بەخاوەن قەرزەكە، ئەگەر وانەكەن ئەویش دەبێت بەسوو وەكو باسمان كرد، بۆ نموونە ئەو بۆ ماوەی دوومانگ قەرزەكەی پێداوە یان شتەكەی پێ فرۆشتوە بەدۆلار، بەڵام دوای تێپەڕبوونی مانگێك ولەبەر ناجێگیری نرخی دۆلار ڕێدەكەون لەسەر گۆڕینەوەی بەدینار، لەكاتێكدا وادەی گێڕانەوەی قەرزەكە یەك مانگی ماوە وئێستا پارەكە ئامادە نییە، كەواتە ئەویش هەر سووە، یان تەلەفۆنی بۆ دەكات وپێك دێن لەسەر شكاندنەوەی نرخی دۆلارەكە ودەڵێت دوای نیوكاتژمێر یان دەخولەك یان پێنج خولەكی تر پارەكەت بۆ دەهێنم، ئەمانە هەمووی حەرامە و دەبێتە سوو، خۆ ئەگەر بیانەوێت مامەڵەكەیان شەرعی بێت ئەو كات پێویستە ئەو كاتەی دۆلارەكە دەشكێننەوە پارەی قەرزەكە ئامادەبێت و دەستبەجێ ڕادەستی خاوەن قەرزەكە بكرێت، ئەمەیش دەقی فەرموودەكەی پێغەمبەرە ﷺ كەفەرمووی: {مَا لَمْ تَتَفَرَّقَا وَبَيْنَكُمَا شَيْءٌ}.

دەشکرێت بۆ بەشێکی پارەکە ئەم ڕێکەوتنە ئەنجام بدرێت، بۆ نموونە کەسەکە ئێستا بەشێکی قەرزەکەی ئامادەیە ودەیەوێت بیداتەوە بەخاوەن قەرزەکەی، یان هەر لەبنەڕەتدا شتەکە بە گوژمە (قیست) بووە، ئەو کات بۆ گێرانەوەی هەر بەشێك یان پێدانەوەی هەر گوژمەیەك بەدراوێکی تر، دەبێت ڕەچاوی هەموو ئەو خاڵانە بکرێت کەباسمان کرد، واتا دەبێت بەرەزامەندی هەردوو لابێت[١]، وئەم ڕێکەوتنە تەنها بۆ ئەو بەشە یان گوژمەیە (قیست) بێت کە ئێستا کاتی دانەوەی هاتووە[٢] ودراوەکە بەنرخی ئێستا بشکێنرێتەوە وپارەکەیشی یەکسەر ئامادە بێت وبدرێتەوە خاوەن قەرزەکە[٣].

## سێیەم: لەکارکەوتنی دراوێکی یاسایی:

جاری وا هەیە حکومەت دراوێکی یاسایی هەیە وبۆ ماوەیەکی زۆر خەڵکی مامەڵە وقەرزیان پێکردوە، وپاش ماوەیەك حکومەت ئەوە دراوە هەڵدەوەشێنێتەوە وکاری پێ ناکات.

لەم حاڵەتەدا زانایان کۆڕان لەسەر ئەوەی کە ناکرێت کەسی قەرزار بەپارە کۆنەکە قەرزەکە بگێڕێتەوە؛ چونکە پارە کۆنەکە ئێستا تەنها کاغەزە وهیچ هەبوو (رصيد) ی نییە، وبەدراو ئەژمار ناکرێت.

کەواتە دەبێت بەها ونرخی قەرزەکە بگێڕێتەوە بەدراوێکی تر کە ئێستادا هەبووی هەیە و دراوە و مامەڵەی پێوە دەکرێت؛ چونکە ئەمە حاڵەتی ناچارییە وئەگەر وانەکەین قەرزی خاوەن قەرزەکان لەبنەڕەت دەفەوتێت.

---

١ - چونکە لەوانەیە قەرزارەکە یان خاوەن قەرزەکە بۆ گوژمەیەك یان دووان ڕازی بێت، بەڵام بۆ گوژمەکانی تر ڕازی نەبێت، ئەوکات دروست نییە ناچار بکرێت.

٢ - کەواتە ئەم ڕێکەوتنە بۆ گوژمەی مانگەکانی داهاتوو ناکرێت وحەرامە.

٣ - لەیەکێك لەبڕیارەکانی کۆمکاری فیقهی ئیسلامیدا هاتووە: (يجوز أن يتفق الدائن والمدين يوم السداد - لا قبله - على أداء الدين بعملة مغايرة لعملة الدين، إذا كان ذلك بسعر صرفها يوم السداد، وكذلك يجوز في الدين على أقساط بعملة معينة الاتفاق يوم سداد أي قسط على أدائه كاملا بعملة مغايرة بسعر صرفها في ذلك اليوم، ويشترط في جميع الأحوال أن لا يبقى في ذمة المدين شيء مما تمت عليه المصارفة في الذمة). مجمع الفقه الإسلامي الدولي المنبثق عن منظمة المؤتمر الإسلامي، الدورة الثانية عشرة بالرياض، من ٢٥ جمادى الآخرة ١٤٢١هـ - ١ رجب ١٤٢١هـ ، الموافق ٢٣ — ٢٨ أيلول ( سبتمبر ) ٢٠٠٠ م.

بەڵام لێرەدا پرسیارێکی تر دێتە ئاراوە، ئەویش ئەوەیە کە نرخی پارەی قەرزەکە بەچ کاتێك دەخەمڵێنرێت؟ لێرەدا سێ بۆچوونمان هەیە:

بۆچوونی یەکەم: نرخی دراوەکە بەو کاتە دەخەمڵێنرێت کە دراوە بەقەرز.

بۆچوونی دووەم: نرخی دراوەکە بەو کاتە دەخەمڵێنرێت کە تێیدا هەڵوەشێنراوەتەوە.

بۆچوونی سێیەم: نرخی دراوەکە بەو کاتە دەخەمڵێنرێت کە وادەی قەرزەکە تەواو دەبێت، وپارەی قەرزەکە دەدەینەوە خاوەنەکەی.

بۆ نموونە: ئەگەر ئێمە بڕی (٥٠٠$) دا بەکەسێك بەقەرز بۆ ماوەی شەش مانگ، ئەو کاتەی قەرزەکەمان دا بەکەسەکە بەهای (٥٠٠$) بەرامبەر (٦٠٠٠٠٠) هەزار دیناری عێراقی بوو، دوای سێ مانگ ئەمریکا دۆلاری هەڵوەشاندەوە، ئەو کاتەی بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی دۆلار دەرچوو، نرخی (٥٠٠$) بەرامبەر (٧٥٠٠٠٠) هەزار دیناری عێراقی بوو، کاتێك شەش مانگەکە تەواو بوو، کە دەبێت قەرزەکەی تیا بگێڕینەوە نرخی (٥٠٠$) بەرامبەر (٩٠٠٠٠٠) هەزار دیناری عێراقی بوو.

ئێستا کەسی قەرزدار چەند دەگێڕێتەوە؟.

بەپێی بۆچوونی یەکەم (٦٠٠٠٠٠) هەزار دیناری عێراقی دەگێڕێتەوە، بەپێی بۆچوونی دووەم (٧٥٠٠٠٠) هەزار دیناری عێراقی دەگێڕیتەوە، بەپێی بۆچوونی سێیەم (٩٠٠٠٠٠) هەزار دیناری عێراقی دەگێڕێتەوە.

بۆچوونی پەسەندیش بۆچوونی دووەمیانە، وکەسی قەرزار بڕی (٧٥٠٠٠٠) هەزار دیناری عێراقی دەداتەوە خاوەن قەرزەکە، وشێخ عوسەیمینیش پشتگیری ئەم بۆچوونە دەکات وپێی وایە بەکاتی هەڵوەشاندنەوەی دراوەکە قەرزەکە دەخەمڵێنرێنت ولێی وەردەگیرێتەوە؛ چونکە ئەگەر پێش ساتێك لەوکاتەی کە دراوەکەی تێدا هەڵوەشاوەتەوە، دراوەکەمان بگێڕایەتەوە هەمان ڕێژەی دراوی قەرزەکەمان دەگێڕایەوە، کەواتە تا دواساتی کارا بوونی دراوەکە نرخی چەند بووە بەو نرخە دەیخەمڵێنین[١].

١ - محمد بن صالح بن عثيمين، الشرح الممتع على زاد المستقنع، ج٩، ط١، دار إبن الجوزي، ١٤٢٢، ص١٠٤.

**چوارەم: حوکمی کڕین‌و فرۆشتن بەقەرز وبە گوژمە (البيع بالتقسيط) بەپارەی زیاتر:**

کڕین‌و فرۆشتن بەگوژمە (قسط) یەکێکە لەو جۆرە مامەڵانەی کە لە ئێستادا زۆر باوە لەناو خەڵکیدا وزۆربەی کۆمپانیا وپێشانگا ودامەزراوە داراییەکان ودەزگاکانی وەبەرهێنان کاری پێدەکەن.

زۆربەی زۆری زانایانیش بەپێشەوایانی هەرچوار مەزهەبەیکشەوە بۆچوونیان وایە کە ئەم جۆرە مامەڵەیە لەڕووی شەرعییەوە دروستە وهیچ گرفتێکی نییە، ئەگەرچی نرخی کاڵاکە بەقەرز زیاتریش بێت لە نرخی حازر، تەنانەت ئیبن حەجری عەسقەلانی لە (فتح الباری) دا کۆدەنگی زایانی لەسەر دروستی ئەو بابەتە باس دەکات[١] و جگە لە ظاهیرییەکان لەکۆندا و ئەلبانی لەزانایانی هاوچەرخدا کەس نەیگوتوە حەرامە و دروست نییە.

بۆچوونی پەسەندیش ئەوەیە کە کڕین‌و فرۆشتن بەگوژمە (قسط) دروستە وهیچ گرفتی نییە، وچەندین بەڵگەیی شەرعیش لەو ڕووەوە لەبەردەستدایە لەوانە:

١- خاتوو عائیشە ڕەزای خوای لێبێت دەڵێت: {أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ اشْتَرَى مِنْ يَهُودِيّ طَعَامًا بِنَسِيئَةٍ، وَرَهَنَه دِرْعَهُ}[٢]. واتە: پێغەمبەری خودا ﷺ خواردنی لە یەهودیەك كڕی بە قەرز، وقەڵغانەکەی خۆی وەك بارمتە لا دانا.

٢- خاتوو عائیشە ڕەزای خوای لێبێت دەیگێڕێتەوە دەڵێت: {جَاءَتْنِي بَرِيرَةُ قَالَتْ: إِنِّي كَاتَبْتُ أَهْلِي عَلَى تِسْعِ أَوَاقٍ فِي كُلِّ عَامٍ أُوقِيَّةٌ}[٣]. واتە: بەریرە هات بۆ لام وپێی گوتم: من خۆم لەخاوەنەکەم کڕیوەتەوە[٤] بە نۆ ئۆقییە[٥]، و وا ڕێك کەوتوین لەهەر ساڵێکدا

---

١ - إبن حجر العسقلاني (أحمد بن علي)- فتح الباري شرح صحيح البخاري، ج٤، دار المعرفة/ بيروت، ط١٣٧٩، ص٣٠٢. ص٣٠٢.

٢ - البخاري، صحيح البخاري، ج٣، رقم الحديث (٢٠٩٦)، ص٦٢. مسلم، صحيح مسلم، ج٣، رقم الحديث (١٦٠٣)، ص١٢٢٦. واللفظ للبخاري.

٣ - البخاري، صحيح البخاري، ج٣،ص١٩٢، رقم الحديث (٢٧٢٩). مسلم، صحيح مسلم، ج٢،ص١١٤١، رقم الحديث (١٥٠٤).

٤ - کاتی خۆی لەسیستەمی کۆیلایەتیدا کۆیلەکان بۆیان هەبوو خۆیان لە خاوەنەکانیان بکڕنەوە لەبەرامبەر بڕە پارەیەکدا کەدواتر بەگوژمە دەیانداپەوە بەخاوەنەکانیان، بەمەیش لەزمانی عەرەبیدا دەگوترا (عقد المکاتبة).

٥ - ئۆقیە: چل درهەمی زیوو بووە لەکاتی خۆیدا، ونۆ ئۆقیەکە دەکاتە (٣٦٠) درهەمی زیو.

ئۆقییەیەکیان پێ بدەم. دیارە پێغەمبەری خودایش ﷺ ئاگاداری مامەڵەکە بووە، وئینکاریشی نەکردوە، خۆ ئەگەر ناشەرعییەکی تێدا بوایە بێگومان لێی بێدەنگ نەدەبوو.

٣- بەڵگەیەکی تری زانایان لەسەر دروستی ئەم مامەڵەیە قیاس کردنێتی لەسەر فرۆشتنی سەلەم[١]، لە سەلەمدا پارەکە ئامادەیە وکاڵاکە ئامادە نییە ودواتر تەسلیم دەکرێت؛ لەکڕینو فرۆشتنی بەگوژمەدا کاڵاکە ئامادەیە، وپارەکە دواتر تەسلیم دەکرێت، کەواتە ئەگەر سەلەم دروست بێت، پێچەوانەی سەلەمیش کە قیستە دروستە.

سەبارەت بە فەتوای زانایانی هاوچەرخیش لەو بارەیەوە:

کۆمکاری فیقهی ئیسلامی لەوبارەیەوە دەڵێت: (تجوز الزيادة في الثمن المؤجل عن الثمن الحال، كما يجوز ذكر ثمن المبيع نقداً وثمنه بالأقساط لمدد معلومة)[٢]. واتە: دروستە نرخی کاڵا بەقەرز زیاتر بێت لەنرخی حازر، هەروەها دروستیشە نرخی کاڵایەك بەپارەی حازر و بەپارەی قەرزیش بەچەند گوژمەیەك لەچەند کاتێکی زانراودا دیاری بکرێت.

لیژنەی هەمیشەیی توێژینەوەی زانستی وفەتوای سعودیش لەو بارەیەوە دەڵێت: (شراء شخص من آخر سيارة لأجل بثمن أكثر مما تباع به نقدًا عاجلا؛ ليبيعها المشتري إلى من شاء سوى من باعها عليه ومن في حكمه، فليس ربا بل هو عقد بين صحيح وجائز)[٣]. واتە: کەسێك ئۆتۆمبێلێك لەکەسێکی تر بەقەرز وبەنرخێکی زیاتر لەوەی کە بەحازر پێی دەفرۆشرێت بکڕێت، بۆ ئەوەی دواتر بیفرۆشێتەوە بەحازر بە کەسێکی تر جگە لەو کەسەی کەپێی فرۆشتوە یان وەکو ئەو وایە[٤]، نابێت بەسوو بەڵکو گرێبەستێکی دروست وڕێگە پێدراوە.

---

١ - فرۆشتنی سەلەم بریتییە لەوەی کە کەسێك شتێکی دیاریکراوی زانراو لەکەسێکی تر دەکڕێت بە پارەیەکی حازر، حازر، بەڵام کەسی فرۆشیار پاش ماوەیەکی تر فرۆشراوەکەی پێدەدات، بۆ نموونە: تۆ بیست تەن گەنم لەجوتیارێك دەکڕیت بۆ کاتی دروێنە بەنرخێکی کەمتر لەو نرخەی ئێستای لەبازاڕدا، بەڵام کابرای جووتیار مانگی حەوت گەنمەکە ڕادەستی تۆ دەکات، ئەم مامەڵەیە دروستە وهیچ گرفتێکی شەرعی نییە، وکاتێك کە پێغەمبەر ﷺ تەشریفی بردە مەدینە، خەڵکی ئەم جۆرە بازرگانییەیان دەکرد، ئەویش ڕێگیری لێ نەکردن، بەڵام پێی فەرموون: {مَنْ أَسْلَفَ فِي شَيْءٍ فَفِي كَيْلٍ مَعْلُومٍ وَوَزْنٍ مَعْلُومٍ إِلَى أَجَلٍ مَعْلُومٍ}. واتە: هەرکەسێك بەسەلەم شتی کڕی، باپێوانە وکێشانە وکاتی تەسلیم کردنەکەیشی دیاریکراو بێت. البخاري، صحيح البخاري، ج٣، رقم الحديث (٢٢٤٠)، ص٨٥.

٢ - مجمع الفقه الإسلامي في دورة مؤتمره السادس بجدة من ١٧- ٢٣ شعبان ١٤١٠ هـ الموافق ١٤ - ٢٠ آذار ١٩٩٠م.

٣ - مجلة البحوث الإسلامية، ع ١٨، فتاوى اللجنة الدائمة، ص٨٠، فتوى رقم ١٦٣٨ ، بتاريخ ٧/ ٨ /١٣٩٧ هـ.

٤ - مەبەست لەو مەرجە ئەوەیە کەنابێت کەسێك شتێك لەکەسێکی تر بەقەرز بکڕێت بەپارەیەکی زیاتر ودواتر بەنرخێکی کەمتر وبەحازر بیفرۆشێتەوە بەهەمان ئەو کەسەی کەلێی کڕیوە، یان شەریکێکی، یان هەرکەسێکی تر کەئەو ڕایسپاردبێت؛ چونکە ئەوە وەکو فێڵێکی لێدێت بۆ سووخۆری ودروست نییە.

ئیبن بازیش لە لەفەتوایەکیدا دەڵێت: (البيع إلى أجل معلوم جائز إذا اشتمل البيع على الشروط المعتبرة، وهكذا التقسيط في الثمن لا حرج فيه إذا كانت الأقساط معروفة والآجال معلومة)[١]. واتە: فرۆشتن بەقەرز بۆ ماوەیەکی دیاریکراو دروستە، ئەگەر فرۆشتنەکە مەرجە شەرعییەکانی تێدا بێت، هەروەها ئەگەر نرخەکەیشی بکرێت بەچەند گۆژمەیك هیچ کێشەی نییە، بەمەرجێك بڕی گۆژمەکان وکاتەکانی دانەوەی دیاریکراو بێت.

دەربارەی بۆچوونی ئەو کەسانەیش کە ئەم جۆرە مامەڵەیەیان پێ شەرعیی نییە دەڵێت: بۆچوونەکەیان هیچ سەنگێکی نییە ولەوەڵامی پرسیارێکدا لەو بارەیەوە دەڵێت: (فقد سئلت عن حكم بيع كيس السكر ونحوه بمبلغ مائة وخمسين ريالا إلى أجل وهو يساوي مبلغ مائة ريال نقدا؟). واتە: پرسیاریان لێکردم دەربارەی حوکمی فرۆشتنی فەردەیەك شەکر یان هەر شتێکی تر بە سەدوپەنجا ڕیاڵ بە قەرز لەکاتێکدا نرخی خۆی بەحازر تەنها سەد ڕیاڵە.

لە وەڵامدا گوتم: (هذه المعاملة لا بأس بها؛ لأن بيع النقد غير بيع التأجيل، ولم يزل المسلمون يستعملون مثل هذه المعاملة، وهو كالإجماع منهم على جوازها، وقد شذ بعض أهل العلم فمنع الزيادة لأجل الأجل، وظن ذلك من الربا وهو قول لا وجه له، وليس من الربا في شيء...وقد ثبت عن النبي ﷺ ما يدل على جواز ذلك)[٢]. واتە: ئەم مامەڵەیە هیچ کێشەی نییە؛ چونکە فرۆشتن بەقەرز وەك فرۆشتن بە حازر نییە و هەر لە کۆنەوە موسوڵمانان ئەم جۆرە مامەڵەیەیان کردوە و وەك کۆدەنگی لێهاتوە لە نێوانیاندا، هەرچەندە کەمینەیەك لە زانایان گوتویانە نا بێت نرخی کاڵاکە لەبەرامبەر درێژکردنەوەی ماوەی دانەوەیدا زیاتر بێت و وا تێگەیشتون کە ئەوە سووە؛ بەڵام ئەم قسەیە هیچ بەڵگەیەکی نییە و ئەو بابەتەیش هیچ پەیوەندی بەسووەوە نییە و بەڵگەیش لە بەردەستدایە کە پێغەمبەری خودا ﷺ ڕێگەی بەو جۆرە مامەڵەیە داوە.

بۆیە ئاساییە کەسێك لەبری ئەوەی دەڕوات پارە بەسوو وەردەگرێت بەبیانووی ناچارییەوە، دەتوانێت لەم ڕێگەیەوە دەسمایە بەدەستبێنێت وبازرگانی پێوە بکات:

---

١ - مجلة البحوث الإسلامية، ع١٩، فتاوى ابن باز، س٨، ص١٤.

٢ - عبد العزيز بن باز، مجموع فتاوى ومقالات ابن باز، ج١٩، الرئاسة العامة للبحوث العلمية والإفتاء، ص٤٩.

بۆ نموونە: خاوەن کۆمپانیایەك کەدەیەوێت دەسمایەی دەستبکەوێت، دەتوانێت بڕوات چەند ئۆتۆمبێلێك بەگوژمە (قسط) لە پێشانگەیەکی ئۆتۆمبێل ڕابکێشێت ودواتر بە پارەیەکی کەمتر بەحازر بیفرۆشێتەوە، بەڵام بەو کەسە نا کەلێی کڕیوە، بەوەیش دەبێتە خاوەنی دەسمایە وناچار نابێت پارە بەسوو وەربگرێت وزانایانیش بەم شێوازە مامەڵەیە دەڵێن (تورق).

پێنجەم: مەرجەکانی کڕینو فرۆشتن بەقەرز و بە گوژمە:

لەخاڵی پێشوودا باسی ئەوەمان کرد کە کڕین وفرۆشتن بەقەرز وبەگوژمە دروستە، بەڵام کۆمەڵێك مەرج هەیە پێویستە لایەنەکان ئاگاداری بن، ئەوانیش بریتین لە:

١- نابێت کڕینو فرۆشتنەکە لەنێوان دوو شتدا بێت کە سوویان تێدا دروست دەبێت وەکو ئاڵتون وزیو ودراو، بەهەموو جۆرەکانیانەوە؛ چونکە حەرامە ئەم جۆرە شتانە مامەڵەیان لەگەڵ یەکتر پێبکرێت بەقەرز، هەروەها گەنم وجۆ ودانەوێڵەکانی تر هەمان حوکمیان هەیە ونابێت کڕین وفرۆشتنیان بەیەك پێبکرێت بەقەرز، واتە گەنم بەجۆ، یان بە برنج، یان بەپێچەوانەوە؛ بەڵام کڕینی گەنم بە ئاڵتون، یان گەنم بە هەر دراوێك بەقەرز وبەگوژمە دروستە؛ چونکە ڕەگەزی گەنم لەگەڵ ئەوان جیاوازە.

جگە لەوانە کە سوویان تێدا دروست دەبێت فرۆشتنی کەلو پەلی ناوماڵ، وئۆتۆمبێل، وخانوو، وزەوی وزار، وکەرەسەی بیناسازی، ئەمانە هەموویان دروستە بەحازر وبە بەقیست کڕین وفرۆشتنیان پێوە بکرێت، وسوویان تێدا دروست نابێت.

٢- ئەبێت شێوازی مامەڵەکە ڕوون ودیار بێت، بۆ نموونە: ئەگەر گوتمان ئەو ئۆتۆمبێلە بەحازر بە (١٢٠٠٠$) و بەقیست (١٢٥٠٠$) پێویستە ئەوە دیاری بکەین بەکام نرخەیان ڕێدەکەوین، بەحازر یان بەقەرز؛ بەڵام ئەگەر کابرا گوتی قبوڵم کرد بەبێ ئەوەی ڕوونی بکاتەوە بەکام نرخەیان قبوڵی کردوە ئەوە دروست نییە؛ چونکە لە فەرموودەیەکدا هاتوە کە پێغەمبەری خودا ﷺ: {نَهَى عَنْ بَيْعَتَيْنِ فِي بَيْعَةٍ}[١]. واتە: پێغەمبەر ﷺ نەهی

---

١ - النسائي (أحمد بن شعيب)، سنن النسائي الكبرى، ج٤، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤١١،١٩٩١، ص٤٣، رقم الحديث الحديث (٦٢٢٨)، تحقيق : د.عبد الغفار سليمان البنداري ، سيد كسروي حسن. وحسنه الألباني في: إرواء الغليل، ج٥،ص١٥٩.

کردووە لە دوو مامەڵە لەیەك گرێبەستدا. زانایانیش دەفەرموون یەکێك لە مەبەستەکانی فەرمووده‌کە ئەوەیە: کە فرۆشیارەکە بڵێت: بە حازر بەوەندە وبەقەرز بەوەندە ودواتر یەکلای نەکەنەوە لەگەڵ کڕیارەکە لەسەر کام نرخەیان ڕێکەوتوون.

٣- پێویستە ماوەی قەرزەکە و بڕی گوژمەکان وکاتی دانەوەیان دیاری کراوبێت. هەر وەك پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: {فَلْيُسْلِفْ فِي كَيْلٍ مَعْلُومٍ، وَوَزْنٍ مَعْلُومٍ، إِلَى أَجَلٍ مَعْلُومٍ}[١].

٤- نابێت گرێبەستەکە مەرجی ئەوەی تێدا بێت، ئەگەر کڕیار لە دانەوەی قیستەکان دوا کەوت زیادەی بچێتە سەر، وەئەمە بنەمایەکی سەرەکییە بۆ دروستی هەموو جۆرەکانی قەرز وزانایان کۆدەنگن لەسەری[٢]، ودەڵێن: هەر قەرزێك لەژێر هەر ناوێکدا بێت ئەگەر ئەو مەرجەی تێدا بوو کە لەکاتی دواکەوتنی دانەوەیدا زیادەی بچێتە سەر، ئەو زیادەیە دەبێتە سوو وحەرام دەبێت؛ چونکە بەداخەوە زۆربەی کۆمپانیاکانی وەبەرهێنان لە ئێستادا ئەو مەرجە لەسەر کڕیار و بەشداربووەکانیان دادەنێن وبەو هۆیەیشەوە گرێبەستکردن لەگەڵیان حەرامە.

ڕاستە ئەوان بەمەبستی ئەوە ئەو مەرجە دادەنێن کە کڕیارەکان ناچار بکەن لەکاتی خۆیادا قیستەکان بگێڕنەوە؛ بەڵام ئەوان بۆ ئەو مەبەستە پێویستە ڕێگەچارەی شەرعی تر بگرنە بەر وەکو وەرگرتنی کەفیلی مووچەخۆر، وبارمتە (رهن)، وکۆمبیالە ، وزۆر ڕێگەی شەرعی تر[٣]، نەك دانانی سوو.

٥- نابێت ئەو زیادەیەی دەچێتە سەر نرخی کاڵاکە بەقیست لە کۆی نرخەکەی جیابکرێتەوە: بۆ نموونە: ئەگەر گوتمان ئەم ئۆتۆمبێلە نرخەکەی (١٠٠٠٠$) دۆلارە بەحازر وبۆ هەر ساڵێك قیست ڕێژەی (١٠٪)دەچێتە سەر، واتە ئەگەر کڕیار بەقیستی یەکساڵ کڕی

---

١ - البخاري، صحيح البخاري، ج٣،ص٨٥، رقم الحديث (٢٢٣٩)، مصدر سابق. مسلم، صحيح مسلم، ج٥،ص٥٥، مصدر سابق. واللفظ لمسلم.

٢ - لەبەر گرنگی ئەم خاڵە، لەبەشی داهاتوو ولەبابەتێکی سەربەخۆدا قسەی لەسەر دەکەین.

٣ - بۆ نموونە کۆمپانیا دەتوانێت مەرجی ئەوە دابنێت کەئەگەر کڕیارەکە لەدانەوەی قیستێك یان دوان دواکەوت،وکێشەی دروست کرد، ئەو کات کۆمپانیا مامەڵەی قیستەکان هەڵدەوەشێنێتەوە ویەکسەر بەیەك گوژمە هەموو پارەکەی لێ وەردەگرێت؛ یان کاڵاکەی لێ وەردەگرێتەوە و دەیفرۆشێت بە کەسێکی تر؛ یان هەر سزایەکی تر؛ بەڵام بەبێ ئەوەی زیادە بخاتە سەر ڕێژەی قەرزەکە.

ئەوە بڕی (١٠٪)ی دەچێتە سەر، خۆ ئەگەر بەقیستی دووساڵ کڕی ئەوە دەبێت بە (٢٠٪) وئەگەر بۆ سێ ساڵ بوو دەبێت بە (٣٠٪) ئەم مامەڵەیە بەم شێوازە حەرامە ودروست نییە، وبەداخەوە زۆربەی بانك وكۆمپانیاكانیش ئەم شێوازە پەیڕەو دەكەن.

شێوازی دروست بۆ ئەم حاڵەتە ئەوەیە ڕێژەی زیادەی گۆژمەكان لەكۆی نرخی كاڵاكە جیا نەكرێتەوە ووەك یەك نرخ بگوترێت. بۆنموونە: ئەو ئۆتۆمبێلە بەحازر بە (١٠٠٠٠$) وبەقیستی ساڵێك بە (١١٠٠٠$) وبەقیستی دووساڵ بە (١٢٠٠٠$) وبەم شێویەیە.

كۆمكاری فیقهی ئیسلامی دەربارەی ئەم مەرجە دەڵێن: (لا يجوز شرعاً في بيع الأجل، التنصيص في العقد على فوائد التقسيط مفصولة عن الثمن الحال، بحيث ترتبط بالأجل...). واتە: لەكاتی فرۆشتن بەقەرزدا، دروست نییە ئەو سوود وزیادەیەی دەچێتە سەر قیستەكان جیا بكرێتەوە لەنرخی كاڵاكە بەحازر، بەشێوازێك - كە ئەو زیادانە - وابەستەی كاتەكە بكرێن[1].

---

١ - زۆربەی ئەو مەرجانەی كە باسمان كرد، بەم بڕگەیەشەوە بەشێكن لەفەتوایەكی گشتگیری كۆمكاری فیقهی ئیسلامی دەربارەی كڕین وفرۆشتن بەقیست كە ئەمە دەقەكەیەتی: إن مجلس مجمع الفقه الإسلامي المنعقد في دورة مؤتمره السادس بجدة في المملكة العربية السعودية من ١٧- ٢٣ شعبان ١٤١٠ هـ الموافق ١٤ - ٢٠ آذار (مارس) ١٩٩٠م، بعد اطلاعه على البحوث الواردة إلى المجمع بخصوص موضوع البيع بالتقسيط، واستماعه للمناقشات التي دارت حوله، قرر ما يلي:

(أولا: تجوز الزيادة في الثمن المؤجل عن الثمن الحال، كما يجوز ذكر ثمن المبيع نقدا، وثمنه بالأقساط لمدد معلومة، ولا يصح البيع إلا إذا جزم العاقدان بالنقد أو التأجيل. فإن وقع البيع مع التردد بين النقد والتأجيل بأن لم يحصل الاتفاق الجازم على ثمن واحد محدد، فهو غير جائز شرعا.

ثانيا: لا يجوز شرعا، في بيع الأجل، التنصيص في العقد على فوائد التقسيط، مفصولة عن الثمن الحال، بحيث ترتبط بالأجل، سواء اتفق العاقدان على نسبة الفائدة أم ربطاها بالفائدة السائدة.

ثالثا: إذا تأخر المشتري المدين في دفع الأقساط عن الموعد المحدد فلا يجوز إلزامه أي زيادة على الدين بشرط سابق أو بدون شرط، لأن ذلك ربا محرم.

رابعا: يحرم على المدين المليء أن يماطل في أداء ما حل من الأقساط، ومع ذلك لا يجوز شرعا اشتراط التعويض في حالة التأخر عن الأداء.

خامسا: يجوز شرعا أن يشترط البائع بالأجل حلول الأقساط قبل مواعيدها، عند تأخر المدين عن أداء بعضها، ما دام المدين قد رضي بهذا الشرط عند التعاقد.

سادسا: لا حق للبائع في الاحتفاظ بملكية المبيع بعد البيع، ولكن يجوز للبائع أن يشترط على المشتري رهن المبيع عنده لضمان حقه في استيفاء الأقساط المؤجلة).

# بەشی پێنج[1]
# زیادخستنە سەر قەرز وقەرزەکانی حکومەت

تەوەرەکانی ئەم بەشە بریتین لە:

یەکەم: وەرگرتنەوەی خەرجییەکانی قەرز.

دووەم: زیادخستنە سەر قەرز لە ئەگەری دواکەوتنی گەڕانەوەیدا.

سێیەم: وەرگرتنەوەی قەرەبووی زیانەکانی قەرز.

چوارەم: حوکمی ئەو گرێبەستانەی کە سوویان تێدایە.

پێنجەم: قەرزەکانی حکومەت وگرفتە شەرعییەکانی.

## یەکەم: وەرگرتنەوەی خەرجییەکانی قەرز:

هەر قەرزێك خەرجی هەبێت وئەرکی دارایی بۆ خاوەنی قەرزەکە دروست بکات، خاوەنی قەرزەکە بۆی هەیە ئەو خەرجییانەی قەرزەکەی لەلایەنی قەرزار وەربگرێتەوە، بۆنموونە: بانك یان هەر دامەزراوەیەکی دارایی تر کە قەرز بەخەڵکی دەدەن، بە سەدەها کارمەند کاریان تێدا دەکەن وبەڕێوەبردنیان دەیەها جۆر خەرجی دەوێت، هەر لە مووچەی کارمەند وپارەی ئاو وکارەبا وبینا وکەرەسەکانی بەکارهێنان وتادوایی. هەموو ئەمانە ئەرکی دارایی لەسەر ئەو جۆرە دامەزراوانە دروست دەکەن، وئەگەر ئەمان تێچووی ئەو پارانە نەخەنەوە سەر بڕی قەرزەکان وئەستۆی قەرزارەکان، ئەوە ناتوانن لەکارەکانیان بەردەوام بن؛ بۆیە بۆیان هەیە تێچووی قەرزەکانیان بخەنە سەر کۆی ئەو دەستمایانەیان کە دەیدەن بەقەرز بەڕێژەیەکی دیاری کراو، بۆنموونە: ئەگەر تێچووی بەکاربردنی بڕی هەر (١٠٠٠٠$) یێك بۆ ماوەی ساڵێك (٦٠$) بێت، ئەوە لایەنی قەرزدەر دەتوانێت بۆ هەر مانگێکی پێدانی ئەو بڕە پارەیە بەقەرز (٥$) زیادە لەقەرزارەکە وەربگرێتەوە، بەڵام بۆی نییە یەك سەنت زیاتر لەتێچووە ڕاستەقینەکەی وەربگرێت؛ چونکە بەداخەوە ئێستا زۆرێك لەو دامەزراوە دارایی وکۆمپانیایانە بەناوی خەرجییەوە سوو دەخەنە سەر قەرزەکانیان ووادەزانن بەوە

---

[1] - ئەم بەشە ڕۆژی (٢٠١٤/١٢/٢٧) تۆمار کرا.

حەڵاڵ دەبێت، ئەمانە هەمووی حەرامن وگۆڕینی ناو لەشەرعدا حوکمی ناوەڕۆك ناگۆڕێت، ئەمە هەرگیز شەرع چاوپۆشی لێناکات وسوو هەر سووە لەژێر هەر ناوێکدا بێت. کۆمکاری فیقهی ئیسلامی لەو بارەیەوە دەڵێت: (إذا دعت الحاجة إلى تحصيل نفقات لتقديم عمليات القروض ومتابعتها، وجب أن يقتصر فيها على التكاليف الفعلية لعملية القرض)[1]. واتە: ئەگەر پێدانی قەرز وبەدواداچوونی خەرجی هەبوو، و وەوای دەخواست کە ئەو خەرجییانە وەربگیرێتەوە، ئەوە پێویستە تەنها ئەو برە تێچووە وەربگیرێتەوە کە بە فیعلی بۆ قەرزەکە خەرج کراوە- وهیچ زیادەی نەبێت-.

جگە لەم حاڵەتە خاوەن قەرز بۆی نییە لەژێر هیچ ناوێکی تردا زیادە بخاتە سەر بڕی قەرزەکەی.

دووەم: زیادخستنە سەر قەرز لە ئەگەری دواکەوتنی گەڕانەوەیدا:

هەر چەندە لەبەشی ڕابوردودا ولەمەرجەکانی کڕین وفرۆشتن بەقیست ئاماژەیەکی کورتمان بەم خاڵە کرد وگوتمان بەهیچ شێوازێك دروست نییە لایەنی قەرزدەر مەرجی ئەوە لەسەر لایەنی قەرزار دابنێت، کە ئەگەر پابەند نەبوو بەگێڕانەوەی قەرزەکە لەکاتی خۆیدا ئەوە زیاد دەخاتە سەر قەرزەکەی، وەگوتمان ئەمە سوویەکی ئاشکرایە[2]، وزانایان بەکۆی دەنگ پێیان وایە دانانی ئەم جۆرە مەرجانە بەهەر بیانوو پاساوێك بێت حەرامە، وهەر گرێبەستێکیش ئەو مەرجەی تێدا بێت دروست نییە مرۆڤی باوەڕدار ئەنجامی بدات وپێوەی پابەند بێت.

ئەمانەیش بەشێکن لەبۆچوون و قسەکانیان لەو بارەیەوە:

- حەنەفییەکان لەو بارەیەوە دەڵێن: (ولا خلاف أنه لو كان عليه ألف درهم حالة، فقال: أجلني أزيدك فيها مائة درهم لا يجوز)[3]. واتە: زانایان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی ئەگەر کەسێك

---

١ - قرار رقم: (٥٠١/ ٦) بشأن التمويل العقاري لبناء المساكن وشرائها. مجمع الفقه الإسلامي التابع لنظمة المؤتمر الإسلامي، المنعقد في دورة مؤتمره السادس بجدة من ١٧- ٢٣ شعبان ١٤١٠ هـ الموافق ١٤ — ٢٠ آذار (مارس) ١٩٩٠م، مجلة المجمع، ع٥، ج٤، ص٢٧٧٣.

٢ - کاتی خۆی بێباوەڕان لەو ڕێگەیەوە هەژارانیان دەچەوساندەوە ودەیانکردنە کۆیلەی خۆیان، هەر بۆیە بەشێکی زۆری ئایەتەکانی قورئان کە دەربارەی سوو هاتونە خوارەوە، بۆ بنەبڕکردنی ئەم جۆرە سووە بوو.

٣ - الجصاص (أحمد بن علي الرازي)، أحكام القرآن، ج٣، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤١٥،١٩٩٤، ص١٢٤.

هەزار دینار قەرزار بوو، وەکاتی دانەوەی قەرزەکەی هاتبوو، بەخاوەن قەرزەکەی گوت: ماوەی قەرزەکەم بۆ درێژ بکەرەوە سەد درهەمی زیاترت ئەدەمێ، ئەوە دروست نییە و حەرامە.

- مالیکییەکان دەڵێن: (أجمع العلماء من السلف والخلف على أن الربا الذي نزل بالقرآن تحريمه هو: أن يأخذ الدائن لتأخير دينه بعد حلوله عوضاً عينياً أو عرضاً)[١]. واتە: زانایان لەکۆن ونوێدا کۆدەنگن لەسەر ئەوەی ئەو سوووەی قورئان لەسەر قەدەغەکردن و یاساغکردنی هاتە خوارەوە ئەوەبوو: کە خاوەن قەرز لەبری دواکەوتنی وەرگرتنەوەی قەرزەکەی شتێك وەربگرێت پارە بێت یان شت وەمەك. وە دەڵێن: (إذا التزم المدعى عليه (المدين) للمدعي: أنه إذا لم يوفه حقه في كذا فله عليه كذا وكذا، فهذا لا يختلف في بطلانه، لأنه صريح الربا)[٢]. واتە: ئەگەر کەسی داوالێکراو (قەرزار) چووە ژێر باری ئەوەی ئەگەر لەکاتی خۆیدا قەرزەکەی نەگەڕاندەوە، ئەوە ئەوەندە وئەوەندە زیادە دەدات بەخاوەن قەرزەکە، ئەوە زانایان بە کۆی دەنگ دەڵێن حەرامە و نابێت؛ چونکە سوویەکی ڕوون وئاشکرایە.

- شافیعییەکان دەڵێن: (إذا حل الدين طالبوا المدين برأس المال، فإن تعذر عليه الأداء زادوا في الحق والأجل، فهذا هو الربا الذي كانوا في الجاهلية يتعاملون به)[٣]. واتە: کاتی خۆی کە کاتی دانەوەی قەرزەکە دەهات، داوایان لەقەرزارەکە دەکرد قەرزەکەیان بۆ بگێڕێتەوە، ئەگەر نەیتوانیایە بیگێڕێتەوە کاتەکەیان بۆ درێژ دەکردەوە، وقەرزەکەیشیان لەسەر زیاد دەکرد، ئەمە ئەو سووە بوو کەلەسەردەمی نەفامی پێش ئیسلامدا مامەڵەیان پێوە دەکرد.

- حەنبەلییەکان دەڵێن: (أما المعاملة التى يزاد فيها الدين و الأجل فهي معاملة ربوية)[٤]. واتە: ئەو مامەڵەیەی کە کات وبڕی قەرزەکەی تێدا زیاد دەکرێت سووە. وە دەڵێن: (وكل قرض شرط فيه أن يزيده فهو حرام بغير خلاف)[٥]. واتە: هەر قەرزێك مەرجی ئەوەی تێدا بێت زیادەی بۆ بگێڕێتەوە بەکۆی دەنگ حەرامە.

---

١ - إبن عبد البر، الكافي، ج٢، ص٦٢٣.

٢ - الحطاب، تحرير الكلام في مسائل الإلتزام، ج١، ط١، دار الغرب الإسلامي، بيروت، ١٤٠٤، ص١٧٦، تحقيق: عبد السلام محمد الشريف.

٣ - الرازي (فخر الدين محمد)، تفسير الرازي (مفاتيح الغيب)، ج٧، دار الكتب العلمية، بيروت، ط١٤٢١،٢٠٠٠، ص٧٥.

٤ - إبن تيمية، مجموع الفتاوى، ج٢٩،ص٤٣٩.

٥ - إبن قدامة، المغني، ج٤،ص٢٤٠، مصدر سابق.

ئەمە بۆچوونی زانایانی هەر چوار مەزهەبەکەیە لەکۆندا، ئێستا دێینە سەر بۆچوونی زانایانی هاوچەرخ بزانین بۆچوونی ئەوان چۆنە وهیچ گۆڕانکارییەك لەحکومی بابەتەکەدا ڕوویداوە.

- کۆمکاری فیقهی ئیسلامی کەسەر بە رابیطەی جیهانی ئیسلامییە لە بڕیاری هەشتی خولی یازدەیدا دەڵێت: (وبعد البحث والدراسة قرر المجمع الفقهي بالإجماع ما يلي: إن الدائن إذا شرط على المدين، أو فرض عليه أن يدفع مبلغاً من المال غرامة مالية جزائية محددة، وبنسبة معينة إذا تأخر عن السداد في الموعد المحدد بينهما، فهو شرط أو فرض باطل، ولا يجب الوفاء به، بل ولا يحل، سواء أكان الشارط هو المصرف أم غيره؛ لأن هذا بعينه هو ربا الجاهلية الذي نزل القرآن بتحريمه)[١]. واتە: لە دوای توێژینەوەو لێکۆڵینەوە کۆمکاری فیقهی بەکۆی دەنگ بڕیاریدا لەسەر ئەوەی کە: ئەگەر خاوەن قەرز مەرجی ئەوەی لەسەر قەرزدارەکە دانا، یان ناچاری کرد بەوەی کە ئەگەر قەرزەکەی لەو کاتەی کەرێکەوتبوون لەسەری نەگێڕیایەوە، دەبێت ڕێژەیەکی دیاری کراوی وەك سزایەکی دارایی بداتێ، ئەو جۆرە مەرجە یان ناچارکردنە دروست نییە و حەرامە وقەرزارەکە بۆی هەیە پێوەی پابەند نەبێت ونەیداتێ، وهەر حەڵاڵ ودروستیش نییە بیداتێ، جا خاوەن قەرزەکە وئەو کەسەی مەرجەکەی داناوە بانك بێت، یان هەرکەسێکی تر بێت؛ چونکە ئەوە ئەو سووەی سەردەمی نەفامییە کەقورئان لەسەر حەرامکردن وپاساغ کردنی هاتە خوارەوە.

- کۆمکاری فیقهی ئیسلامییش کەسەر بە ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامییە لە بڕگەی چواری بڕیارەکانی خولی دوازدەیدا دەڵێت: (إذا تأخر المشتري المدين في دفع الأقساط بعد الموعد المحدد، فلا يجوز إلزامه أي زيادة على الدين، بشرط سابق أو بدون شرط، لأن ذلك ربا محرم)[٢]. واتە: ئەگەر کڕیاری قەرزدار دواکەوت لەدانەوەی گوژمەکان لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا، دروست

---

١ - المجمع الفقهي الإسلامي التابع لرابطة العالم الإسلامي المنعقد بمكة في الفترة من يوم الأحد ١٣ إلى ٢٠ رجب ١٤٠٩هـ الموافق من ١٩ إلى ٢٩ فبراير ١٩٨٩م، في موضوع السؤال التالي: إذا تأخر المدين عن سداد الدين في المدة المحددة، فهل له - أي البنك - الحق بأن يفرض على المدين غرامة مالية جزائية بنسبة معينة بسبب التأخير عن السداد في الموعد المحدد بينهما؟.

٢ - مجمع الفقه الإسلامي التابع لمنظمة المؤتمر الإسلامي في دورته الثانية عشرة بالرياض في المملكة العربية السعودية، من ٢٥ جمادى الآخرة ١٤٢١هـ ـ ١ رجب ١٤٢١هـ الموافق ٢٣ — ٢٨ أيلول ( سبتمبر ) ٢٠٠٠م. مجلة المجمع، ع١٢، ج ٢، ص ٩١. القرار قـم ٥١(٢/٦).

نییە ناچار بکرێت لەسەر دانەوەی هیچ زیادەیەك لەقەرزەکەی خۆی، جا چ پێشتر مەرجی ئەوەی لەگەڵدا کرابێت، یان مەرجی لەگەڵ نەکرابێت، چونکە ئەوە سووە وحەرامە.

- کۆمکاری ئیسلامی سەر بەئەزهەریش دەڵێت: (الفائدة على أنواع القروض كلها ربا محرم، لا فرق في ذلك بين ما يسمى بالقرض الاستهلاكي، وما يسمى بالقرض الإنتاجي؛ لأن نصوص الكتاب والسنة في مجموعها قاطعة في تحريم النوعين)[1]. واتە: دانانی سوود لەسەر هەموو جۆرەکانی قەرز حەرامە ودەچێتە خانەی سووەوە، قەرزەکە قەرزی بەکار بردن بێت یان وەبەرهێنان هیچ جیاوازی نییە؛ چونکە کۆی دەقەکانی قورئان وسوننەت حەرامی هەر دوو جۆرەکەیان بڕاندۆتەوە[2].

### سێیەم: وەرگرتنەوەی قەرەبووی زیانەکانی قەرز:

لەخاڵی پێشوودا باسمان لەوە کرد کە خاوەن قەرز بەهیچ شێوەیەك بۆی نییە مەرجی ئەوە لەسەر قەرزار دابنێت کە ئەگەر لەکاتی خۆیدا قەرزەکەی نەگەڕاندەوە زیادە بخاتە سەر قەرزەکەی؛ چونکە خوای گەورە فەرمان بەوە دەکات کە ئەگەر قەرزدار نەداربوو وەنەیدەتوانی پارەی قەرزەکەی بداتەوە پێویستە ماوەی قەرزەکەی بۆ درێژ بکرێتەوە نەك بڕی قەرزەکەی لەسەر زیاد بکرێت؛ بەڵام هەندێك جار دەبینین قەرزارەکان بەبێ هیچ

---

١ - ئەو بڕیارەی ئەزهەر لەکۆبوونەوەیکدا بەبەشداری نوێنەران وزانایانی (٣٥) دەوڵەتی ئیسلامی لە ساڵی (١٩٦٥) دا دەرچووە.

٢- ئەمانەیش چەند فەتوایەکی تری زانایانی هاوچەرخن لەو بارەیەوە:

- فتوى لجنة الإفتاء العام في المملكة الأردنية الهاشمية رقم ( ٢٠٥٧): (الغرامة التي تشترط بسبب التأخر في وفاء الدين أو دفع قسط من الأقساط، فهي محرمة بالنص، سواء كانت مشروطة في العقد أم لا. ولا يجوز الدخول في عقد يحتوي على مثل هذا الشرط؛ لأنه مفسد للعقد ابتداء، ولا يجوز الدخول في أي عقد فاسد).

- فتوى بيت التمويل الكويتي: (لا يجوز أخذ زيادة على الدين مقابل مماطلة المدين، ولو كان مماطلا عن عمد وغنى، تفاديا من الوقوع في ربا النسيئة).

- الفتوى رقم (٥٧) الصادرة عن إدارة التطوير والبحوث مجموعة دلة البركة: (لا يجوز للدائن أن يشترط على المدين المماطل غرامة تأخير لصالح الدائن، لأن ذلك ذريعة إلى المرابة بطريقة (زدني أنظرك)، ولا يحل للدائن تملك تلك الغرامة).

- الفتوى رقم (١٨) الصادر عن هيئة الرقابة الشرعية لمصرف قطر الإسلامي ما نصه: (لا يجوز فرض أية غرامة للتأخير، وإنما يمكن فقط اتخاذ الإجراءات القانونية ضد هؤلاء العملاء).

پاساوێك قەرزی خاوەن قەرزەکان ڕادەگرن ونایاندەنەوە وبۆ خۆیان بازرگانی پێوە دەکەن، وئەمەیش دەبێتە هۆی زیانپێگەیاندنی خاوەن قەرزەکان.

پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە: ئایا خاوەن قەرزەکان بۆیان هەیە لەم حاڵەتانەدا داوای قەرەبووی ئەو زیانانە بکەن کە بەهۆی دواکەوتنی قەرزەکانیانەوە لێیان کەوتوە؟.

لەوەڵامدا دەڵێین: بەڵێ خاوەن قەرزەکان بۆیان هەیە، داوای قەرەبووی هەموو ئەو زیانانە بکەنەوە، کەبەهۆی کەمتەرخەمی وخەم ساردی قەرزارەکانەوە لێیان کەوتووە؛ چونکە پێغەمبەری خودا ﷺ لەفەرموودەیەکیدا دەفەرموێت: {مَطْلُ الْغَنِيِّ ظُلْمٌ}[1]. واتە: گرتنی پارەی قەرز ونەگێڕانەوەی لەکاتی خۆیدا بەبێ هۆ ستەمە وحەرامە. لەفەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت: {لَيُّ الْوَاجِدِ يُحِلُّ عِرْضَهُ وَعُقُوبَتَهُ}[2]. واتە: دواخستنی دانەوەی قەرز بۆ کەسێك هەیبێت بیداتەوە ونەیداتەوە، مافی ئەوە بەخاوەن قەرزەکە دەدات باسی بکات وسکاڵای لەدژ بکات وسزایشی بدات.

ئەم حاڵەتە لەگەڵ حاڵەتی پێشودا لەچەند ڕوویەکەوە جیاوازە لەوانە:

١- لەحاڵەتی پێشوودا خاوەن قەرز زیادە دەخاتە سەر ڕێژەی قەرزەکە، ئیتر زیانی کردبێت یان نا ئەو گوێی لەوە نییە؛ بەڵام لەم حاڵەتەدا هیچ زیادەیەك وەرناگرێت، بەڵکو تەنها قەرەبووی زیانەکانی وەردەگرێتەوە.

٢-لەحاڵەتی پێشوودا خاوەن قەرز پاساوی نەدانەوەی قەرزەکەی ڕەچاو ناکات وجیاوازی ناکات لەنێوان ئەوەی کە ئایا قەرزار هەیەتی و بەئارەزوو نایداتەوە، یان نیەتی وناتوانێت بیداتەوە؛ بەڵام لەم حاڵەتەدا تەنها ئەو کاتە بۆی هەیە داوای قەرەبوو بکات، کە کەسی قەرزار هەیبووە وبەئارەزوو قەرزەکەی نەداوەتەوە.

٣-لەحاڵەتی پێشوودا ڕێژەی ئەو زیادەیەی کە خاوەن قەرز لەقەرزارەکەی وەردەگرێت دیاریکراوە و نەگۆڕە؛ بەڵام لەم حاڵەتەدا ڕێژەی قەرەبووکە دیار نییە، بەڵکو بەپێی ئەو زیانەیە کەپێی کەوتووە، خۆ ئەگەر هیچ زیانی نەکردبوو هیچ وەرناگرێت.

---

١ - البخاري، صحيح البخاري، ج٣،ص٩٤، رقم الحديث (٢٢٨٧). مسلم، صحيح مسلم، ج٣، ص١١٩٧، رقم الحديث (١٥٦٤).

٢ - البخاري، صحيح البخاري، ج٣،ص١١٨.

٤- لەحاڵەتی پێشوودا بڕی زیادەکە خاوەن قەرز خۆی دیاری دەکات ودەیسەپێنێت بەسەر کەسی قەرزاردا، بەڵام لەم حاڵەتەدا دەبێت لیژنەیەکی بێلایەن یان دادگا ڕێژەی قەرەبووکە دیاری بکات، تا هیچ لایەکیان ستەمیان لێ نەکرێت.

٥- لەحاڵەتی پێشوودا لایەنی قەرزدەر دەسمایەکەی وزیادەیش وەردەگرێت، بەڵام لەم حاڵەتەدا تەنها قەرەبووی زیانەکەی بۆ دەکرێتەوە وهیچ زیادەیەك ناچێتە سەر بڕی دەسمایەکەی.

بەم پێیە وبۆ داواکردنی قەرەبوو لەم حاڵەتەدا دەبێت ئەم مەرجانە ڕەچاو بکرێت:

أ- دەبێت خاوەن قەرزەکان ئەوە بسەلمێنن کەلە واقیعدا زیانیان پێکەوتوە، نەك تەنها بەقسە یان بەئەگەری ئەوەی کەلەوانەیە زیانیان پێکەوتبێت داوای زیادە بکەن.

ب- دەبێت زیانەکان بەهۆی کەمتەرخەمی وخەمساردی قەرزارەکانەوە دروست بووبێت، نەك لەبەر نەبوونی، خۆ ئەگەر قەرزارەکان لەبەر نەبوونی دانەوەی قەرزەکانیان دواخستبوو، ئەوە بەهیچ شێوەیەك خاوەن قەرزەکان بۆیان نییە داوای قەرەبوویان لێ بکەن.

ت- دەبێت ئەو قەرەبووەی وەری دەگرن بەقەدەر ڕێژەی ئەو زیانانە بێت کە پێیان کەوتوە، ولەوە زیاتر هیچ وەرنەگرن؛چونکە لەوە زیاتر هەرچی وەربگرن سووە وحەرامە.

ث- دەبێت لیژنەیەکی بێ لایەن یان دادگا لێکۆڵینەوە لە سکاڵای خاوەن قەرزەکە بکات وبڕیاری لەسەر بدات، نەك خاوەن قەرزەکە خۆی.

ج- دەبێت قەرەبووەکە بۆ پڕکردنەوەی زیانەکان بێت، نەك بۆ دەستخستنی سوود وزیادکردنی دەسمایە.

## چوارەم: حوکمی ئەو گرێبەستانەی کە سوویان تێدایە:

پاش ئەوەی بۆمان دەرکەوت کە هەموو ئەو پێشینە وقەرزانەی مەرجی سزای زیادکردنی پارەی تێدایە، حەرامە وئەنجامدانی دروست نییە، ئێستا قسە لەسەر حوکمی خودی ئەو گرێبەستانە دەکەین کە ئەو جۆرە مەرجانەیان تێدایە؛ چونکە هەندێك کەس کە ئەو جۆرە مامەڵە وقەرزانە دەکەن دەڵێن: ئێمە کارێکی وا ناکەین، ئەو مەرجە بێتە دی وپارەکان لەکاتی خۆیدا دەگێرینەوە؛ بۆیە تووشی حەرام نابین.

ئێستا بزانین ئەم پاساوە تا چەند شەرعییە و ئەو گرێبەست و مامەڵانەی کە ئەو جۆرە مەرجەیان تێدایە تا چەند دروستە مرۆڤی موسوڵمان بەشدارییان تێدا بکات .

سەرەتا پێم خۆشە ئەو بەرێزانە ئەوە بزانن کە زانایانی هەر چوار مەزهەبەکە تێکڕا هاوڕان لەسەر ئەوەی کە هەر گرێبەستێك ئەو جۆرە مەرجەی تێدا بێت جگە لەوەی کە کردنی حەرامە، گرێبەستەکەیش دانامەزرێ وهەڵدەوشێتەوە، یان بەلای کەمەوە پێویستە مەرجی دانانی سزای سووەکە هەڵبوەشێتەوە، وئەمەیش دەقی قسەکانیانە لەو بارەیەوە.

حەنەفییەکان دەڵێن: (وَإِدْخَالُ الرِّبَا فِي الْعَقْدِ يُفْسِدُ الْعَقْدَ كُلَّهُ)[1]. واتە: دانانی سوو لەگەرێبەستدا هەموو گرێبەستەکە پوچەڵ دەکاتەوە وتێکی دەدات.

مالیکییەکان دەڵێن: (وكل بيع حرام لا يقر على حال إن أدرك رد)[2]. واتە: هەر مامەڵەیەکی حەرام بەهیچ شێوەیەك ڕێگەی پێ نادرێت ودەبێت هەڵبوەشێتەوە.

شافیعییەکان دەڵێن: (وتعاطي المعقود الفاسد حرام في الربوي وغيره)[3]. واتە: ئەو گرێبەستانەی پوچ و وبەتاڵن بەهۆی بوونی سوو وغەیری سوویشەوە، ئەنجامدانیان حەرامە. دەشڵێن: (العقد إذا وقع فاسداً لا يصح بزوال ما وقع فاسداً)[4]. واتە: هەر گرێبەستێك بە خراپی دامەزرا، بەلادانی ئەو مەرجەی کە بەتاڵی کردۆتەوە دروست نابێت.

حەنبەلییەکانیش دەڵێن: (ويحرم تعاطيهما عقداً فاسداً من بيع أو غيره (فلا يملك المبيع ونحوه (به) أي بالعقد الفاسد؛ لأن وجوده كعدمهِ)[5]. واتە: حەرامە گرێبەستێك ئەنجامبدەن کە

---

١ – الكاساني (أبو بكر بن مسعود)، بدائع الصنائع في ترتيب الشرائع، ج٥، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤٠٦، ص٢٥٧.

٢ – مالك (مالك بن أنس)، المدونة الكبرى، ج٣، دار الكتب العلمية، بيروت، ص٣٣٨، تحقيق: زكريا عميرات.

٣ – الخطيب الشربيني، مغني المحتاج، ج٤،ص٨٦، مصدر سابق.

٤ – الماوردي، الحاوي الكبير، ج٦، ص٩٣، مصدر سابق.

٥ – البهوتي، كشاف القناع، ج٣،ص٢٤٥، مصدر سابق.

بەتاڵە، گرێبەستەکە کڕین وفرۆشتن بێت یان هەرشتێکی تر بێت وکڕیار نابێتە خاوەنی فرۆشراوەکە بەو گرێبەستە بەتاڵە؛ چونکە بوون ونەبوونی ئەو جۆرە گرێبەستانە وەك یەك وایە. هەروەها دەڵێن: (المقبوض بالعقد الفاسد يجب فيه التراد من الجانبين)[١]. واتە: ئەو شتانەی بەهۆی گرێبەستێکی پوچەوە وەرگیراون، پێویستە هەردوو لایەنی گرێبەستکە بۆ یەکتری بگێڕنەوە.

بەڵگەی زانایانیش لەسەر ئەم بابەتە ئەم فەرموودانەیە:

- ئەبو سەعیدی خدری بۆمان دەگێڕێتەوە ودەڵێت: (جَاءَ بِلاَلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ بِتَمْرٍ بَرْنِيٍّ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: {مِنْ أَيْنَ هذا}؟. قَالَ بِلاَلٌ: كَانَ عِنْدَنَا تَمْرٌ رَدِيٌّ، فَبِعْتُ مِنْهُ صَاعَيْنِ بِصَاعٍ لِنُطْعِمَ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ عِنْدَ ذَلِكَ {أَوَّهْ أَوَّهْ عَيْنُ الرِّبَا عَيْنُ الرِّبَا، لاَ تَفْعَلْ وَلَكِنْ إِذَا أَرَدْتَ أَنْ تَشْتَرِيَ، فَبِعِ التَّمْرَ بِبَيْعٍ آخَرَ ثُمَّ اشْتَرِهِ} ...)[٢].. واتە: بیلال خورمایەکی بەرنی بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ هێنا، پێغەمبەری خودا ﷺ پێی فەرموو: ئەمەت لەکوێ بووە؟. بیلال گوتی: خورمایەکی خراپمان هەبوو چووم هەشت مشتم لەو خورما خراپە دا بەچوار مشت لەم خورمایە بۆ ئەوەی پێغەمبەری خودا ﷺ لێی بخوات، پێغەمبەری خودا ﷺ پێی فەرموو: ئۆە ئۆە چیت کردوە ئەوە خودی سووە خودی سووە، شتی وانەکەیت، ئەگەر وویستت لەم خورمایە بکڕیت، خورماکەی خۆت بفرۆشە، دواتر ئەم خورمایە بکڕە.

- هەر ئەبو سەعیدی خدری بۆمان دەگێڕێتەوە ودەڵێت: أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِتَمْرٍ فَقَالَ: {مَا هَذَا التَّمْرُ مِنْ تَمْرِنَا} فَقَالَ الرَّجُلُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بِعْنَا تَمْرَنَا صَاعَيْنِ بِصَاعٍ مِنْ هَذَا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: {هَذَا الرِّبَا فَرُدُّوهُ، ثُمَّ بِيعُوا تَمْرَنَا وَاشْتَرُوا لَنَا مِنْ هَذَا}[٣].[٤]. واتە: خورمایەکیان بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ هێنا، فەرمووی: ئەو خورمایە خورمای خۆمان نییە، ئەو پیاوەی کەهێنابووی گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ هەشت مشتمان لەخورماکەی خۆمان داوە

---

١ - إبن تيمية (أحمد بن عبد الحليم)، إقتضاء الصراط المستقيم في مخالفة أصحاب الجحيم، ج٢، ط٧، دار عالم الكتب، بيروت، ١٤١٩، ١٩٩٩، ص٤٧، تحقيق: ناصر عبد الكريم العقل.

٢ - البخاري، صحيح البخاري، ج٣، ص١٠٢، رقم الحديث (٢٣١٢)، مصدر سابق. مسلم، صحيح مسلم، ج٣، ص١٢١٥، رقم الحديث (١٥٩٤)، مصدر سابق. متفق عليه.

٣ - مسلم، صحيح مسلم، ج٣، ص١٢١٥، رقم الحديث (١٥٩٤). مصدر سابق.

٤ - إبن حجر العسقلاني، فتح الباري، ج٤، ص٤٠٠، مصدر سابق.

بەچوار مشت لەم خورمایە. پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ئەوە سووە بڕۆن بیبەنەوە وخورماکەی خۆمان بفرۆشن ودواتر لەم خورمایەمان بۆ بکڕن.

- ئیبن حەجەر دەربارەی ئەم فەرموودانە دەڵێت: (پێدەچێت ئەم دوو فەرموودەیە لەسەر دوو ڕووداوی جیاواز بن، چونکە فەرموودەی یەکەم فەرمان بەگێڕانەوەی شتەکە ناکات، ودیارە ئەوە پێش حەرامکردنی سووی زیادە بووە. ودواتریش دەربارەی فەرموودەی دووەم دەڵێت: (وفيه أن البيوع الفاسدة ترد)[١]. واتە: ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو کڕین وفرۆشتنانەی پوچ وبەتاڵن ڕەت دەکرێنەوە وهەڵدەوەشێنەوە.

ئیمامی نەوەویش دەڵێت: (دليل على أن المقبوض ببيع فاسد يجب رده على بائعه، وإذا رده استرد الثمن)[٢]. واتە: ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەر کڕدراوێك لە مامەڵەیەکی پوچدا دەبێت بگێڕدرێتەوە، وکە گەڕایشەوە پارەکەی وەردەگیرێتەوە.

جا بەڕێزان هەمووی ئەمانەی باسمان کرد بەڵگەی ڕوون وئاشکران لەسەر بەتاڵی و پووچی هەر مامەڵەیەك کە سووی تێدابێت، ئیتر سووەکە بدرێت یان نا ئەوە بابەتێکی ترە؛ بۆیە نەدانی سووەکە هەرگیز نابێتە پاساوی شەرعی بۆ کردنی مامەڵەیەك کە لە بنەڕەتدا سووی تێدایە.

---

١ - إبن حجر العسقلاني، فتح الباري، ج٤،ص٤٠١، مصدر سابق.

٢ - النووي (يحيي بن شرف النووي)، شرح النووي على صحيح مسلم (المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج)، ج١١، دار إحياء التراث العربي، بيروت، ط ١٣٩٢، ص٢٢.

## پێنجەم: قەرزەکانی حکومەت وگرفتە شەرعییەکانی:

لای هەمووان ئاشکرایە کە حکومەت لەرێی چەندین وەزارەتەوە وبۆ چەندین مەبەستی جیاواز قەرز وپێشینە دەداتە هاوڵاتیان، بەڵام بەداخەوە زۆربەی زۆری ئەو قەرزانە شەرعی نین وخاڵی حەرامیان تێدایە ولێرەدا هەڵوێستە لەسەر هەندێك لەو قەرزانە دەکەین، وگرفتەکانیان باس دەکەین:

### أ- پێشینەی هاوسەرگیری:

سەرەتا پێم خۆشە بەدەستخۆشیەوە ئەوە بڵێین کە تاکە پێشینەیەك کە ئێستا حکومەت دەیداتو وگرفتی شەرعی تێدا نییە، پێشینەی هاوسەرگیرییە، هەرچەندە پێشینەی هاوسەرگیرییش سەرەتا دوو گرفتی شەرعی تێدا بوو:

یەکەمیان سووی تێدا بوو بە رێژەی (٪٢).

دووەمیان: حکومەت بڕی (١٠٠٠٠٠) دیناری وەر دەگرت وڕەوانەی کۆمپانیای دڵنیایی دەکرد.

بەڵام دواتر حکومەت بەپێی برگەی (١٧) ی ڕێنمایی دارایی ژمارە (١٩) لەبەرواری (٢٠١١/٧/١٠) ڕێژەی سوەکەی لا برد. وبەپێی برگەی (٤)ی ڕێنمایی دارایی ژمارە (١٩) لەبەرواری (٢٠١١/٧/١٠) پارەی دڵنیاییەکەیشی لابرد وبڕی ئەو پارانەیش کە بەو ناوەوە وەرگیرابوون، خرانەوە سەر پارە گەڕاوەکان بۆ حکومەت[1]، لەبری ئەوانە حوکمەت پێدانی کەفیلی کردە مەرج و لە برگەی (٧) دا نووسی: (دەبێت ئەو پێشینەیەی کە فەرمانبەر وەریدەگرێت کەفیلی هەبێت کەفیلەکەشی فەرمانبەربێت). دواتر لە برگەی (١٠) یشدا نووسی: (ئەو فەمانبەرەی کە ئەم پێشینەیەی وەرگرتووە و پشکەکانی ئەم پێشینەیەی

---

١- جێی خۆیەتی لێرەدا دەست خۆشی لە یەکێتی زانایان، ولیژنەی باڵای فەتوای هەرێم، وسەرجەم مامۆستایان وزانایانی ئیسلامی بەرێز بکرێت کە هەوڵێکی زۆریان دا لەو پێناوەدا، وسوپاس بۆ خوا هەوڵەکانیشان بەرهەمی هەبوو.

نەگەڕاندوەتەوە، لەوکاتەدا دەبێت کە فیلەکەی هەڵبسێت بەدانەوەی پێشینەکە بەهەمان شێوە کە لەخاڵی (٩) سەرەوە هاتووە"[١].

ئەم دوو بڕگەیەش هیچ گرفتێکی شەرعییان تێدا نییە.

### ب- پێشینەی خانووبەرە:

پێشینەی خانووبەرە یەکێکە لەو پێشینانەی کە هەر لەسەرەتاوە وئێستایشی لەگەڵ بێت گرفتی شەرعی تێدایە وخەڵکانێکی زۆر هەیە لەو ڕێیەوە تووشی حەرامی وکاری سووخۆری بوون، هەرچەندە وبەچەند قۆناغێك تا ئێستا هەندێك لەگرفتەکانی چارەسەر کراوە.

سەرەتا وبەپێی بڕگەی (٦) ڕێنمایی دارایی ژمارە (٤٤) ساڵی (٢٠٠٨) حکوومەت ڕێژەی (٢٪) وەك خەرجی کارگێڕی دەخستە سەر قەرزەکە، کە ئەمە سوو بوو، بەڵام دواتر وبەپێی بڕگەی (١) ڕێنمایی ژمارە (٤) ی ساڵی (٢٠١٠) ئەو ڕێژەیەی لابرد ولەبری ئەوە لە بڕگەی (٢) ئەم ڕێنماییە نوێیەدا بڕیاریدا کە بڕی (٢٥٠٠٠٠) دینار پێشەکی وەك تێچووی خەرجییەکانی پشکنین، چاپەمەنی، گواستنەوە، لەو هاووڵاتیانە وەربگرێت کە پێشینەی (١٢٠٠٠٠٠٠) ملیۆن دینار وەردەگرن، وبڕی (٢٠٠٠٠٠) یش لەو هاووڵاتیانە وەربگرێت کە بڕی پێشینەی (٩٠٠٠٠٠٠) وەردەگرن، دواتر وبەپێی ڕێنمایی دارایی ژمارە (١١) ساڵی (٢٠١٠) حکومەت بڕی قەرزەکە لە (١٢٠٠٠٠٠٠) ملیۆنەوە زیاد کرد بۆ (١٥٠٠٠٠٠٠) ملیۆن، لەبەرامبەریشدا تێچووی خەرجییەکانیشی زیاد کرد بۆ (٣٠٠٠٠٠) هەزار دینار. دواتر وبەپێی بڕگەی (١) ڕێنمایی دارایی ژمارە (١٨) لە بەرواری (١٠/٧/ ٢٠١١) حکومەت بڕی پێشینەکەی زیاد کرد بۆ (٢٠٠٠٠٠٠٠) ملیۆن دینار بەڵام بڕی خەرجییەکانی زیاد نەکرد.

خۆ ئەگەر بەراوردی ئەو بڕە پارەیە بکەین کە حکومەت وەکو خەرجی لەهاوڵاتیانی وەردەگرێت، وماوەی وەرگرتنەوەی پێشینەکە کە (١٥) تا (٢٠) ساڵ دەخایەنێت. دەبینین حکومەت (١٨٠-٢٤٠) جار مامەڵە بۆ هاوڵاتی دەکات، وبەپێی بۆچوونی ئەو کەسانەی

---

١ - خاڵی (٩) باسی شێوازی دانەوەی قەرزەکە دەکات، کە دەبێت کەفیلەکە لەبری قەرزارەکە قەرزەکە بداتەوە بەحکومەت.

کەپسپۆڕ وشارەزان لەم بوارەدا ومن قسەم لەگەڵ کردوون، دەڵێن بڕی تێچووی قەرزەکە زۆر لەوە زیاترە کەحکومەت لەهاووڵاتی وەردەگرێت، بۆیە پێشینەکە لەم ڕووەوە گرفتی تێدا نییە.

بەڵام گرفتی سەرەکی ئەم قەرزە کە تائێستا چارەسەر نەکراوە، بریتییە لە سووی دواکەوتنی دانەوەی قەرزەکە، کە پێشتر وبەپێی برگەی (٧) ڕێنمایی دارایی ژمارە (٤٤) ساڵی (٢٠٠٨) ، وبرگەی (٨) ڕێنمایی دارایی ژمارە (١٤) ساڵی (٢٠١٠) ڕێژەی سوودی دواکەوتن (١٠٪) بوو لەسەر ڕەسیدی قەرزەکە. دواتر و بەپێی دوایین ڕێنمایی وەزارەتی دارایی وئابووری، کە ڕێنمایی ژمارە (١) ە لەبەرواری (٢٠١٤/١/٢٣) دا ولەژێر بابەتی (سوودی دواکەوتن) دا هاتووە دەڵێت: (سوودی دواکەوتنی هاتوو لە خاڵی (٨) ڕێنمایی سەرەوەمان، بۆ هەر ڕۆژێکی دواکەوتن لەگەڕانەوەی پشکی پێشینەکە، بڕی (٥٠٠٠) دینار دەبێت، ولێی وەردەگیرێت لەسەر ڕەصیدی قەرزەکە).

ئەگەر سەرنج بدەن نوسراوەکەی وەزارەت خۆی زۆر بەڕوونی بە سوو ناوی دەبات وئەم مەرجە دەقاودەق لەمامەڵەی قەرزەکەیشدا وبەبڕگەیەکی سەربەخۆ ولەژێر هەمان ناودا بوونی هەیە.

هەرچەندە حکومەت لە برگەی (٣) ڕێنماییەکانی ئەم پێشینەیەدا باس لەمەرجی بوونی کەفیل دەکات، بەڵام سەرەڕای ئەوەیش حکومەت ئەو سووە هەر وەردەگرێت، پرسیارەکەیش لێرەدا ئەوەیە باشە ئەگەر کەفیل هەیە حکومەت بۆچی هاوشێوەی پێشینەی هاوسەرگیری، بڕی قیستەکە لەمووچەی کەفیلەکە نابڕێت، وڕێژەی سووەکە لانابات؟!.

جگە لە کەفیل حکومەت بارمەتە (رهن) یش لەخەڵکانی سوودمەن لەو پێشینە وقەرزانە وەردەگرێت، ئەی ئەوەیان بۆچیە؟. بۆچی حکومەت بەکاری ناهێنێت؟. جگە لەمانەیش حکومەت دەتوانێت کۆمپیالەی جێبەجێکاریش بەکار بهێنێت وەك زەمانەتێك بۆ وەرگرتنەوەی قەرزەکەی، بۆیە پەنا بردنە بەر سوو بۆ ئەو مەبەستە هیچ پاساوێکی شەرعی، ولۆجیکی، ویاسایی نییە وبەهیچ شێوەیەکیش ناچێتە ژێر خانەی قەرەبووکردنی زیانەکانی قەرزەوە، لەبەر ئەم خاڵانەی خوارەوە:

١- حکومەت، یان بانك، یان کۆمپانیا، یان پێشانگا هەر لەسەرەتاوە ئەم مەرجە دادەنێت، ئیتر زەرەر بکات یان قازانج ئەو برە پارەیە لە کەسی قەرزار وەردەگرێت، لەکاتێکدا قەرەبووی زیانی قەرز تەنها لەحاڵەتی بوونی زیانی فعلیدا وەردەگیرێت.

٢- قەرەبووی زیانی قەرز کاتێك دروستە کەکەسی قەرزار کەمتەرخەمی کردبێت لەگەڕاندنەوە قەرزەکەی، بەڵام لەم جۆرە مامەڵانەدا لایەنی قەرزدەر هەرگیز ئاوڕ ناداتەوە لەپاساوی دواکەوتنی دانەوەی قەرزەکەی، کە ئایا ئەو کەسە هەیەتی وبەئارەزوو نایداتەوە، یان نیەتی وبەناچاری بۆی نادرێتە.

٣- ڕێژەی ئەو سووەی ئەوان وەری دەگرن ڕێژەیەکی جێگیر ونەگۆڕە، بەڵام ڕێژەی قەرەبووی زیانی قەرز بەپێی قەبارەی زیانەکەیە، وڕێژەیەکی دیاری کراوی نییە.

٤- دیاریکردنی ڕێژەی قەرەبووکە دەبێت کەسێکی بێلایەن بیکات، بەڵام لەم جۆرە مامەڵانەدا لایەنی قەرزدەر دەیسەپێنیت بەسەر کەسی قەرزاردا وناچاریشی دەکات لەسەر قبوڵکردنی.

٥- لەقەرەبووی زیانی قەرزدا لایەنی قەرزدەر تەنها زیانەکانی بۆ قەرەبوو دەکرێتەوە وهیچ زیادەیەك ناچێتە سەر دەسمایەی قەرزەکەی؛ بەڵام لەم جۆرە مامەڵانەدا خاوەن قەرز هەموو دەسمایەکەی وەردەگرێتەوە وسەرباری ئەوەیش زیادە وەردەگرێت.

وبەداخیشەوە ئەم مەرجە تا ئێستا لەزۆربەی قەرزەکانی حکومەت، وبانك، وکۆمپانیاکانی وەبەرهێنان، وپێشانگاکانی بازرگانی ئۆتۆمبێلیشدا هەیە.

بۆیە بەر لەهەموو کەس ئەرکی حکومەت وگشت بانك، وکۆمپانیا، وپێشانگەکانە ئەم مەرجە بگۆڕن لەهەموو گرێبەست، وقەرز، وپێشینەکانیاندا، ولەبری ئەوە پەنا ببەنە بەر ڕێکارە شەرعییەکان وئەرکی مامۆستایانی بەڕێزیشە لە یەکێتی زانایان، ولیژنەی باڵای فەتوا، وسەرجەم مامۆستایانی تر چیان پێدەکرێت بیخەنە گەڕ بۆ لابردنی ئەم مەرجە وپاش ئەوانیش ئەرکی هەموو هاوڵاتییەکی سادەیشە کە پەنا نەباتە بەر وەرگرتنی ئەو جۆرە قەرز وپێشینانە، ومامەڵە لەگەڵ هیچ دامەزراوەیەکدا نەکات کە بەو شێوازە مامەڵە دەکات.

ت- پێشینەی کشتوکاڵی:

ئەو پێشینەیەی کە وەزارەتی کشتوکاڵ وئاودێری دەیداتە هاوڵاتیان نزیکەی (٢٠) پرۆژە دەگرێتەوە، کە ئەمانەن: (بەرهەمی دانەوێڵە، خانووی پلاستیکی، باخداری، نەمامگە، ئامێرو کەلوپەلی کشتوکاڵی، سیستەمی ئاودێری- ڕشاندن، دڵۆپاندن- تراکتۆرو دەڕاسەو پاشکۆکانی، هەنگەڵان، پەرەپێدانی بەرهەمی ئاژەڵی شیردەر، قەڵەو کردنی گوڵك و بەرخ، نۆژەنکردنەوەی پرۆژەکانی پەلەوەر، بەخێوکردنی پەلەوەری گۆشتو هەڵهێنەر، پرۆژەی پەلەوەری دایکانەی گۆشتو هێلکە، دروستکردنی کارگەی ئالیك، ساردخانە، بواری ماسی، پرۆژەی قارچك، بیری ئیرتوازی، ڕاکێشانی کارەبا وکڕینی موەلیدە).

هەرچەندە حکومەت سەرەتا بۆ ئەم قەرزانەیش بڕی (٢٪) ی وەك رسومات وەردەگرت[١]، بەڵام دواتر هاوشێوەی پێشینەی خانووبەرە ئەو رسوماتەی لابرد[٢].

بەپێی ڕێنماییە داراییەکانی ژمارە (١٥) ساڵی (٢٠٠٩) حکومەت بۆ زامنکردنی وەرگرتنەوەی قەرزەکەی لەبڕگەی (٥) دا مەرجێکی شەرعی دادەنێت، ودەڵێت: ئەو جوتیارانەی کە داواکاری پێشکەش دەکەن بۆ وەرگرتنی قەرزی کشتوکاڵی، دەبێت لەبەرامبەر ئەم قەرزانەدا، زەوی کشتوکاڵی یان هەر موڵکێکی تر بە زەمان دابنێن بەمەرجێك بەهای ئەو موڵکە لە بڕی ئەو قەرزە زیاتر بێت.

بەڵام بەداخەوە لەبڕگەی (٦) هەمان ڕێنمایی سەرەوەدا هاتووە: (لەکاتی دواخستنی قیستی ساڵانە، سوودی دواخستنی دەخرێتە سەر بەرێژەی (١٢٪) وپێویستە، لەماوەی یەك مانگدا قیستی ساڵانە بدات).

سەرباری ئەمەیش لەبڕگەی (١١) ی ڕێنمایی ژمارە (٩)ی ساڵی (٢٠١٢) دەڵێت: (هەر پرۆژەیەك زیاتر لە ساڵێك بەسەریدا تێپەڕی وتەواو نەکرا، دەبێت جوتیارەکە گشت قەرزەکە بگەڕێنێتەوە لەگەڵ بڕی (١٢٪) سوودی دواکەوتن لەپارەی وەرگیراو، تەنها پرۆژە ستراتیجییەکان نەبێت، کە پێویستی بەماوەیەکی زیاتر هەیە بۆ ئەنجام دانی). کەواتە وبەپێی ئەم ڕێنماییانە سەرجەم قەرزەکانی وەزارەتی کشتوکاڵیش سووی تێدایە و وەرگرتنی حەرامە.

---

١ - بەپێی ڕێنمایی دارایی ژمارە (١٥) لەساڵی (٢٠٠٩) دا.

٣ - بەپێی ڕێنمایی ژمارە (٧) لە بەرواری (٢٠١٠/٤/٢٧) حکومەت رسوماتەکەی لابرد، وبڕیاری دا لەبری ئەوە بڕی (١٠٠٠٠) دینار بۆ هەر ملیۆنێك وەك خەرجی قەرزەکە وەربگرێت. بەمەیش کێشەی رسوماتەکە چارەسەر بوو.

### ث- پێشینەی گەشتوگوزاری:

ئەو قەرزانەی کە بەمەبەستی پەرەپێدانی کەرتی گەشتوگوزاری حکومەت دەیداتە هاووڵاتیان بریتین لە: (دروستکردنی ئوتێل، مۆتێل، گوندی گەشتیاری. دروستکردنی چێشتخانە، کەپری گەشتاریی، کۆشك لە هاوینە هەوارەکاندا، دروستکردنی سەنتەری ڕاهێنانی گەشتیاری، جێگای فرۆشتنی کارە دەستییەکان، چالاکی گەشتیاری جۆراوجۆر، پاسی گواستنەوەی گەشتیاران، دروستکردنی کەمپی گەشتیاری وکۆمەڵگەی گەشتیاری لاوان، دروستکردنی- Rest Area- لەنێوان شارەکان و لەسەر شەقامە سەرەکییەکان.

برگەی (٥) ی ڕێنماییەکانی ژمارە (٢٨) ی بەرواری (٢٠١٣/٦/١٢) باس لەوە دەکات کە لە (٦٠٪) بڕی تێچووی ئامێرەکان خەرج دەکرێن ودەبێت دڵنیایشی بۆ بکرێت دژی سوتان لە یەکێك لە کۆمپانیاکانی دڵنیایی مۆڵەت پێدراو لە هەرێم. هەرچەندە بابەتی دڵنیایی پەیوەندی بەسوودەوە نییە، بەڵام ئەمیش لەڕووی شەرعییەوە کێشەی هەیە وزۆرێك لەزانایان پێیان حەرامە.

لەبرگەی (٦) ی ڕێنماییەکاندا دەڵێت: حکومەت بڕی (١.٠٠٠.٠٠٠) یەك ملیۆن دینار بۆ ئەو پێشینانەی بڕەکانیان (٢٠٠.٠٠٠.٠٠٠) دووسەد ملیۆن دینار کەمترە، و بڕی (٢.٠٠٠.٠٠٠) دوو ملیۆن دینار بۆ ئەو پێشینانەی بڕەکانیان لە (٢٠٠.٠٠٠.٠٠٠) دووسەد ملیۆن دینار زیاترە وەك خەرجی تێچوونی قەرزەکان لەهاووڵاتیان وەردەگرێت. کەواتە ئەم بڕە پارەیە وەك خەرجی قەرزەکان وەردەگیرێت، هەرچەندە ئێمە نازانین بە فیعلی تێچووی ئەو قەرزانە چەندە؛ بەڵام ئەو بەپرسیارێتیە دەکەوێتە ئەستۆی ئەو دامەزراوە فەرمیانە کە پەیوەندییان بەم قەرزانەوە هەیە، چونکە وەکو گوتمان، دەبێت ئەو خەرجییانە خەرجی فیعلی بن، ئەگەر نا ئەوە هەرچی لەخەرجی فیعلی زیاتر بێت دەبێتە سوو، وپێویستە ڕەتبکرێتەوە بۆ هاووڵاتیان.

لەخاڵی (٩) وسەبارەت بە مەرجەکانی پێدانی پێشینەکە دەڵێت: (دەبێت وەرگری پێشینە موڵکێك ڕەهن بکات سەرەڕای کەفیلێکی دەستە بەر).

لەبڕگەی (١٤)ی هەمان ڕێنماییدا دەڵێت: ماوەی جێبەجێ کردنی پڕۆژەکە نابێت لە (١٨) مانگ زیاتر بێت، ولەحاڵەتی دواکەوتنیدا دەبێت گشت پێشینەکە بگەڕێندرێتەوە لەگەڵ (١٢٪) سوودی دواکەوتن لەپارەی وەرگیراو.

لەبڕگەی (١٦) یشدا دەڵێت: (ڕێژەی سوودی دواکەوتن (١٠٪) دەبێت لەسەر پشکی شایستە، کەدەبێت لەبەرواری شایستە بگەڕێندرێتەوە).

کەواتە حکومەت لێرەشدا لە دوو لاوە سووی دواکەوتنی قەرز لەپێشینەکانی گەشت وگوزاری وەردەگرێت. وبەمەیش وەرگرتنی هەموو ئەو جۆرە قەرزانەی کە بۆ ئەم مەبەستەیش خەرج دەکرێن حەرامە.

## ج- پێشینەی پیشەسازی:

ئەو پرۆژانەی کەپێشینەی پیشەسازی دەیانگرێتەوە بریتین لە پرۆژەکانی پیشەسازی: (خۆراك، ڕستن وچنین، بیناسازی، فلزییەکان، نا فلزییەکان، کارەبایی).

لە خاڵی (٣) ی برگەی (٢) ڕێنمایی ژمارە (٤) کە لە (٢٠١١/٣/١٧) دا دەرچووە دەڵێت: بڕی پارەی خەرجییەکانی کارگێڕی بەم شێوەیەی خوارەوە وەردەگیرێت: (١.٠٠٠.٠٠٠) یەك ملیۆن دینار بۆ ئەو قەرزانەی کە بڕەکەیان لە (٢٠٠.٠٠٠.٠٠٠) ملیۆن دینار کەمترە، و (٢.٠٠٠.٠٠٠) دوو ملیۆن دینار بۆ ئەو قەرزانەی کە بڕەکەیان لە (٢٠٠.٠٠٠.٠٠٠) ملیۆن دینار زیاترە[١]. لێرەدا و وەکو پێشتریش گوتمان پێویستە بڕی ئەو خەرجییە بۆ تێچووی فیعلی بێت، نەك بۆ پەردەپۆشکردنی سوو.

لە خاڵی (٣) ی بڕگەی (٣) هەمان ڕێنماییدا وبەهەمان شێوەی قەرزەکانی تر باس لەسووی دواکەوتنی دانەوەی قیستەکان دەکات ودەڵێت: (ڕێژەی سوودی دواکەوتنی قیستەکان (١٠٪) دەبێت لەسەر ڕەصیدی پێشینەکە).

---

١ - هەرچەندە پێشتر وبە پێی برگەی (٣) ی ڕێنمایی ژمارە (٢٤) لە (٢٠١٠/١١/٢٤)دا بڕی (٣٠٠.٠٠٠) وەردەگیرا بۆ خەرجییەکانی کارگێڕی، بەڵام دواتر پاش زیاد کردنی بڕی پێشینەکە خەرجییەکانیش بەم شێوەیە هەموار کرایەوە.

ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە حکومەت گرەنتی وەرگرتنەوەی قەرزەکەی دەکات لەڕێگەی دەستبەسەراگرتنی بینا وئامێرەکانی پرۆژەکەوە، بەمەرجێك بەناوی خاوەن پرۆژەکە خۆیەوە بن[١].

لەخاڵی (٢) ی بڕگەی (٥) یشدا باس لەدڵنیایی ئامێرەکان دەکات دژی سووتان. وئەمەیش وەکو گوتمان گرفتی شەرعی لەسەرە.

ئەمانە چەند نموونەیەك بوون لەو قەرز وپێشینانەی کە حکومەت دەیداتە خەڵکی، هەموو ئەمانە وسەرجەم قەرز وپێشینەکانی تریشی وەکو قەرزی بچوك وەبەرهێنان ویەکەی نیشتەجێبوون – جگە لەپێشینەی هاوسەرگیری- بەشێوەیەك لەشێوەکان سوویان تێدایە ووەرگرتنیان دروست نییە.

١ - پێشتر وبەپێی خاڵی (١) لە بڕگەی (٤) ی ڕێنماییەکانی سەرەوە دەبوو وەرگری پێشینەکە موڵکێك دەستەبەر بکات لەبەرژەوەندی بەنکی پیشەسازی سەرەڕای کەفیلێکی کەسایەتی، بەمەرجێ بەهای موڵکەکە بگونجێت لەگەڵ بڕی پارەی قەرزەکە. هەرچەندە دواتر وەزارەتی دارایی بەنووسراوی ژمارە (٢٢٦٨٤/٤/٩) لە بەرواری (٢٨/ ٢٠١١/١١) ئەم بڕگەیەی هەموار کردەوە بەو شێوەیەی باسمان کرد.

# بەشی شەش[1]

## وەرگرتنی قەرز بە سوو بە پاساوی ناچاری

تەوەرەکانی ئەم بەشە بریتین لە:

یەکەم: بەڵگەکانی وەرگرتنی قەرز بەسوو بە پاساوی ناچاری (الضرورة).

دووەم: بۆچوونی زانایان دەربارەی حاڵەتی ناچاری.

سێیەم: مەرجەکانی حاڵەتی ناچاری.

چوارەم: جیاوازی نێوان حاڵەتی ناچاری (الضرورة) و پێویستی (الحاجة).

بەرێزان لەم بەشەدا و لە دووتوێی ئەو چوار تەوەرەیەی ئاماژەمان پێکرد، قسە لەسەر وردەکارییەکانی وەرگرتنی قەرز بەسوو دەکەین بۆ حاڵەتی ناچاری.

### یەکەم: بەڵگەکانی وەرگرتنی قەرز بەسوو بە پاساوی ناچاری (الضرورة):

ئێستا وپاش ئەوەی کە بۆمان دەرکەوت جگە لەپێشینەی هاوسەرگیری، سەرجەم قەرز وپێشینەکانی تری حکومەت سوویان تێدایە ودروست نییە خەڵکانی موسوڵمان وەریبگرن.

پرسی ئەوە دێتە کایەوە کە ئایا دروستە ئەو قەرزانە وهاوشێوەکانیان کە سوویان تێدایە بۆ حاڵەتی ناچاری وەربگیرێن؛ چونکە هەندێك لەمامۆستایان بەبیانووی ئەوەی کەخەڵك ناچارە ڕێگەیان دابوو کە پێشینەی خانووبەرە وەربگرن، ئەگەرچی سوویشی تێدا بێت، وبەڵگەیان بەو ڕێسا شەرعییە هێنابووەوە کە دەڵێت: (الضرورات تبيح المحظورات). واتە: ناچاری حەرام حەڵاڵ دەکات.

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسە پێم خۆشە لێرەدا ولەچەند خاڵێکدا هەڵوێستەیەك لەسەر ئەم جۆرە فەتوایانە بکەین وبزانین تاچەند شەرعیین؟ وحاڵەتی ناچاری چییە؟ وکێ لەشەرعدا بەناچار ئەژمار دەکرێت؟ وئەو ڕێسا شەرعییەی کردویانەتە بەڵگە لەکوێوە

---

١ - ئەم بەشە ڕۆژی (٢٠١٥/١/٣) تۆمار کرا.

سەرچاوەی گرتوە؟. وئایا دەکرێت لەشەرعدا ئیش بەتەنها یەك ڕێسا بکرێت؟. یان پێویستە هەموو ڕێسا شەرعییەکان پێکەوە کاریان پێبکرێت؟.

سەرەتا لەشرۆڤەکردنی ئەو بەڵگانەوە دەستپێدەکەین کەسەرچاوەی دروستبوونی ئەو ڕێسا شەرعییەن.

ئەم ڕێسایە لەچوار دەقی قورئانەوە سەرچاوەی گرتوە کەئەمانەن:

دەقی یەکەم: ﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالدَّمَ وَلَحْمَ الْخِنزِيرِ وَمَا أُهِلَّ بِهِ لِغَيْرِ اللهِ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلاَ عَادٍ فَلا إِثْمَ عَلَيْهِ إِنَّ اللهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾[١]. واتە: خوای گەورە تەنها خواردنی گۆشتی مردارەوەبوو، وخوێن، وگۆشتی بەراز، وهەر ئاژەڵێك ناوی غەیری خوای لەسەر هاتبێت لەکاتی سەربڕیندا حەرام کردوە، هەرکەسیش ناچاربوو بەخواردنی هەر یەکێك لەوانە ئەوە تاوانبار نابێت، بەمەرجێك ستەمکار نەبێت وسنووری ناچارییەکەی نەبەزاندبێت وزیادەڕەوی تێدا نەکردبێت وخوای گەورەیش زاتێکی لێخۆشبوو وبەبەزەییە.

دەقی دووەم: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالْدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللهِ بِهِ وَالْمُنْخَنِقَةُ وَالْمَوْقُوذَةُ وَالْمُتَرَدِّيَةُ وَالنَّطِيحَةُ وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلاَّ مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ وَأَنْ تَسْتَقْسِمُوا بِالأَزْلاَمِ ذَلِكُمْ فِسْقٌ....فَمَنِ اضْطُرَّ فِي مَخْمَصَةٍ غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِإِثْمٍ فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾[٢]. واتە: گۆشتی مردارەوەبوو، وخوێن، وگۆشتی بەراز، وهەر ئاژەڵێك ناوی غەیری خوای لەسەر هاتبێت لەکاتی سەربڕیندا، وگۆشتی ئاژەڵی خنکاو، وکوژراو بەدار یان بەبەرد، ویان بەهۆی کەوتنە خوارەوە لەشوێنی بەرزەوە، یان بەهۆی قۆچلێدانی ئاژەڵی ترەوە، یان پەلامارданی ئاژەڵی دڕندەوە، هەموو ئەمانە حەرامن لەسەرتان، مەگەر بەر لەگیاندەرچوونیان بەچەقۆدا گەیشتبن وسەر بڕابن، وەهەر ئاژەڵێکیش بۆ بت سەربڕابێت، وە هەر تیکە نانێك بە جادو فێڵ قومار پەیدا کرابێت، هەموو ئەوانە تاوان وخراپەکارییین، هەر کەسیش ناچاربوو بەخواردنی هەر یەکێك لەوانە، بەمەرجێك نیەتی لادانی نەبێت بەلای حەرامدا وتەنها لەناچاریدا ئەوەی کردبێت، ئەوە خوای گەورە زاتێکی لێخۆشبوو وبەبەزەییە.

---

١ - سورة البقرة: الآية (١٧٣).

٢ - سورة المائدة: الآية (٣).

دەقی سێیەم: ﴿قُل لاَّ أَجِدُ فِي مَا أُوْحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّماً عَلَى طَاعِمٍ يَطْعَمُهُ إِلاَّ أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَماً مَّسْفُوحاً أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُ رِجْسٌ أَوْ فِسْقاً أُهِلَّ لِغَيْرِ اللّهِ بِهِ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلاَ عَادٍ فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾[1]. واتە: بڵێ لەوەی بە نیگاو سروش بۆ من هاتووە حەرام وقەدەغەکراوێك نابینم بۆ کەسێك بیەوێت شتێك بخوات، مەگەر ئەو شتە گۆشتی مردراوەبوو بێت، یان خوێنێکی ڕژاو بێت، یان گۆشتی بەراز بێت کەپیسە، یان ئاژەڵێك بێت بە تاوانکاری بۆ غەیری خوا سەربڕابێت، هەر کەسیش ناچاربوو بەخواردنی هەر یەکێك لەوانە بەمەرجێك ستەمکار نەبێت وسنووری ناچارییەکەی نەبەزاندبێت وزیادەڕەوی تێدا نەکردبێت ئەوە خوای گەورە زاتێکی لێخۆشبوو وبەبەزەییە.

دەقی چوارەم: ﴿إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةَ وَالْدَّمَ وَلَحْمَ الْخَنزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللّهِ بِهِ فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلاَ عَادٍ فَإِنَّ اللّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾[2]. واتە: خوای گەورە تەنها خواردنی گۆشتی مردارەوەبوو، وخوێن، وگۆشتی بەراز، وهەر ئاژەڵێك ناوی غەیری خوای لەسەر هاتبێت لەکاتی سەربڕیندا حەرام کردوە، هەر کەسیش ناچاربوو بەخواردنی هەر یەکێك لەوانە ئەوە تاوانبار نابێت، بەمەرجێك ستەمکار نەبێت، وسنووری ناچارییەکەی نەبەزاندبێت، وزیادەڕەوی تێدا نەکردبێت، وخوای گەورە زاتێکی لێخۆشبوو وبەبەزەییە.

ئەم چواردەقە بنچینەی سەرەکی[3] ڕێسای (الضرورات تبيح المحظورات)ن. وکۆی ئایەتەکان باس لەڕێگەپێدانی خواردنی کۆمەڵێك لە قەدەغەکراوەکان دەکەن لە حاڵەتی ناچاریدا، بەمەرجێك کەسەکە هیچ نیەتی تاوانکاری نەبێت ولەسنووری پڕکردنەوەی ناچارییەکەی دەرنەچێت.

ئێستا دێینە سەر پێناسەی ناچاری کە دەقەکان باسی دەکەن، تا بزانین ئەو ناچارییە چییە کە حەرام حەڵاڵ دەکات؟ وبۆچوونی زانایان دەربارەی ئەو حاڵەتە چۆنە؟.

---

١ – سورة الأنعام: الآية (١٥٤).

٢ – سورة النحل: الآية (١١٥).

٣ – ئەمە جگە لەو ئایەتانەی کە خوای گەورە تێیدا بەشێوەیەکی گشتی باس لەئاسانکاری کردن، وهەڵگرتنی نارەحەتی دەکات لەسەر مرۆڤەکان لەوانە: ﴿يُرِيدُ اللّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ﴾. سورة البقرة: الآية (١٨٥). ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْساً إِلاَّ وُسْعَهَا﴾. سورة البقرة: الآية (٢٨٦). ﴿لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْساً إِلَّا مَا آتَاهَا﴾. سورة الطلاق: الآية (٧). ﴿مَا يُرِيدُ اللّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ﴾. سورة المائدة: الآية (٦). ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾. سورة الحج: الآية (٧٨).

**دووەم: بۆچوونی زانایان دەربارەی حاڵەتی ناچاری:**

زانایان دەربارەی ئەو ناچارییەی کەدەقەکانی پێشووتر ئاماژەی پێدەکات، وحەرام حەڵاڵ دەکات بەم شێوازە دەدوێن:

- حەنەفییەکان دەڵێن: (ولا ضرورة إلا إذا خاف على النفس أو على العضو)[1]. واتە: هیچ حاڵەتێك بە ناچاری ئەژمار ناکرێت، مەگەر کەسەکە ژیانی یان ئەندامێکی جەستەی لەمەترسیدا بێت.

- مالیکییەکان دەڵێن: (أما الضرورة فهي خوف الموت)[2]. واتە: ناچاری – ئەو ناچارییەی حەرام حەڵاڵ دەکات- بریتییە لە ترسی مردن. دەشڵێن: (الضرورة هي الخوف على النفس من الهلاك)[3]. واتە: ناچاری بریتییە لەوەی کەسەکە ژیانی لە مەترسیدا بێت.

- شافیعییەکان دەڵێن: (أما الضَّرُورَة فنعني بهَا أَن يغلب على ظَنّه الْهَلَاك إِن لم يَأْكُل، وَكَذَلِكَ إِن خَافَ مَرضا يخَاف مِنْهُ الْمَوْت)[4]. واتە: مەبەستمان لە ناچاری ئەوەیە کە کەسەکە گومانێکی زۆری لا دروست بێت ئەگەر حەرامەکە نەخوات تیابچێت وبمرێت، ومیان ترسی تووشبوون بەنەخۆشییەکی هەبێت کە ئەگەری مردنی هەبێت. دەشڵێن: (الضرورة بلوغه حدا إن لم يتناول الممنوع هلك أو قارب)[5]. واتە: ناچاری گەیشتنە بەئاستێك کە ئەگەر حەرامەکە نەخوات تیا بچێت، یان نزیکی تیا چوون بێتەوە.

- حەنبەلییەکان دەڵێن: (الضرورة المبيحة هي التي يخاف التلف بها إن ترك الأكل)[6]. واتە: ئەو ناچارییەی کە خواردنی حەرام حەڵاڵ دەکات ئەوەیە کەسەکە ترسی تیاچوونی هەبێت ئەگەر حەرامەکە نەخوات. دەشڵێن: (فالضرورة بلوغه حداً إن لم يتناول الممنوع هلك أو قارب (الهلاك) كالمضطر للأكل، واللبس بحيث لو بقي جائعاً أو عرياناً لمات، أو تلف منه عضو، وهذا يبيح

---

١ – العيني (محمود بن أحمد بن موسى)، البناية شرح الهداية، ج١١، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤٢٠-٢٠٠٠، ص٥١.

٢ – القرافي (محمد بن أحمد بن محمد)، القوانين الفقهية، ص١١٦.

٣ – الدسوقي (محمد بن أحمد بن عرفة)، حاشية الدسوقي على الشرح الكبير، ج٢، دار الفكر، بيروت، ص١١٥.

٤ – الغزالي، الوسيط في المذهب، ج٧، ط١، دار السلام، القاهرة، ١٤١٧، ص١٦٨، تحقيق: أحمد محمود، محمد تامر.

٥ – السبكي (عبد الوهاب بن علي)، الأشباه والنظائر، ج١، دار الكتب العلمية، بيروت، ط١٤١١، ١٩٩١، ص٥٢.

٦ – إبن قدامة، المغني، ج٩، ص٤١٥، مصدر سابق.

تناول المحرم)[1]. واتە: ناچاری ئەوەیە کەسەکە بگاتە ئاستێك ئەگەر حەرامەکە نەکات بمرێت، یان نزیکی مردن بێتەوە، وەك ئەوەی کەسێك زۆر پێویستی بەخواردن، یان پۆشاك بێت، بەشێوەیەك ئەگەر بەبرسێتی یان بەڕووتی بمێنێتەوە بمرێت، یان ئەندامێکی جەستەی لەدەست بدات، لەم حاڵەتەدا ڕێگە بە خواردن یان بەکارهێنانی حەرام دەدرێت.

کەواتە وبەپێی بۆچونی زانایانی هەر چوار مەزهەبەکە کاتێك مرۆڤ بەناچار ئەژمار دەکرێت وبۆی هەیە حەرامەکان بەکاربهێنێت، کە ژیانی یان ئەندامێکی هەستیاری جەستەی لەمەترسییدا بێت، نەك هەرکەسە وبۆخۆی وبەکەیفی خۆی بڕیاری ناچاری بۆ خۆی بدات، وحەرام بۆ خۆی حەڵاڵ بکات.

## سێیەم: مەرجەکانی حاڵەتی ناچاری:

کارکردن بە ڕێسای (الضرورات تبیح المحظورات). (ناچاری حەرام حەڵاڵ دەکات) هەروا ڕەها وئاسان نییە؛ بەڵکو پێویستی بەهاتنەدی کۆمەڵێك مەرجی شەرعی هەیە وبێ دەستەبەربوونی ئەو مەرجانە کاری پێ ناکرێت؛ بۆیە لەم بەشەدا قسە لەسەر ئەو مەرجانە دەکەین وپاشان بەراوردیان دەکەین بەحاڵەتی ئەو کەسانەی کە پێشینەی خانووبەرەیان وەرگرتوە بەسوو، بەبیانووی سوود وەرگرتن لەو ڕێسا شەرعییە، تا بزانین تاچەند پاساوەکەیان شەرعی ودروستە.

بۆیەیش بەراوردی بەو کەسانە دەکەین کە پێشینەی خانوویان وەرگرتوە؛ چونکە پاساوی نەبوونی خانوو لەهەموو ئەو پاساوانەی تری وەکو کڕینی ئۆتۆمبێل و پرۆژەکانی کشتوکاڵی، یان پیشەسازی لەپێشترە وئەگەر سوو بۆ پێشینەی خانوو دروست نەبێت، ئەوە بەدڵنیاییەوە بۆ هیچ کام لەو پرۆژانەی تر دروست نییە وپێویست ناکات قسەی لەسەر بکرێت.

گرنگترینی ئەو مەرجانەی کەزانایان بۆ کارپێکردنی ئەو ڕێسا شەرعییە باسی دەکەن ئەمانەن:

---

١ - الزركشي (بدر الدين بن محمد)، المنثور في القواعد الفقهية، ج٢، ط٢، وزارة الأوقاف الكويتية، ١٩٨٥، ١٤٠٥، ص٣١٩.

١- دەبێت ناچارییەکە مەترسی بۆ سەر ژیانی، یان لەدەستدانی ئەندامێکی جەستەی دروست بکات. بۆ نموونە: کەسێك تووشی نەخۆشییەکی قورس بووە وپێویستی بەنەشتەرگەرییەکی خێرا هەیە وئەگەر بۆی نەکرێت لەوانەیە بمرێت یان تووشی کەمئەندامی بێت، کەسەکە هیچ پارەی نییە، وکەسیش نەخێری پێ دەکات، ونەقەرزیشی لەبەر خوا دەداتێ، لەم کاتەدا ئەم کەسە بۆ ڕزگارکردنی ژیانی یان سەلامەتی جەستەی بۆی هەیە پەنا بۆ سوو ببات.

ئێستا پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە: باشە ئەگەر گریمان بوونی خانوو حاڵەتی ناچارییە، ئایا ئەو کەسانەی پێشینەی خانووبەرەیان بەسوو وەرگرت، بەو شێوەیە ژیانی خۆیان یان ماڵ ومنداڵیان لەمەرتسیدا بوو؟!. ئایا ماڵ و منداڵەکانیان لەسەر جادە ولەبەر باران وهەتاو بوون کە ئەگەر ئەو پارەیەیان وەرنەگرتایە بمردنایە یان تووشی کەمئەندامی ببونایە؟!!. ئەمە لەکاتێکدا کە دابینکردنی شوێنی نیشتەجێبوون هەر لەبنەڕەتدا ناچێتە ژێر ئەم خانەیەوە؛ چونکە زانایان بوونی خانوو بەحاڵەتی پێویستی (حاجة) دادەنێن، نەك ناچاری (ضرورة).

کۆمکاری فیقهی ئیسلامی لە خولی شەشەمیدا دەربارەی خانوو دەڵێت: (أولا: إن المسكن من الحاجات الأساسية للإنسان، وينبغي أن يوفر بالطرق المشروعة بمال حلال، وإن الطريقة التي تسلكها البنوك العقارية والإسكانية ونحوها، من الإقراض بفائدة قلت أو كثرت، هي طريقة محرمة شرعا لما فيها من التعامل بالربا)[1]. واتە: خانوو یەکێکە لە پێویستیە سەرەکییەکانی ژیانی مرۆڤ وپێویستە بەرێگەی شەرعی و بە پارەی حەڵاڵ دابین بکرێت، ئەو ڕێگەیەی کە بانکەکانی خانووبەرە ونیشتەجێبوون دەیگرنە بەر بە پێدانی قەرز بەسوو کەم بێت یان زۆر ڕێگەیەکی حەرامە ودروست نییە؛ چونکە مامەڵەی بەسوو تێدایە.

٢- دەبێت هیچ ڕێگە چارەیەکی حەڵاڵ بۆ چارەسەری کێشەکە نەمێنێتەوە، ئەوجا پەنا ببرێتە بەر حەرام لەحاڵەتی ناچاریدا، بۆ نموونە: کاتێك ئافرەتێك نەخۆش دەکەوێت و نەخۆشییەکەیشی مەترسیدارە و پێویستی بەچارەسەری خێرا هەیە، هەتا پزیشکێکی

---

١ - مجلة المجمع، ع٥، ج٤، ص٢٧٧٣، ع٦، ج١، ص٨١، رقم القرار ٥٠ (١/ ٦).

ئافرەتی پسپۆڕ لەبواری نەخۆشیەکەیدا هەبێت، نابێت بڕواتە لای پزیشکی پیاو؛ چونکە حاڵەتی ناچارییەکە بەپزیشکێکی ئافرەت لادەچێت.

لێرەشدا دەکرێت بپرسین ئایا ئەوانەی پارەیان بە سوو وەرگرت بە پاساوی خانوو کردن سەرەتا هەموو ڕێگە شەرعییەکانیان تاقی کردەوە ئەوجا پەنایان بردە بەر سوو؟!!

بۆ نموونە ڕێگەی زەکات، یان هەر خێرێکی تر، یان قەرزی بەبێ سوو، یان خانووی کرێ، یان تەنانەت سواڵ، ئەگەر هەموو ئەم ڕێگانەیان تاقیکردۆتەوە و سوودی نەبووە و ژیانی ماڵ و منداڵیان لە مەترسیدا بووە، ئەو کات پەنایان بردۆتە بەر سوو، ئەو کات بابەتەکە قسە هەڵدەگرێت. بەڵام من دڵنیام هیچ کام لەوانە ئەو ڕێگانەیان تاقی نەکردۆتەوە و هەر سەرەتا پەنایان بردۆتە بەر سوو بە پاساوی ناچاری.

پێشەوا ئەحمەد لەو بارەیەوە دەڵێت: (لا تحل الميتة لمن قدر على دفع ضرورته بالمسألة)[1]. واتە: گۆشتی مردارەوەبوو بۆ کەسێك حەڵاڵ نییە کەبتوانێت بە پارەی سواڵ خواردنی دەستبکەوێت.

٣- دەبێت کەسی ناچار بەقەدەر پڕکردنەوە ولاچوونی حاڵەتی ناچارییەکەی حەرامەکە بەکار بهێنێت، نەك هەتا تاقەتی لێی دەچێت، چونکە ڕێسایەکی شەرعیی ترمان هەیە کە تەواوکەری ڕێسای: (الضرورات تبيح المحظورات) ە، دەڵێت (الضرورات تقدر بقدرها). واتە: حاڵەتی ناچاری بەقەدەر لاچوونی ناچارییەکە ڕێگەی پێ دەدرێت. بۆ نموونە: کاتێك نەخۆشێکی ئافرەت دەچێتە بەردەم پزیشکێکی پیاو وپێویستی بەچارەسەری کتوپڕ هەیە ولەو کاتەیشدا هیچ پزیشکی ئافرەت دەستناکەوێت، پزیشکە پیاوەکە بۆی هەیە ئەوەندەی جەستەی نەخۆشەکە ببینێت کە بۆ چارەسەرییەکەی پێویستە، خۆ نابێت ڕووتی بکاتەوە وبڵێت: (ناچاری حەرام حەڵاڵ دەکات) ئەمە لەهیچ شوێنێکی شەرعدا جێی نابێتەوە. یان کەسێك کە نزیکە لە برسا بمرێت و هیچ خواردنی حەڵاڵی دەست ناکەوێت، بۆی هەیە ئەوەند حەرام بخوات کە لەمردن ڕزگاری بێت، نەك تێری لێ بخوات.

لێرەدا پرسیارەکە ئەوەیە ئەوانەی پارەی سوویان وەرگرتوە بۆ کردنەوەی خانوو، ئایا تێچووی خانووەکانیان بەقەدەر لاچوونی حاڵەتی ناچارییەکەیان بوو؟!. بۆ نموونە: ئەگەر

---

١ - إبن قدامة (عبد الرحمن بن محمد)، الشرح الكبير على متن المقنع، ج١١، دار الكتاب العربي، بيروت، ص٩٨.

ئەمجارەیش گریمان خانوو لەهەرە پێویستییە گرنگەکانی ژیانی مرۆڤە، وکەسەکە هەموو ڕێگەکانی تری حەڵاڵی تاقیکردەوە بۆ کردنەوەی خانوو، بەڵام بێسوود بوو، وەژیانی خۆی وماڵ ومنداڵی لەمەترسیدا بوو، ئایا ناچاری خانوو بە گرتنی خانوویەکی کرێ لانەدەچوو؟! ئایا بە (١٠٠) مەتر زەوی و خانوویەکی گڵ ودوو ژوور لا نەدەچوو ئەگەر لەدەرەوەی شاریش بێت؟!.

چونکە بەداخەوە زۆربەی ئەوانەی ئەو پارەیەیان بەسوو وەرگرتوە و وەردەگرن، خانووەکانیان بەپێی مواسەفات دروستکردوە نەك پێویستی وناچاری، ئەگەر خانووەکانیان ببینی هەمووی کاشی، وسیرامیك، وسەقفی جبسن یان مەغریبی، وپەنجەرەی پلاستیك وئەلەمنیۆم، وسیستەمی ساردوگەرم وچەندین مواسەفاتی تر دروستکردوە.

ئێستا من دەپرسم ئایا دروستە پارەی سوو بۆ ئەو شتانە وەربگیرێت یان خەرج بکرێت؟!. وە ئایا ئەوانە دەچنە خانەی ناچارییەوە؟!.

٤- دەبێت حاڵەتی ناچارییەکە بەشێوەیەك بێت پێویستی بەچارەسەری کتوپڕ وبەپەلە بێت، بۆ نموونە کەسێك برسییەتی بەڵام برسێتییەکەی وانییە کە مەترسی لەسەر ژیانی دروست بکات، ئایا بۆی هەیە حەرام بخوات؟!، بەدڵنیاییەوە نەخێر؛ چونکە لەوانەیە پاش کەمێکی تر خواردنی حەڵاڵی دەستبکەوێت، یان بۆ نموونە: ئافرەتێك کە نەخۆشییەك تووش دێت ئەگەر نەخۆشییەکەی جێی مەترسی نەبوو وە پێویستی بە چارەسەری خێرا نەبوو، لێرەدا شەرعیی نییە پزیشکە پیاوەکە بۆی بکات، هەتا پزیشکێکی ئافرەت دەدۆزینەوە.

زەرکەشی لەو بارەیەوە دەڵێت: (وَالْحَاجَةُ كَالْجَائِعِ الَّذِي لَوْ لَمْ يَجِدْ مَا يَأْكُل لَمْ يَهْلَكْ، غَيْرَ أَنَّهُ يَكُونُ فِي جَهْدٍ وَمَشَقَّةٍ، وَهَذَا لاَ يُبِيحُ الْمُحَرَّمَ، وَالْفَرْقُ بَيْنَ الْحَاجَةِ وَالضَّرُورَةِ، أَنَّ الْحَاجَةَ وَإِنْ كَانَتْ حَالَةَ جَهْدٍ وَمَشَقَّةٍ فَهِيَ دُونَ الضَّرُورَةِ، وَمَرْتَبَتُهَا أَدْنَى مِنْهَا وَلاَ يَتَأَتَّى بِفَقْدِهَا الْهَلاَكُ)[1]. واتە: حاڵەتی پێویستی وەك برسییەك وایە کە ئەگەر شتێکیشی دەستنەکەوێت نەمرێت، بەڵام نارەحەت وماندوو دەبێت، ئەم حاڵەتە حەرام حەڵاڵ ناکات، جیاوازیش لەنێوان حاڵەتی ناچاری وپێویستیدا ئەوەیە، کە هەرچەندە پێویستی نارەحەتی وماندوێتی دروست دەکات بەڵام

١ - الزركشي، المنثور في القواعد الفقهية، ج٢، ص٣١٩، مصدر سابق.

ناگاتە ئاستی ناچاری، وپلەکەی لەخوار ناچارییەوەیە وئەگەریش بەردەست نەبێت کەسەکە تیاناچێت.

ئێستا پرسیارەکە ئەوەیە ئایا ئەوانەی ئەو قەرزەی حکومەتیان وەرگرت بۆ کردنەوەی خانوو، تەواو بێ هیوا بوون لە ڕێگە چارەی حەڵاڵ، وهەر دەیشبوو بەو زووانە خانوو بکەنەوە وئەگەر نەیانکردایەتەوە تیا دەچوون؟ من لێرەدا وەڵامەکەی بۆ خۆیان جێدەهێڵم.

٥- دەبێت حاڵەتی ناچارییەکە ڕاستەقینە بێت وتەنها گومان نەبێت، واتا نابێت کەسەکە خۆی حاڵەتی مەترسییەکە بۆ خۆی دروست بکات، ولەخۆی گەورە بکات.

بۆ نمونە: کەسێك هەست بەبرسێتییەکەی کەم بکات بۆی نییە دەست بۆ خواردنی حەرام ببات تا تەواو برسی دەبێت و ژیانی دەکەوێتە مەترسییەوە ئەوجا بۆی هەیە دەست بۆ حەرام ببات؛ چونکە ئەو حاڵەتە پێی ناگوترێت ناچاری و حەرام حەڵاڵ ناکات و لەوانەیە لەو ماوەیەشدا خواردنی حەڵاڵی دەست بکەوێت و پێویستی بە حەرامەکە نەمێنێت.

ئێستا پرسیارێکی تر ئەوەیە ئایا لەواقیعدا نەبوونی خانوو مەترسی ڕاستەقینە دروست دەکات بۆ سەر ژیانی خەڵك؟! یان خەڵکانێك هەر خۆبەخۆی خۆیان ئەمەیان لەخۆیان کردۆتە حاڵەتی ناچاری؟!.

ئەمانە کۆمەڵێك پرسیارن دەبێت ئەو کەسانەی ئەو سووەیان وەرگرتوە لەئێستاوە وەڵامەکانی بۆ قیامەت وبەردەم دادگاکەی پەروەردگار ئامادە بکەن.

بۆیە من دووبارەی دەکەمەوە ئەرکی هەموولایەکە تا دەتوانین خۆمان لەحەرام بپارێزین و پاساوی کردنی حەرام بۆ خۆمان نەدۆزینەوە و سوود لە ڕێکارە شەرعییەکان وەربگرین بۆ پڕکردنەوەی پێداویستییەکانمان و لەهەوڵی ئەوەدا بین قەناعەت بەحکومەت و کۆمپانیاکان بکەین ئەو مەرجی دانانی سووە لەکاتی دواکەتنی دانەوەی قەرزەکەدا لا ببەن، وپەنا ببەنە بەر ئەو ڕێگە چارە شەرعییانەی کە باسمان کرد، خۆ ئەگەر ئەمەیان نەکرد، ئەوە باشتر وایە ئەو خەڵکانەی ئەو مامەڵانەیان کردوە یان ئەو پارانەیان وەرگرتوە، هەرچەندە سەرەتا تووشی حەرام بوون، بەڵام با ئێستا هەوڵ بدەن هەموو پارەکە بۆ حکومەت یان کۆمپانیا بگێڕنەوە تا دێوەزمەی ئەو حەرامییە کە سەرەتا تووشی

هاتون تاسەر بەردەوام نەبێت وبشگەڕێنەوە بۆ لای خوای گەورە، وخوای گەورە زاتێکی میهرەبان ولێخۆشبووە.

چوارەم: جیاوازی نێوان حاڵەتی ناچاری (الضرورة) و پێویستی (الحاجة):

پاش ئەوەی مەرجەکانی حاڵەتی ناچاریمان باسکرد، ئێستا باس لە خاڵە جیاوازەکانی نێوان حاڵەتی پێویستی وحاڵەتی ناچاری دەکەین، چونکە بەداخەوە زۆرێك لەو بەڕێزانەی فەتوای حەلاڵی ئەم حاڵەتەیان داوە، یان بۆخۆیان حەلاڵ کردوە، وەك پێویست جیاکارییان لەنێوان ئەم دوو حاڵەتەدا نەکردوە. بۆیە من بەپێویستی دەزانم لێرەدا خاڵە جیاوازەکانی نێوانیان ڕوون بکەینەوە کە گرنگترینیان ئەمانەن:

١- لەحاڵەتی ناچاریدا مرۆڤ ژیانی یان ئەندامێکی جەستەی دەکەوێتە ژێر مەترسی لەدەستدانەوە، بەڵام پێویستی تەنها بۆ بارسووکی وئاسانکاری کردنە، وئەگەریش نەکرێت هیچ مەترسی نییە، ئیمامی شافیعی دەفەرموێت: (وليس يحل بالحاجة محرّم إلاّ في الضرورات)[١].

واتە: هیچ حەرامێك بۆ حاڵەتی پێویستی حەلاڵ ناکرێت تەنها لە حاڵەتی ناچاریدا دەکرێت.

٢- لەحاڵەتی ناچاریدا مرۆڤ جگە لەکردنی حەارم هیچ ڕێگەی تری لەبەردەمدا نامێنێتەوە، بەڵام لەحاڵەتی پێویستیدا مرۆڤ ڕێگەی تری لەبەردەمدایە وناچار نییە حەرامەکە بکات.

٣- حاڵەتی ناچاری ئەو حەرامانە حەلاڵ دەکات کە بۆ خودی خۆیان حەرامن (المحرم لذاته)[٢]، بەڵام حاڵەتی پێویستی تەنها ئەو حەرامانە حەلاڵ دەکات، کە حەرامەکە لەدەرەوەی شتەکە خۆیەتی (المحرم لغيره)[٣]. وەکو ڕێسا شەرعییەکە دەڵێت: (المحرم لذاته لا يباح إلا للضرورة، و المحرم لغيره يباح للحاجة). واتە: ئەو شتانەی بۆ خۆیان حەرامن

---

١ - الشافعي (محمد بن إدريس)، الأم، ج٣، دار المعرفة، بيروت، ١٤١٠-١٩٩٠،ص٢٨.

٢ - بەو حەرامانە دەگوترێت کەشتەکە خۆی لەخۆیدا حەرامە، وەکو: زینا، عارەق، سوو، دزی، کوشتن.

٣ - بەو حەرامانە دەگوترێت کە شتەکە خۆی لەخۆیدا حەرام نییە؛ بەڵکو بەهۆی سیفەتێکی دەرەکییەوە حەرام کراوە وەکو: نوێژ کردن لەزەوییەکی داگیرکراودا، یان کڕین وفرۆشتن لەکاتی نوێژی هەینیدا؛ چونکە نوێژ کردن، وکڕین وفرۆشتن بۆ خۆیان کێشەیەکیان نییە؛ بەڵام بەهۆی ئەوەی نوێژەکە لەزەوییەکی داگیرکراودا کراوە وکڕین وفرۆشتنەکەیش لەکاتی نوێژی هەینیدا بووە، ئەوە هەردوو کارەکە حەرام دەبن؛ بەڵام چونکە حەرام بوونەکە بەهۆکارێکی دەرەکییەوە بووە پێی دەگوترێت: (محرم لغيره).

تەنها بۆ حاڵەتی ناچاری حەڵاڵ دەبن، بەڵام ئەو شتانەی کە بەهۆی شتێکی دەرەکییەوە حەرامن بۆ حاڵەتی پێویستی حەڵاڵ دەبن.

بۆیە کەسێك پێی وابێت سوو بۆ حاڵەتی پێویستی حەڵاڵ دەبێت، دەبێت بڵێت سوو لەجۆری (محرم لغيره) یە ولەبنەڕەتدا حەڵاڵە بەڵام بەبوونی هۆکاری دەرەکی حەرام دەبێت. هەرکەسیش ئەلف وبێی شەرع بزانێت قسەی وا ناکات.

٤- ناچاری حەرام حەڵاڵ دەکات، جا ناچارییەکەی لەسەر ئاستی تاك بێت یان کۆمەڵ جیاوازیی نییە، بەڵام پێویستی حەرام حەڵاڵ ناکات مەگەر پێویستییەکە گشتی ولەسەر ئاستی کۆمەڵ بێت.

٥- حاڵەتی ناچاری کاتییە، بەڵام حاڵەتی پێویستی بەردەوامی هەیە.

٦- حاڵەتی ناچاری کەسەکە خۆی هەستی پێ دەکات وبڕیاری لەسەر دەدات، بەڵام پێویستی دەبێت زانایان هەڵسەنگاندنی بۆ بکەن وبڕیاری لەسەر بدەن[(١)].

ئێستا و بە بەراوردکردنی ئەو خاڵانە لەگەڵ یەکتر، شتێکمان بۆ ڕوون بۆوە کە ئایا ئەو قەرز وپێشینانەی خەڵکی بەسوو وەریان گرتوون یان دەگرن بەهۆی ناچارییەوە بووە یان پێویستی.

---

١ - عبد الله بن بيه، في بحث بعنوان: الفرق بين الضرورة والحاجة تطبيقا على بعض أحوال الأقليات المسلمة، ص١٢١- ١٥٦.

## بەشی حەوت[1]

## مامەڵە بانکییەکان

ئەو بوارانەی کە بانك بەشێوەیەکی سەرەکی کاریان تێدا دەکات دەبن بەدوو بەشەوە:

١- مامەڵە بانکییەکان: ئەوانیش بریتین لەو خزمەتگوزاریانەی بانك پێشکەشی هاووڵاتیانی دەکات لەبەرامبەر پارەیەکی دیاریکراودا، کە گرنگترینیان ئەمانەن: بارمتەنامە (خطاب الضمان)، ئەژماری پاشەکەوت (حساب التوفیر، جاری مدین)، ئەژماری ڕەوان (الحساب الجاری).

٢- مامەڵەی گۆڕینەوەی پارە (الصرف) ئەمیش یان دەست بەدەست دەکرێت، یان لەڕێگەی دەفتەری چەکەوە دەگوازرێتەوە بۆ شوێنەکانی تر[2].

لە کۆی ئەو کار وچالاکیانەی بانك ئەنجامی دەدات ئەوەی گرنگە بەلای ئێمەوە ئەوانەن کەپەیوەندی ڕاستەوخۆیان بەباسەکەی ئێمەوە هەیە کە ئەمانەن:

یەکەم: بارمتەنامە (خطاب الضمان).

دووەم: ئەژماری پاشەکەوت (حساب التوفیر، جاری مدین).

سێیەم: ئەژماری ڕەوان (الحساب الجاری).

### یەکەم: بارمتەنامە (خطاب الضمان):

ئەمە یەکێکە لەو شتانەی کە زۆربەی کۆمپانیاکانی ئەمڕۆ کاری پێدەکەن، وە حکومەت بۆ وەرگرتنی تەندەر یان بۆ هەر پرۆژەیەکی ئاشکراو نهێنی داوای دەکات.

بیرۆکەی بارمتەنامە بەشێوەیەکی سادە بریتییە لەوەی کاتێك وەبەرهێنەرێك دەیەوێت تەندەر پێشکەش حکومەت بکات، بەمەبەستی وەرگرتنی پرۆژەیەك، یان هەر

---

١ - ئەم بەشە ڕۆژی (٢٠١٥/١/١٧) تۆمار کرا، هەرچەند دەبوو (٢٠١٥/١/١٠) تۆمار بکرێت؛ بەڵام لەبەر بەفر وناسازی کەشوهەوا هەفتەیەك دواخرا.

٢ - ئەم بابەتە دواتر ولەکاتی قسەکردن لەسەر سووی کڕین وفرۆشتن قسەی لەسەر دەکەین.

کارێکی تر، حکومەت داوا لە دامەزراوەیەکی دارایی باوەڕپێکراو دەکات کە لەڕووی داراییەوە پشتگیری ئەو کەسە یان کۆمپانیاکەی بکات بەبڕی پارەی دیاریکراو، وبەم پشتگیریە دەگوترێت بارمتەنامە (خطاب الضمان) و هەرکات ئەو کەسە یان کۆمپانیاکەی ئەرکەکانی خۆی وەکو پێویست جێبەجێ نەکرد، حکومەت لێپێچینەوە لەگەڵ بانکەکە دەکات، وهەموو زیانەکانی پرۆژەکە وئەرکە داراییەکانی دەخاتە ئەستۆی ئەو.

بارمتەنامە چوار بنەمای سەرەکی هەیە کە بریتین لە:

١- بارمتەکار (الضامن): ئەو بانکە یان دامەزراوە داراییەیە کە بەڵێن دەدات بەحکومەت بەپێدانی بڕێك پارەی دیاریکراو، لەبری بەڵێندەرەکە (المقاول) لەماوەیەکی دیاریکراودا، ئەگەر بەڵێندەرەکە کار وئەرکە یاساییەکانی خۆی جێبەجێ نەکرد.

٢- بارمتەکراو (المضمون عنه): ئەو بەڵێندەرەیە کە بانك لەبری ئەو بەڵێن دەدات بەپێدانی بڕێك پارەی دیاریکراو، لەکاتی جێبەجێ نەکردنی ئەرکەکانی لەڕووی یاساییەوە.

٣- بارمتە بۆکراو (المضمون له): حکومەت یان ئەو لایەنەیە کە داوای بارمتەنامەکە دەکات.

٤- نرخی بارمتەکە (قيمة الضمان): ئەو بڕە پارەیەیە کە لە بارمتەنامەکەدا نووسراوە ودەبێت بانك بیداتە حکومەت، ئەگەر بەڵێندەرەکە ئەرکە یاساییەکانی خۆی جێبەجێ نەکرد.

بارمتەنامە لەڕووی کاتەوە دوو جۆری هەیە:

١- بارمتەنامەی سەرەتایی: ئەم جۆرە بارمتەنامەیە بۆ ئەو کاتەیە کە سەرەتا کۆمپانیاکان تەندەرەکان پڕ دەکەنەوە وپێشکەشی حکومەتی دەکەن و بڕەکەی بە لە (٪١) تێچووی پرۆژەکەیە وماوەکەشی کەمە؛ چونکە تا ئەو کاتەیە کە ئەنجامی پرۆژەکە یەکلا دەبێتەوە، کە بۆ چ کەسێك یان کۆمپانیایەك دەردەچێت.

٢- بارمتەنامەی کۆتایی: ئەم جۆرەیان بۆ ئەو کاتەیە کە پرۆژەکە بۆ کۆمپانیایەك دەردەچێت و حکومەت داوای بارمتەنامەی لێ دەکات، تا کاتی کۆتایی هێنانی پرۆژەکە وتەواو کردنی، ئەم جۆرە بارمتەنامەیە بە بڕی تێچووی لە (٪٥) پرۆژەکە دەبێت یان زیاتر.

لەڕووی بوونی هەبوو (رصید) ە وە بارمتەنامە سێ جۆری هەیە:

١- بارمتەنامەیەك بە هەبوو (رصید) ی تەواو: (خطاب بغطاء کامل): لەم جۆرە بارمتەنامەیەدا کەسی بەڵێندەر تەواوی ئەو بڕە پارەیە لەبانك دادەنێت کە لە بارمتەنامەکەدا تۆمار کراوە، یان بایی ئەو بڕە پارەیە موڵکێك دەخەوێنێت لەبەرژەوەندی بانك.

٢- بارمتەنامەیەك بە بەشێك لەهەبوو (رصید) ی داواکراو: (خطاب بغطاء جزئی): لەم جۆرە بارمتەنامەیەدا کەسی بەڵێندەر بەشێك لەو بڕە پارەیە لای بانك دادەنێت کە بانك بارمتەنامەکەی پێ دەنووسێت.

٣- بارمتەنامەیەك بەبێ هەبوو (رصید)، (خطاب بدون غطاء): لەم جۆرەیاندا کەسی بەڵێندەر هیچ پارەیەك لای بانك دانانێت، وهیچ موڵکێکیش لەبەرژەوەندی بانك ناخەوێنێت.

سەبارەت بەحوکمی شەرعی بارمتەنامە، گرنگە ئەوە بزانین کە بۆ دۆزینەوەی حوکمی شەرعی بۆ هەر بابەتێك سەرەتا پێویستە لێی تێبگەین و وردەکارییەکانی پێکهاتە، وناوەڕۆك، شوێنەوارەکانی بزانین، ئەوجا دەتوانین قسەی لەسەر بکەین وبڕیاری لەسەر بدەین؛ چونکە وەکو زانایان دەفەرموون (الحکم علی الشئ جزء من تصوره). واتە: بڕیار دان لەسەر هەر شتێك بەشێکە لەشێوازی لێتێگەیشتنی.

بۆیە ئێمە بەر لەوەی بڕیار لەسەر حوکمی بارمتەنامە بدەین، پێیوستە بزانین ئەم جۆرە مامەڵەیە لەگەڵ کام جۆر لە مامەڵە شەرعییەکان یەك دەکاتەوە.

ئایا ئەم جۆرە مامەڵەیە کاتی خۆی هەبووە وزانایان قسەیان دەربارەی کردووە؟ ئەگەر هەبووە کام جۆرە مامەڵەیەیە؟ ئایا ئەمە کەفالەیە؟ یان قەرزە؟ یان ڕەهنە؟ یان بریکارییە؟ یان شتێکی ترە؟.

خۆ ئەگەر لەوانە بێت ئەو کات پێی دەگوترێت: گرێبەستە ناوبراوەکان (العقود المسماة) وحوکمەکەی دیارە.

خۆ ئەگەریش بارمتەنامە بەو شێوازەی ئەمرۆ لەشەرعدا ناونەبراوە وشتێکی تازەیە وکاتی خۆی نەبووە، ئەو کات پێی دەگوترێت گرێبەستە داهاتووەکان (العقود المستحدثة) ودەبێت لەژێر رۆشنایی بنەما ودەقە شەرعییەکانی تردا بڕیاری لەسەر بدەین.

هەرچەندە زانایانی هاوچەرخ دەبارەی پۆلێن کردنی بارمتەنامە بۆچوونیان جیاوازە؛ بەڵام دەکرێت کۆی بۆچوونەکانیان لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا کۆ بکرێتەوە:

١- بارمتەنامە خۆی لەخۆیدا کارێکی شەرعییە، جا چ لەیەکێك لەو مامەڵانە بچێت کەکاتی خۆی زانایان قسەیان لەسەر کردوە ورێگەیان پێداوە، یان مامەڵەیەکی نوێ وهاوچەرخ بێت.

٢- لەهەموو جۆرە بارمتەنامەکاندا ئەو لایەنەی بارمتەنامەکە دەردەکات بۆی هەیە خەرج وتێچووی بارمتەنامەکە هەر چەند وهەرچی بێت وەربگرێتەوە، بەمەرجێك تێچووی خەرجییەکان لەراستیدا وابن، وبەناوی خەرجییەوە پارەی زیاتر وەرنەگرێت.

٣- ئەگەر بارمتەنامەکە هەبوو (رصيد) تەواوی هەبوو، یان بەشێك لە هەبوو (رصيد) ی هەبوو، جا ئەو هەبووە (رصيد) ە پارە یان موڵك یان هە شتێکی تر بێت، ئەوە ئەو لایەنەی بارمتەکە دەردەکات بۆی نییە، ئەو شتە لەبەرژەوەندی خۆی بەکار بهێنێت، وسوودی لێ ببینێت، چونکە حوکمی رەهنی هەیە وتەنها بۆی هەیە تاکاتی لەکار خستنی بارمتەنامەکە دەستی بەسەردا بگرێت، بۆ زامن کردنی مافە داراییەکانی خۆی.

٤- ئەگەر بارمتەنامەکە هەبوو (رصيد) ی تەواو هەبوو: ئەو کات ئەو لایەنەی بارمتەنامەکە دەردەکات بۆی هەیە پارە یان شتێکی تر لەبەرامبەر پێدانی بارمتەناکەدا وەربگرێت، چونکە لەو حاڵەتەدا کردنی بارمتەنامەکە وەکو بریکاری (وكالة) ی لێدێت، ودروستیشە بانك پارە لەسەر ئەو بریکارییەی وەربگرێت، وهیچ کێشەی نییە.

٥- ئەگەر بارمتەنامەکە بەشێك لەهەبوو (رصيد) ی داواکراوی هەبوو: ئەوکات وەکو گرێبەستێکی تێکەڵی لێدێت لەنێوان (كفالة) و (وكالة) دا، وبانك دەتوانێت لەبەرامبەر راپەڕاندنی ئەرکەکانی ئەو بەشەی هەبوو (رصيد) ی هەیە پارە وەربگرێت، بەڵام بۆ ئەو بەشەی کە هەبوو (رصيد) ی نیە، ناتوانێت هیچ وەربگرێت، جگە لەخەرجییەکانی مامەڵەی بارمتەنامەکە نەبێت.

٦- ئەگەر بارمتەنامەکە هیچ هەبوو (رصید) ی نەبوو: لەم حاڵەتەدا بارمتەنامەکە دەقاودەق وەکو (کفالة) وایە، وهەمان حوکمی ئەو وەردەگرێت، ودروست نییە بانك لەبەرامبەر پێدانی بارمتەنامەکدا هیچ وەربگرێت، جگە لەو خەرجییانەی کە بۆ پێدان وبەدواداچوونی بارمتەنامەکە پێویستە؛ چونکە (کفالة) وەکو قەرز وایە ونابێت هیچ سوودێك بۆ کەسی (کفیل) ڕابکێشێت، وئەگەر وابوو دەبێتە سوو، ئەوە جگە لەوەی کە (کفالة) یەکێکە لەو هەڵسوکەوتانەی کەلەڕووی شەرعەوە خۆبەخشانەیە ونابێت هیچی لەبەرامبەردا وەربگیرێت.

ئیبن المنذر دەربارەی (کفالة) دەڵێت: (أجْمَع مَن نحفظ عنه مِن أهل العلم على أنَّ الحَمَالة بجُعْل يأخذه الحميل، لا تَحِلُّ ولا تجوز)[١]. واتا: هەموو ئەوانەی کەئێمە زانستمان لێوەرگرتون ولێیانەوە فێربووین هاوڕان لەسەر ئەوەی کەفالەت کردن لەبەرامبەر بڕە پارەیەکدا کە کەسی (کفیل) وەری بگرێت، دروست نیە ونابێت.

ئیبن نوجەیم یش دەڵێت: (الْكَفِيلَ مُقْرِضٌ فِي حَقِّ الْمَطْلُوبِ، وَإِذَا شَرَطَ لَهُ الْجُعْلَ مَعَ ضَمَانِ الْمِثْلِ فَقَدْ شَرَطَ لَهُ الزِّيَادَةَ عَلَى مَا أَقْرَضَهُ فَهُوَ بَاطِلٌ؛ لِأَنَّهُ رِبًا)[٢]. واتە: کەسی (کفیل) وەکو کەسی قەرزدەر وایە، بەو کەسەی قەرزەکەی لایە، وەئەگەر مەرجی شتێکی دانا زیاد لە بڕی قەرزەکە، ئەو کات وەك ئەوە وایە زیاتر لەقەرزەکەی وەرگرتبێتەوە، وئەوەیش دروست نییە؛ چونکە دەبێتە سوو.

خۆ ئەگەر بەراوردی مەرجەکانی پێدانی بارمتەنامە بکەین لەبانکەکانی عێراق وهەرێمی کوردستان بەو مەرجانەی کەپێشتر باسمان کرد، بۆمان دەردەکەوێت کە هەموو ئەو بارمتەنامانەی ئەمڕۆ بانکەکان دەیدەن حەرامن ودروست نییە وەربگیرێن؛ لەبەر ئەوەی بانك بەڕێژەی (٠١٪) پارە لەبەرامبەر دەکردنی بارمتەنامەکەدا وەردەگرێت، جگە لەوەیش بڕی (١٣٪) سوودی دواکەوتنی ساڵانە دەخاتە سەر بارمتەنامەکان.

---

١ - إبن المنذر (أبو بكر محمد بن إبراهيم)، الإشراف على مذاهب العلماء، ج٦، ط١، مكتبة مكة الثقافية، رأس الخيمة، ١٤٢٥، ٢٠٠٤، ص٢٣٠، تحقيق: صغير أحمد الأنصاري.

٢ - إبن نجيم، البحر الرائق شرح كنز الدقائق، ج٦، ص٢٤٢، مصدر سابق.

ئەم دوو مەرجەیش پێچەوانەی ئەو مەرجانەن کەپێشتر باسمان کردن ودەبنە سوو[1].

## دووەم: ئەژماری پاشەکەوت (حساب التوفیر، جاری مدین):

مەبەست لە ئەژماری پاشەکەوت ئەوەیە کەسێك پارە لای بانك دادەنێت بەمەبەستی قازانج کردن وسوو وەرگرتن، بانکیش ئەم پارانە بەرێژەیەکی سوو دەداتەوە خەڵکانی وەبەرهێن، بۆ نموونە بانك بە لە (٪٦) ی سوو ئەو پارانە لە خاوەن دەسمایەکان وەردەگرێت و پاشان بانك بە (٪١١) ی سوو ئەو پارانە دەداتەوە کۆمپانیا و خەڵکانی وەبەرهێن. دواتر بانك لە (٪٦)ی سووەکە دەداتە خاوەنی پارەکە و (٪٥) یشی بۆ خۆی هەڵدەگرێت، ئەمە ئەگەر پارەکە پاشەکەوت (توفیر) بێت.

---

١ - ئەمەیش دەقی بڕیاری کۆمکاری فیقهی ئیسلامییە لەسەر حوکمی بارمتەنامە:

قرار المجمع الفقهي الإسلامي المنبثق عن منظمة المؤتمر الإسلامي، والمنعقد في جدة في ٢٢-١٩٨٥/١٢/٢٨م حول خطاب الضمان:

أولا: إن خطاب الضمان بأنواعه الابتدائي والانتهائي لا يخلو إما أن يكون بغطاء أو بدونه فإن كان بدون غطاء فهو ضم ذمة الضامن إلى ذمة غيره فيما يلزم حالا أو مآلا وهذه هي حقيقة ما يعنى في الفقه الإسلامي باسم (الضمان) أو(الكفالة) وإن كان خطاب الضمان بغطاء فالعلاقة بين طالب خطاب الضمان ومصدره هي:(الوكالة) والوكالة تصح بأجر أو بدونه مع بقاء علاقة الكفالة لصالح المستفيد (المكفول له).

ثانيا: إن الكفالة هي عقد تبرع يقصد للإرفاق والإحسان وقد قرر الفقهاء عدم جواز أخذ العوض على الكفالة؛ لأنه في حالة أداء الكفيل مبلغ الضمان يشبه القرض الذي جر نفعا على المقرض وذلك ممنوع شرعا. ولذلك فإن المجمع قرر ما يلي:

أولا: إن خطاب الضمان لا يجوز أخذ الأجر عليه لقاء عملية الضمان (والتي يراعي فيها إعادة مبلغ الضمان ومدته) سواء أكان بغطاء أم بدونه.

ثانيا : أما المصاريف الإدارية لإصدار خطاب الضمان بنوعيه فجائزة شرعا مع مراعاة عدم الزيادة على أجر المثل، وفي حالة تقديم غطاء كلي أو جزئي يجوز أن يراعي في تقدير المصاريف لإصدار خطاب الضمان ما قد تتطلبه المهمة الفعلية لأداء ذلك الغطاء، وهذا ما ذهبت إليه اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والافتاء، وذلك للأمور التالية:

١-إن أخذ المصرف مالا في مقابلة الضمان ،والضمان من باب المعروف الذي يبذل ابتغاء الثواب من الله، وقد قرر الفقهاء عدم جواز أخذ العوض على الضمان، لأنه في حالة أداء الضامن مبلغ الضمان يشبه القرض الذي جر نفعا على المقرض وذلك ممنوع شرعا.

٢- إن المصرف قد ينتفع بالغطاء، والغطاء هنا من باب الرهن، فكان انتفاع المرتهن به محرما حيث لم يكن ظهرا يركب بنفقته أو ذا در يحلب بنفقته.

خۆ ئەگەر ئەسپاردە (ودیعة) بێت[١]، ئەمەش دوو بەشە: دانراوی جێگیرمان هەیە بۆ ماوەی شەش مانگ وبانك (٩٪) ی سوو دەداتە خاوەنەکەی، و هەیشمانە بۆ ماوەی ساڵێکە وبانك (١٠٪) ی سوو دەداتە خاوەنەکەی.

کەواتە دانانی پارە بەم شێوازە سوویەکی ئاشکرایە، وپێویست بە بەڵگە ناکات.

## سێیەم: ئەژماری ڕەوان (الحساب الجاري):

ئەژماری ڕەوان بریتییە لەوەی کەسێك پارەیەك لە بانك دادەنێت وەکو ئەمانەت وبەمەبەستی پاراستنی، وهیچ قازانجێکی لەسەر وەرناگرێت، وهەرکاتیش بیەوێت پارەکەی ڕادەکێشێتەوە.

لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێت ئەویش ئەوەیە: ئایا ئەو پارانەی وەکو ئەژماری ڕەوان دادەنرێت، بەقەرز ئەژمار دەکرێن لای بانك، یان بە ئەسپاردە (ودیعة)؟.

زۆربەی زانایانی هاوچەرخ بە کۆمکاری فیقهی ئیسلامیشەوە پێیان وایە ئەو پارانە حوکمی قەرزیان هەیە، وبانك بەقەرزار ئەژمار دەکرێت، وخاوەن پارەکەیش بەخاوەن قەرز[٢].

کەمینەیەکیش لەزانایان پێیان وایە ئەو پارانە حوکمی ئەسپاردە (ودیعة) یان هەیە وبەقەرز ئەژمار ناکرێن.

جیاوازی نێوان قەرز و ئەسپاردەیش لەم چەند خاڵەدایە:

١- لەڕووی خاوەندارێتییەوە: لەقەرزدا خاوەندارێتی ئەو شتەی دەدرێت بەقەرز دەگوازرێتەوە بۆ کەسی قەرزدار؛ بەڵام لە ئەسپاردەدا ئەو شتەی ئەسپاردەی کەسێك دەکرێت خاوەندارێتی شتەکە هەر بۆ خاوەنەکەی دەبێت.

---

١ - جیاوازی ئەسپاردە (ودیعة) لەگەڵ پاشەکەوت ئەوەیە، لە ئەسپاردەدا (ودیعة) خاوەنەکەی ناتوانێت پارەکەی ڕابکێشێتەوە، تا ئەو ماوەیە تەواو نەبێت کە بۆی دانراوە؛ بەڵام لە ئەژماری پاشەکەوتدا کەسەکە هەرکات بیەوێت پارەکەی ڕادەکێشێتەوە.

٢ - لەدەقی بڕیارێکی کۆمکاری فیقهی ئیسلامیدا هاتووە: (الودائع تحت الطلب (الحسابات الجارية)، سواء أكانت لدى البنوك الإسلامية أو البنوك الربوية هي قروض بالمنظور الفقهي، حيث إن المصرف المستلم لهذه الودائع يده يد ضمان لها وهو ملزم شرعا بالرد عند الطلب، ولا يؤثر على حكم القرض كون البنك (المقترض) مليئا).

٢-لەڕووی بەکارهێنان وسوود لێوەرگرتنەوە: لەقەرزدا کەسی قەرزار پارەی قەرزەکە لەبەرژەوەندی خۆی بەکاردەهێنێت؛ بەڵام لە ئەسپاردەدا ئەو کەسەی شتەکەی ئەسپاردە دەکرێت، بۆی نییە لە بەرژەوەندی خۆی بەکاری بهێنێت، تەنها ئەرکی پاراستنی لەسەرە نەك مافی بەکارهێنان.

٣-لەڕووی گەڕاندنەوەو وتیاچوونەوە: لە قەرزدا کەسی قەرزار بەرپرسە لەوەی خودی قەرزەکە یان هاوشێوەکەی بۆ خاوەن قەرزەکە بگێڕێتەوە، وئەویش بەرپرسیارە لەتیاچوونی؛ بەڵام لە ئەسپاردەدا ئەو کەسەی شتەکەمان لا داناوە بەرپرسیار نییە لە تیاچوونی؛ بەڵکو خودی شتەکە دەگێڕێتەوە ئەگەر مابوو، ئەگەریش فەوتا بوو ئەو لێی بەرپرس نیە مەگەر کەمتەرخەمی کردبێت لەپاراستنیدا.

سوودی ئەم بەراوردەیش لەوەدا دەردەکەوێت:

ئەگەر گوتمان ئەو پارانەی وەکو ئەژماری ڕەوان (الحساب الجاري) لای بانك دادەنرێن، حوکمی قەرزیان هەیە، ئەو کات بانك دەتوانێت بەکاریان بهێنێت وبازرگانییان پێوە بکات، ولەتیاچوونیشیان بەرپرس بێت، خۆ ئەگەریش گوتمان تەنها حوکمی ئەسپاردە (ودیعة) ی هەیە، ئەوکات بانك بۆی نییە بەکاریان بهێنێت؛ بەڵکو تەنها ئەرکی پاراستنیان دەکەوێتە ئەستۆی بانك، ولەحاڵەتی تیاچوونیشدا بانك لێیان بەرپرسیار نییە ئەگەر کەمتەرخەم نەبووبێت لەپاراستنیاندا.

بۆچوونی پەسەندیش ئەوەیە کە وەك قەرز ئەژمار بکرێن، تا بانك بتوانێت بەکاریان بهێنێت وسوودیان لێوەربگرێت؛ وبەرپرسیش بێت لە قەرەبووکردنەوەیان لەکاتی تیاچوونیدا، وئیسلامیش لەگەڵ بەگەڕخستنی پارەدایە نەك قۆرخ کردن ودانانی تا زۆرترینی خەڵك سوودی لێ وەربگرێت.

لێرەدا پێویستە خاوەن دەسمایەکان ئاگاداری ئەوە بن پارەکانیان لای ئەو بانکانە دانەنێن کە بەسوو مامەڵە دەکەن؛ چونکە ئەوکات بانك پارەکانی ئەمان لەمامەڵە سووخۆریەکاندا بەکار دەهێنێت، وئەمان دەبنە هاوکاری ئەو تاوانکارییەی ئەوان، ئەگەر چی خۆیشیان پارەی سووەکە وەرنەگرن ولێی سوودمەند نەبن.

# بەشی هەشت[1]

## کاغەزە بازرگانییەکان

کاغەزە بازرگانیەکان (الأوراق التجارية) لەیاسای بازرگانییدا دەبن بەدوو بەشەوە:

١- کاغەزە بازرگانییەکان: کۆمەڵێك کاغەزن کە لەڕووی یاساییەوە جێگەی پارە دەگرنەوە، وبریتین لە: کۆمپیالە (الكمبيالة، السند للأمر)، چەك (الشيك، الصك)، حەواڵە بازرگانییەکان (الحوالات التجارية، السفتجة).

کۆمپیالە وحەواڵەی بازرگانی دوو شتی گشتین و هەموو کەسێك دەتوانێت بیکات، بەڵام دەرکردنی چەك (الشيك) تایبەتە بە بانکەوە وتەنها ئەو ئەتوانێت دەری بکات.

٢- کاغەزە داراییەکان: ئەوانیش فرۆشتنی قەواڵە (السندات) وپشك (الأسهم) دەگرنەوە.

بۆیە لەم بەشەدا قسە لەسەر ئەم بابەتانە دەکەین و حوکمە شەرعییەکانیان ڕوون دەکەینەوە:

یەکەم: کۆمپیالە (الكمبيالات، السند للأمر).

دووەم: چەك (الشيك، الصك).

سێیەم: حەواڵە بازرگانییەکان (الحوالات التجارية).

چوارەم: فرۆشتنی قەواڵەکان (بيع السندات).

پێنجەم: فرۆشتنی پشکەکان (بيع الأسهم).

---

١ - ئەم بەشە ڕۆژی (٢٠١٥/١/٢٤) تۆمار کرا.

**یەکەم: کۆمپیالە (الکمبیالات، السند للأمر):**

کۆمپیالە: بەڵێننامەیەکی نوسراوە کە بەشێوازێکی یاسایی دارێژراوە، وتێیدا نووسەری بەڵێننامەکە – هەر کەس بێت- بەڵێندەدات بەپێدانی بڕێك پارەی دیاری کراو بەکەسێك کە ناوی لەبەڵێننامەکەدا هاتوە، یان ئەو فەرمانی پێ بکات، یان بەهەڵگری بەڵێننامەکە هەرکەس بێت، لەکات وشوێنێکی دیاریکراودا، یان هەرکاتێك کە هەڵگری بەڵێننامەکە بیەوێت، بەم پێیەش کۆمپیالە وئەو کاغەزەی کۆمپیالەکەی تێدا تۆمار دەکرێت، هەمان حوکمی ئەو بڕە پارەیەی هەیە کە لەسەری نوسراوە لەهەموو ڕوویەکەوە.

کۆمپیالەش ڕێگەیەکی ترە لە ڕێگە شەرعی ویاساییەکان بۆ زامنکردنی وەرگرتنەوەی قەرز، وخودی کۆمپیالە خۆی هیچ گرفتێکی شەرعی نییە؛ بەڵام هەندێك جار بەشێوازێکی ناشەرعی مامەڵەی پێوە دەکرێت، وەك ئەم شێوازانەی لە خوارەوە باسی دەکەین.

١- پێدانی کۆمپیالە بەسوو: ئەم شێوازە بەزۆری بانکەکان بەکاری دەهێنن، ئەویش بەوەی کاتێك بانك کۆمپیالە دەداتە بازرگانەکان بەمەبەستی هەناردەکردن وهاوردەکردن بۆ ماوەی شەش مانگ، ڕێژەی (٪١١) سوو دەخاتە سەر بڕی ئەو پارەیەی لەکۆمپیالەکەدا نووسراوە، و (٪١٢) یش سوودی دواکەوتنی دانەوەی کۆمپیالەکە وەردەگرێت. و (٪٢) یش خەرجی زیاد کراوی دەخاتە سەر.

حوکمی وەرگرتنی یان پێدانی کۆمپیالە بەم جۆرە مەرجانە زۆر ڕوونە کە حەرام وقەدەغەیە و سووی تێدایە؛ چونکە وەکو پێشتر گوتمان کۆمپیالە حوکمی پارەی قەرزی هەیە، وبەم پێیەش ئەم جۆرە کۆمپیالانە نەك تەنها لەیەك ڕووەوە بەڵکو لەچەند ڕوویەکەوە سوویان تێدایە.

٢- شکاندنەوەی کۆمپیالە (حسم أوخصم الکمبیالة): ئەمە شێوازێکی ترە لە شێوازە ناشەرعییەکانی بەکارهێنانی کۆمپیالە، کە زۆربەی خەڵکی دەیکەن وتایبەت نییە بەبانکەکانەوە، ویوختەی بیرۆکەکەیش بریتییە لەکڕین وفرۆشتنەوەی کۆمپیالە بەر لەوادەی هاتنی وەرگرتنەوەی قەرزەکە.

بۆ نموونە: کەسێك کۆمپیالەیەك دەداتە کەسێکی تر بۆ ماوەی ساڵێك بەبڕی (١٠.٠٠٠$) لە بەرامبەر مامەڵە یان قەرزێکدا، هەڵگری کۆمپیالەکە پاش ماوەیەك پێویستی

بەو پارەیە دەبێت، کە هێشتا کاتی وەرگرتنەوەی نەهاتووە وزۆری ماوە، بۆیە دەچێت بە مامەڵەیەك کە پێی دەگوترێت (تطهير) کۆمپیالەکە دەفرۆشێتەوە بەکەسێکی تر بەپارەیەکی کەمتر لەوەی کە لە کۆمپیالەکەدا نووسراوە، بۆ نموونە دەیفرۆشێت بە (٩٠٠٠$)، ئەوەیشی دەیکرێت بەو پارەیە دەچێت پاش ماوەیەکی تر دەیفرۆشێتەوە بەپارەیەکی زیاتر ودەیدات بە (٩٥٠٠$)، وئەم کەسەیش پاش ماوەیەکی تر دەیفرۆشێت بە (٩٧٥٠$)، وهەتا وادەی وەرگرتنەوەی پارەکە نزیك بێتەوە نرخی فرۆشتنی کۆمپیالەکەیش بەرز تر دەبێتەوە، وبەم شێوازە کۆمپیالەکە بەر لە هاتنی وادەی وەرگرتنەوەی چەندین دەست دەکات، وبەچەندین نرخی جیاواز کڕین وفرۆشتنی پێوە دەکرێت.

ئەم شێوازەیش لە کڕین وفرۆشتنی کۆمپیالە دیسان حەرامە ودروست نییە، لەبەر ئەوەی وەکو پێشتر گوتمان کۆمپیالە هەمان حوکمی ئەو پارەیەی هەیە کە تێیدا تۆمار کراوە، وئێستا ئەگەر گوتمان شکاندنەوەی کۆمپیالە کڕین وفرۆشتنەوەی قەرزەکەیە، لێرەدا دوو ئەگەر هەیە:

ئەگەری یەکەم: ئەگەر فرۆشتنەوەی کۆمپیالەکە بەهەمان ئەو دراوە بوو کە لەکۆمپیالەکەدا نووسراوە، بۆ نموونە کۆمپیالەکە بەدۆلار نووسراوە وئێمەیش دەیفرۆشینەوە بەدۆلار، لەم حاڵەتەدا کڕین وفرۆشتنی کۆمپیالەکە حەرامە چونکە دوو جۆر لەسوو دروست دەکات کە ئەوانیش:

أ- سووی زیادەیە (ربا الفضل): کە بریتییە لەو سوودەی کە تۆ دراوێك یان کاڵایەك کەسووی تێدا دروست دەبێت بفرۆشێت بەهەمان دراو یان کاڵا بەڵام بەکەم وزیاد، بۆ نموونە (١١٠$) تاك دۆلاری بفرۆشت بە (١٠٠$) دۆلارییەك، فرۆشتنەوەی کۆمپیالەیش بەکەم یان زیاد لەو نرخەی تێیدا تۆمار کراوە، ئەو سووە دروست دەکات، وبەدڵنیاییشەوە نرخەکە کەم وزیاد دەکات؛ چونکە ئەو کەسانەی کە بازرگانی بەکۆمپیالەوە دەکەن بەمەبەستی قازانج کردن ئەو کارە دەکەن.

ب- سووی دواکەوتنی یەکێك لەدراوەکان (ربا النسيئة): ئەمە جۆری دووەمە لە سووی مامەڵە داراییەکان، کە لەکاتی کڕین وفرۆشتنی دراو بە دراودا، جۆرەکانیان هەرچی وهەرچەند بن مەرجی سەرەکەی شەرعی بوونی مامەڵەکە ئامادە بوونی هەر دوو

دراوەکەیە لەکاتی ئەنجامدانی گرێبەستەکەدا، خۆ ئەگەر یەکێکیان ئەمادە نەبوون ئەوە ئەو جۆرە سووە دروست دەکات کە پێی دەگوترێت، سووی دواکەوتنی یەکێك لەدراوەکان (ربا النسیئة).

لە کڕین وفرۆشتنی کۆمپیالەیشدا بۆیە نرخەکەی بەرز ونزم دەکات، چونکە قەرزەکە وادەی وەرگرتنەوەی نەهاتووە. کەواتە لەم حاڵەتەدا کڕین وفرۆشتنی کۆمپیالە دوو جۆر سووی تێدایە وحەرامە.

ئەگەری دووەم: ئەگەر فرۆشتنەوەی کۆمپیالەکە بەدراوێکی جیاواز بوو لەو دراوەی کە لەناو کۆمپیالەکەدا تۆمار کراوە، بۆنموونە: کۆمپیالەکە بەدۆلار کراوە، ئێمە فرۆشتمانەوە بەدینار یان هەر دراوێکی تر جگە لە دۆلار، لەم حاڵەتەدا جۆری یەکەم لەسوو کە سووی زیادەیە (ربا الفضل) دروست نابێت؛ چونکە گۆڕینەوەی دراو بەدراوێکی جیاواز تر لەخۆی دروستە کەم وزیاد بکات، بەڵام جۆری دووەم لەسوو کە سووی دواکەوتنی یەکێك لەدراوەکانە (ربا النسیئة) هەر دروست دەبێت.

بۆ چارەسەرکردنی ئەم حاڵەتە چەند ڕێکارێکی شەرعی هەیە دەکرێت لەو ڕێیانەوە زووتر پارەی قەرزەکە دەستبکەوێتەوە وکەسیش تووشی حەرام نەبێت و گرنگترینی ئەو ڕێکارانەیش بریتین لە:

١- فرۆشتنەوەی کۆمپیالەکە بەکەسی قەرزار خۆی: لەم حاڵەتەدا خاوەنی قەرزەکە کۆمپیالەکە دەفرۆشێتەوە بەو کەسەی قەرزەکەی پێداوە وکۆمپیالەکەی بۆ نووسیوە؛ بەڵام فرۆشتنەوەکە پێویستە بەدراوێکی تر بێت نەك هەمان ئەو دراوەی کەقەرزەکەی پێکراوە ولە کۆمپیالەکەدا نووسراوە، ودەشبێت بەچەند ڕێکەوتن یەکسەر قەرزارەکە هەموو بڕە پارەکە ڕادەستی خاوەن قەرزەکە بکاتەوە، لێرەدا جۆری یەکەم لەسوو کەسووی زیادەیە (ربا الفضل) دروست نابێت، چونکە پارەکە بەدراوێکی تر دەفرۆشرێت، جۆری دووەمیش لەسوو کە سووی دواکەوتنی یەکێك لەدراوەکانە (ربا النسیئة) دروست نابێت، چونکە پارەکە لای قەرزارەکە خۆیەتی ویەکسەریش ڕادەستی خاوەن قەرزەکەی دەکاتەوە[1].

---

١ - ئەمە بابەتە دەچێتە ژێر خانەی حوکمی فرۆشتنەوەی قەرزەوە وکۆمکاری فیقهی ئیسلامیش لەو بارەیەوە دەڵێت:

٢- حەواڵە (الحوالة): ئەویش بەوەی خاوەنی قەرزەکە[١] هەمان بڕی ئەو پارەیەی لەکۆمپیالەکەدا نووسراوە لەکەسێکی تر قەرز بکات، وکۆمپیالەکە بداتەوە بەو، ئەمەیش وەکو حەواڵەی قەرز وایە، وهیچ گرفتێکی شەرعی نییە. بەڵام بەمەرجێك قەرزەکە بەهەمان دراوی ناو کۆمپیالەکە وبەهەمان ڕێژەیش بێت، ئەگەر وانەبێت دیسان دەبێتەوە کڕین وفرۆشتن وسوو دروست دەکات.

٣- کڕین وفرۆشتنی کاڵا بەپارەی کۆمپیالەکە: پێشتر ئەوەمان بڕانەوە کە کڕین وفرۆشتنی کۆمپیالە بەدراو هەرچی وهەرچەندبێت حەرامە ودروست نییە[٢]؛ بەڵام

---

إن مجلس المجمع الفقهي الإسلامي في دورته السادسة عشرة المنعقدة بمكة المكرمة، في المدة من ٢١-١٤٢٢/١٠/٢٦هـ الذي يوافقه: ٥-٢٠٠٢/١/١٠م، قد نظر في موضوع: (بيع الدين).... واتضح من البحوث المقدمة أن بيع الدين له صور عديدة؛ منها ما هو جائز، ومنها ما هو ممنوع، ويجمع الصور الممنوعة وجود أحد نوعي الربا: ربا الفضل، وربا النساء، في صورة ما، مثل بيع الدين الربوي بجنسه، أو وجود الغرر الذي يفسد البيع؛ كما إذا ترتب على بيع الدين عدم القدرة على التسليم ونحوه؛ لنهيه صلى الله عليه وسلم عن بيع الكالئ بالكالئ. وهناك تطبيقات معاصرة في مجال الديون تتعامل بها بعض المصارف والمؤسسات المالية، بعض منها لا يجوز التعامل به؛ لمخالفته للشروط والضوابط الشرعية الواجبة في البيوع. وبناء على ذلك قرر المجمع ما يلي:

أولا: من صور بيع الدين الجائزة: بيع الدين للمدين نفسه بثمن حـال؛ لأن شرط التسليم متحقق؛ حيث إن ما في ذمته مقبوض حكما، فانتفى المانع من بيع الدين، الذي هو عدم القدرة على التسليم.

ثانيا: من صور بيع الدين غير الجائزة:

أ- بيع الدين للمدين بثمن مؤجل أكثر من مقدار الدين؛ لأنه صورة من صور الربا، وهو ممنوع شرعا، وهو ما يطلق عليه (جدولة الدين). ب- بيع الدين لغير المدين بثمن مؤجل من جنسه، أو من غير جنسه؛ لأنها من صور بيع الكالئ بالكالئ ( أي الدين بالدين ) الممنوع شرعا.

ثالثا: بعض التطبيقات المعاصرة في التصرف في الديون:

أ- لا يـجوز حسم الأوراق التجارية ( الشيكات، السندات الإذنية، الكمبيالات )؛ لما فيه مـن بيع الدين لغير المدين على وجه يشتمل على الربا. ب- لا يجوز التعامل بالسندات الربوية إصدارا، أو تداولا، أو بيعا؛ لاشتمالها على الفوائد الربوية. ج- لا يجوز توريق (تصكيك) الديون بحيث تكون قابلة للتداول في سوق ثانويـة؛ لأنه في معنى حسم الأوراق التجارية المشار لحكمه في الفقرة(أ).

رابعـا: يرى المجمع أن البديل الشرعي لحسم الأوراق التجارية، وبيع السندات، هو بيعها بالعروض (السلع) شريطة تسلم البائع إياها عند العقد، ولو كان ثمن السلعة أقل من قيمة الورقة التجارية؛ لأنه لا مانع شرعا من شراء الشخص سلعة بثمن مؤجل أكثر من ثمنها الحالي.

خامسا: يوصي المجمع بإعداد دراسة عن طبيعة موجودات المؤسسات المالية الإسلامية، من حيث نسبة الديون فيها، وما يترتب على ذلك من جواز التداول أو عدمه).

١- ئەو کەسەی سەرەتا قەرزەکەی داوە، وکۆمپیالەکەی لەبری قەرزەکەدا وەرگرتووە.

٢ - جگە لەوحاڵەتانە نەبێت کەباسمان کرد.

دەکرێت بەپارەی کۆمپیالەکە هەر کاڵایەکمان بویێت بکڕین وبفرۆشین، بۆ نموونە دەتوانین بەپارەی کۆمپیالەکە ئۆتۆمبێل، یان خانوو، یان ناوماڵ، یان زەوی، یان هەر شتێکی تر بکڕین وبفرۆشین، نرخی کاڵاکانیش هەرچەند وهەرچۆن بێت کێشەی نییە بەمەرجێك کاڵا بێت، ودراو یان ئاڵتون وزیوو نەبێت.

دووەم: چەك (الشيك، الصك):

چەکیش کاغەزێکی تری بازرگانییە و لەبری پارە بەکاردێت، وهەمان حوکم ونرخی ئەو بڕە پارەیەی هەیە کەتێیدا تۆمار کراوە.

دەرکردنی چەك وپێدانی بۆ دوو مەبەستی سەرەکی بەکاردێت:

أ- لەبری قەرزو وەك ئامرازێك بۆ زامنکردنی پارەی قەرزەکە، ئەم شێوازی بەکارهێنانەیش هیچ کێشەی نییە؛ چونکە چەك کاغەزێکی یاسایی بازرگانی باوەڕپێکراوە، ومەبەست لێی زامنکردنی وەرگرتنەوەی پارەی قەرزەکەیە وهیچی تر، وەك چۆن ئێستا حکومەت کەپارەی نییە، لەبری پارە چەك دەدات بەهەموو ئەو هاووڵاتی وکۆمپانیایانەی کە قەرزیان لای حکومەتە.

ب- وەك نرخی کاڵا وبە مەبەستی کڕین وفرۆشتن.

حوکمی بەکارهێنان ومامەڵە پێکردنی چەك لە زۆر ڕووەوە لەگەڵ کۆمپیالە یەك دەکاتەوە، بۆیە لێرەدا ولەچەند خاڵێکدا وبەکورتی ئاماژە بە گرنگترین حوکمەکانی مامەڵەکردن بەچەکەوە دەکەین:

١- چەك هەمان حوکمی ئەو بڕە پارەیەی هەیە کەتێیدا نووسراوە لەڕووی چەندێتی وچۆنێتییەوە، وهەموو ئەو حوکمانەی بەسەر ئەو بڕە پارەیەدا جێبەجێ دەبێت بەسەر چەکەکەیشدا جێبەجێ دەبێت.

٢- دروستە بەچەك هەرچی کاڵایەکمان بوویێت وەك خانوو، ئۆتۆمبێل، جل وبەرگ، کەرەسەی بیناسازی، ناوماڵ وهتد .. بکڕین وبفرۆشین، بەزیاد یان بەکەم، بەقەرز یان بەحازر، چەکەکە هەبوو (رصيد) ی هەبێت یان نا هیچ کێشەی نییە ودروستە.

٣- دروستە بەچەك هەردراوێکما بوێت یان ئاڵتون وزیو بکرین؛ بەڵام پێویستە لەم حاڵەتەدا چەکەکە هەبوو (رصید) ی ڕاستەقینەی هەبێت لەبانکدا، و بتوانرێت دەستبەجێ پارەکەی خەرج بکرێت، چونکە وەکو گوتمان چەکەکە هەمان حوکمی پارەی هەیە، ولەم جۆرە مامەڵانەدا دەبێت کڕدراو وفرۆشراو یەکسەر ئامادەبن.

٤- ئەگەر چەکەکە بەهەمان ئەو دراوە فرۆشرایەوە کە تێیدا تۆمار کراوە، بۆ نموونە بەدۆلار کراوە وبەدۆلاریش فرۆشرایەوە، ئەو کات جگە لەمەرجی بوونی هەبوو (رصید) ی تەواوی پارەکەی لەبانك، دەبێت بەهەمان بڕە پارەیش بفرۆشرێتەوە کە تێیدا تۆمار کراوە وزیاد وکەم نەکات، خۆ ئەگەر زیاد وکەمی کرد سووی زیادە (ربا الفضل) دروست دەکات.

٥- ئەگەر چەکەکە بەدراوێکی تر فرۆشرا جیاواز لەو دراوەی کەتێیدا تۆمار کراوە، بۆ نموونە چەکەکە بەدۆلار کرابوو فرۆشتمانەوە بەدینار یان بەپێچەوانەوە، یان ئاڵتون وزیومان پێ کڕی، لەم حاڵەتەدا نرخەکانیان چەند بەرز ونزم بکات ئاساییە، چونکە جۆرەکانیان جیاوازە؛ بەڵام پێویستە چەکەکە هەبوو (رصید)ی تەواوی لەبانك هەبێت، وبتوانرێت دەستبەجێ خەرج بکرێت، ئەگینا سووی دواکەوتنی یەکێك لە بەرامبەرەکان (ربا النسیئة) دروست دەکات.

٦- ئەگەر چەکەکە بۆ ماوەیەك بوو هێشتا وادەی وەرگرتنی نەهاتبوو، یان هەبوو (رصید) ی نەبوو لەبانك، وەك ئەو چەکانەی ئەمڕۆ حکومەت دەیداتە خەڵکی، ئەوکات بەهیچ جۆرێك دروست نییە، بەهیچ جۆرە دراوێك، وبەهیچ جۆرە نرخێك، کڕین وفرۆشتن بەو جۆرە چەکانەوە بکرێت، یان ئاڵتون وزیوی پێ بکڕدرێت، چونکە ئەگەر بەهەمان دراوی خۆی و بەکەمتر لەو نرخەی لەسەریێتی بفرۆشرێت ئەو کات هەردوو جۆری سوو کە سووی زیادە و سووی دواکەتنی یەکێك لەدراوەکانیشە دروست دەکات، وە ئەگەر بەدراوێکی تر بفرۆشرێت ئەوکات سووی دواکەوتنی یەکێك لەدراوەکان دروست دەکات؛ بۆیە لەم حاڵەتەدا تەنها دەتوانرێت کاڵا یان شت ومەکی تری وەك ئۆتۆمبێل وخانوو گەنم وبرنج وئەو جۆرە شتانەی پێبکڕدرێت.

٧- ئەو چەکانەی کە وادەی وەرگرتنیان بەسەر چووە، یان لەقەیرانێکی دارایی وەك ئەمڕۆدا وەرگرتنیان قورس وئاستەمە، وەکو گوتمان گۆڕینەوەیان بەهەر دراوێکی تر

حەرامە؛ بەڵام دەکرێت لەبری کڕین وفرۆشتن، بڕێك پارە بدەین بەهەر کەسێك کە پارەی چەکەکەمان بۆ دەستەبەر ودابین دەکات، بەڵام بەمەرجێك بە بەرتیل وکاری ناشەرعی وستەم کردن لەخەڵکی پەیدای نەکات، بەڵکو بەرێکاری شەرعی ویاسایی بۆمان وەربگرێتەوە، بەم شێوازە هەردوو لایش سوود مەند دەبن وهیچیشیان تووشی سووخۆری وکاری حەرام نابن.

٨- بەهیچ شێوازێك دروست نییە سزای دارایی لەسەر دواکەوتنی وەرگرتنەوەی چەك دابنرێت؛ چونکە وەکو گوتمان سزای دواکەوتنی دانەوەی قەرز حەرامە، وئەمیش دەچێتە هەمان خانەوە.

ئەمانە بەکورتی حوکمی بەکارهێنانی چەکن کە بەداخەوە ئەمڕۆ خەڵکانێکی زۆر بەهۆی ئەم قەیرانە داراییەوە کڕین وفرۆشتن بەو جۆرە چەکانەوە دەکەن بەبێ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ پرسی شەرع، ئەمە لەکاتێکدا وەك باسمان کرد زۆربەی مامەڵەکانیان دەچێتە خانەی سووخۆرییەوە.

## سێیەم: حەواڵە بازرگانییەکان (الحوالات التجارية):

حەواڵە لە زاراوەی شەرع و لە بنەڕەتدا بریتییە لەگواستنەوەی قەرزێك لەئەستۆی کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر، وبەم پێیەیش حەواڵە سێ لایەنی سەرەکی هەیە کەئەمانەن:

یەکەمیان: (المحيل، الساحب): کەسی یەکەمە وقەرزدارە وداوا دەکات لەکەسی دووەم کا خاوەن قەرزەکەیە، قەرزەکەی ئەستۆی بگوزارێتەوە بۆ ئەستۆی کەسی سێیەم، کە ئەم قەرزی لایەتی.

دوومیان: (المحال، المستفيد): کەسی دووەمە کە قەرزی لای کەسی یەکەمە، وداوای لێ دەکرێت، قەرزەکەی لەکەسی سێیەم وەربگرێتەوە.

سێیەمیان: (المحال عليه، المسحوب عليه): کەسی سێیەمە کە قەرزاری کەسی یەکەمە، ولەسەر داوای کەسی یەکەم داوای لێ دەکرێت قەرزەکە بداتەوە کەسی دووەم.

لەڕوی یاساییشەوە حەواڵە بە یەکەم کاغەزی بازرگانی ئەژمار دەکرێت کە مامەڵەی پێوە کراوە لەنێو کاغەزە بازرگانییەکاندا، وبریتیە لەنووسراوێکی یاسایی بەپێی کۆمەڵێك

مەرجی دیاریکراو، کە تێیدا کەسێك داوا لەکەسێکی تر دەکات بڕێك پارە بدات بەکەسی سێیەم لە کات وشوێنێکی دیاریکراودا یان لەوکاتەی خۆی بیەوێت.

حەواڵەیش بەم واتا سادەیەی خۆی هیچ کێشەیەکی شەرعی نییە ودروستە؛ بەڵام ئێستا حەواڵە بەم شێوازە نەماوە، وتێکەڵ بەزۆرێك لەمامەڵە بازگانییەکانی تری وەك گۆڕینەوەی دراو، وهەناردەکردنی بۆ شوێنانی تر، وزۆر شتی تر بووە.

هەر بۆیە ڕوونکردنەوەی وردەکارییەکانی ئەم بابەتە هەڵدەگرین بۆ کاتی قسەکردن لەسەر حوکمی گۆڕینەوەی دراو ومامڵە پێکردنی.

## چوارەم: فرۆشتنی قەواڵەکان (بيع السندات):

ئەمە بەشی یەکەمە لەبەشی کاغەزە داراییەکان، وزۆر جار حکومەتەکان یان کۆمپانیا ودەزگاکانی وەبەرهێنان لەکاتی دروستبوونی قەیران، یان بەمەبەستی گەشەپێدان وفراوانکردنی پڕۆژەکانیان پەنای پێ دەبەن.

بیرۆکەی قەواڵە بریتییە لەوەی کاتێك حکومەتێك، یان کۆمپانیایەك، یان هەر دامەزراوەیەکی تر پێویستی بەبڕێك پارەی زۆر دەبێت، وکەسی دەست ناکەوێت قەرزی بداتێ، کۆمەڵێك کاغەزی دارایی لەسەر شێوەی قەواڵە دەخاتە بازاڕەوە، ولەبەرامبەر بڕێك پارەدا دەیانفرۆشێت تا بڕی پارەی پێویستی دەست بکەوێت.

ماوەی تەمەنی قەواڵەکانیش بەپێی پێویستی وپڕۆژەکان دەگۆڕێت، قەواڵە هەیە بۆ ماوەی (٩٠) ڕۆژ دەردەکرێت، هەیە تا (٥) ساڵ، هەیشە تا (١٥) ساڵ وهەندێکیش هەیە تا (١٠٠) ساڵ[1].

ئەو لایەنەی قەواڵە دەردەکات بۆ ئەوەی قەناعەت بەخەڵکی بکات قەواڵەکان بکڕن چەند ڕێگایەك دەگرێتە بەر لەوانە:

١- مانگانە یان هەرچەند مانگ جارێك بڕێك پارەی بڕاوە دەدات بەو کەسانەی قەواڵەکان دەکڕن، وئەم بڕە پارەیەیش بەپێی نرخی قەواڵەکان دەگۆڕێت، وتا نرخی

---

١ - بۆ نموونە: کۆمپانیای (سەنتافی) ئەمەریکی لە ساڵی (١٨٩٥) کۆمەڵێك قەواڵەی خستۆتە بازاڕەوە تا ساڵی (١٩٩٥) بەردەوام بووە.

قەواڵەکە زیاتر بێت بڕی مانگانەی پێداڕویش بەکڕیاری قەواڵەکە زیاتر دەبێت، بۆ نموونە مانگانە (٥٪) قازانج دەدات بەخاوەنی قەواڵەکە، تاکۆتایی ماوەکەی، ولەکۆتاییشدا کەسەکە قەواڵەکە دەگێڕێتەوە بۆ ئەو لایەنەی دەری کردوە پارەکەی خۆی وەردەگرێتەوە.

٢- یان قەواڵەکە بەنرخێکی زۆرتر لەو نرخەی پێی دەفرۆشێت دەردەکات، بۆ نموونە قەواڵەکە بە (٥٠٠٠$) دۆلار دەفرۆشێت، بەڵام ئەو نرخەی لەسەریێتی (٦٠٠٠$) واتە کەسەکە کاتێك قەواڵەکە دەگێڕێتەوە (١٠٠٠$) قازانج دەکات. دواتریش ئەو کەسانەی قەواڵەکان دەکڕن خۆیان لەنێوان خۆیاندا بازرگانی پێوە دەکەن، وبەپێی نرخی بازاڕ ونزیك بوونەوەی وادەی کۆتاییهاتنی قەواڵەکە کڕین وفرۆشتنی پێوە دەکەن.

٣- یان هەندێك جار بۆ خۆدزینەوە لە حوکمە شەرعییەکان لەژێر ناوی دیاری یان بەخشین پارە دەداتە هەڵگرانی قەواڵەکان.

هەموو ئەو ڕێگایانەیش کە باسمان کرد بۆ دەرکردنی قەواڵەکان، ومامەڵە پێوەکردنیشیان لە بازاڕدا سوویەکی ڕوون وئاشکرایە، ودەرکردنی قەواڵەکان تەنها فێڵ وچاوبەستێکە وئامرزێکە بۆ تێپەڕاندنی سووخۆری وهیچی تر. بۆیە نەلەسەرەتای دەرچوون ونەلەدواتریش کڕینی ئەو قەواڵانە وپەنا بردن بۆ ئەم جۆرە کارانە لەهیچ کاتێکدا وبەهیچ شێوازێك دروست نییە[١].

---

١- ئەمەیش بڕیاری کۆمکاری فیقهی ئیسلامییە لەو بارەیەوە: إن مجلس مجمع الفقه الإسلامي المنعقد في دورة مؤتمره السادس بجدة في المملكة العربية السعودية من ١٧ إلى ٢٣ شعبان ١٤١٠هـ الموافق ١٤ - ٢٠ آذار ( مارس ) ١٩٩٠م . بعد اطلاعه على الأبحاث والتوصيات والنتائج المقدمة في ندوة ( الأسواق المالية )...وبعد الاطلاع على أن السند شهادة يلتزم المصدر بموجبها أن يدفع لحاملها القيمة الاسمية عند الاستحقاق، مع دفع فائدة متفق عليها منسوبة إلى القيمة الاسمية للسند، أو ترتيب نفع مشروط سواء أكان جوائز توزع بالقرعة أم مبلغا مقطوعا أم خصما قرر:

١- إن السندات التي تمثل التزاما بدفع مبلغها مع فائدة منسوبة إليه أو نفع مشروط: محرمة شرعا، من حيث الإصدار، أو الشراء، أو التداول؛ لأنها قروض ربوية، سواء أكانت الجهة المصدرة لها خاصة، أو عامة ترتبط بالدولة، ولا أثر لتسميتها ( شهادات) أو (صكوكا استثمارية) أو (ادخارية) ، أو تسمية الفائدة الربوية الملتزم بها (ربحا) أو (ريعا) أو (عمولة) أو (عائدا).

٢- تحرم أيضا السندات ذات الكوبون الصفري، باعتبارها قروضا يجري بيعها بأقل من قيمتها الاسمية، ويستفيد أصحابها من الفروق، باعتبارها خصما لهذه السندات.

٣- كما تحرم أيضا السندات ذات الجوائز، باعتبارها قروضا اشترط فيها نفع، أو زيادة، بالنسبة لمجموع المقرضين، أو لبعضهم، لا على التعيين، فضلا عن شبهة القمار.

٤- من تعامل بهذه الشهادات المحرمة، لزمه التوبة إلى الله تعالى، والتخلص من الزيادة المحرمة بإنفاقها في المشاريع العامة وأوجه الخير، ولا يحل له الانتفاع بها. مجلة المجمع: ع٦، ج٢، ص١٢٧٣. وع٧، ج١، ص٧٣. قرار رقم: ٦٠ (٦/١١).

لەبری ئەوە ئەو حکومەت وکۆمپانیایانە دەتوانن لەبری قەواڵەکان بەشێوازی فرۆشتنەوەی پشك پرۆژەکە دروست بکەن وپشکەکان بفرۆشنەوە بەخەڵکی وەبەرهێن وبەمەیش هەم کارەکەی خۆیان وپرۆژەکانیان سەردەگرێت، هەم نە خۆیشیان ونەخەڵکیش تووشی حەرام ناکەن.

## پێنجەم: فرۆشتنی پشکەکان (بيع الأسهم):

پشك بریتییە لە کۆمەڵێك بەشی یەکسان لە کۆی پێکهاتەکانی سەرمایەی کارگە یان کۆمپانیا، یان بانك، یان هەر پرۆژە یان دامەزراوەیەکی تر، بۆ نموونە دەڵێن کۆی نرخی کارگەیەك (١٠٠٠٠٠٠$) دواتر بۆ ئاسانکردنی کڕین وفرۆشتن ومامەڵە کردن بەم کارگەیەوە، ئەو بڕە پارەیە دابەش دەکەین بەسەر (١٠٠٠٠) پشکی یەکساندا، ونرخی هەر پشکێك یەکسان دەبێت بە (١٠٠$) وهەر کەس بیەوێت، دەتوانێت بایی هێندەی توانای دارایی خۆی پشك بکڕێت بۆنموونە کەسێك (١٠٠٠$) بدات (١٠) پشك دەکڕێت، وکەسێك (٢٠٠٠$) بدات (٢٠) پشك دەکڕێت وبەم شێوەیە، وخاوەنی پشکەکانیش بۆخۆیان دەتوانن بەپشکەکانی خۆیانەوە بازرگانی وکڕین وفرۆشتن بکەن، ونرخی پشکەکانیش بەپێی قازانج وزیانی پرۆژەکە دەگۆڕێت، وتا قازانجی پرۆژەکە زیاتر بێت بێگومان نرخی پشکەکانیشی بەرز دەبێتەوە، خۆ ئەگەر زیانی زیاتر بێت ئەوکات بێگومان نرخی پشکەکانیشی دادەبەزێت.

ئەم جۆرە مامەڵەیە بەپشکەوە هیچ گرفتێکی شەرعی نییە؛ چونکە تۆ لێرەدا پارە ئاڵوگۆڕ ناکەیت بەڵکو دەبیتە خاوەنی بەشێك لەکۆمپانیا یان کارگەکە، ومامەڵە بەو بەشەوە دەکەیت کەخۆت خاوەنیت.

بەڵام پێویستە ئاگاداری ئەوەبین کە هەرگیز پشکی پرۆژە یان کۆمپانیایەك نەکڕین کە کاری حەرام وناشەرعی تێدا ئەنجام بدرێت وەك هەر ئوتێل، یان مۆڵ، یان پارکێك کە عارەقی تێدا بخورێتەوە، یان سەنتەری مەساج، یان مەلەوانگەی تێکەڵ، یان کاری بەدڕەوشتی وناشەرعی تێدا ئەنجام بدرێت، یان هەر کۆمپانیایەکی وەبەرهێن نت پارەکانی لەپرۆژەی سووخۆریدا بەکاربهێنێت؛ چونکە هەموو ئەمانە حەرامن وپارە وقازانجەکانیشیان حەرامن، وپێویستە خەڵکانی باوەڕدار خۆیانی لێ بەدوور بگرن.

هەروەها ئاگاداری ئەوە بین کە ئەگەر کۆمپانیا یان کەسێکی نێوەندگیر پشکەکانی بۆ دەکڕین دەبێت دڵنیا بین لەوەی کە ئەو کۆمپانیا یان کەسە کارەکانی بەشێوازێکی شەرعی ئەنجام دەدات و تووشی حەرامبان ناکات.

بۆ نموونە کۆمپانیایەکی وەك (UniqueFinance) کە یەکێکە لەو کۆمپانیا نێوەندگیرانەی کە لە بازاڕی نازداکدا کاری نێوەندگیری لە نێوان وەبەرهێنەکان و کۆمپانیا خاوەن پشکەکانی بەشداربوو لە بازاڕەکەدا دەکات و مامەڵە بە پشکی بەناوبانگترین کۆمپانیاکانی جیهانەوە دەکات لە نموونەی: (فەیسبوك، ئەپڵ، مایکرۆسۆفت، مارسیدس، بیبسی، نایك، ڕۆزڕایز، و چەندینی تر.

هەرچەندە لەوڵاتانی ئەورووپا و ئەمریکادا خەڵکانی ئاسایی دەتوانن ڕاستەوخۆ مامەڵە لەگەڵ بازاڕ و بۆرصەی نازداکدا بکەن و مامەڵە بە پشکی ئەو کۆمپانیایانەوە بکەن؛ بەڵام ئەم هەلە بۆ دانیشتوانی وڵاتانی ئاسیا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەردەست نییە؛ بۆیە خەڵکانی ئەم وڵاتانە ئەگەر بیانەوێت مامەڵە بە پشکی ئەو کۆمپانیانیانەوە بکەن ناچار دەبن لە ڕێی کۆمپانیا نێوەندگیرەکانی هاوشێوەی (UniqueFinance) وە ئەو کارە ئەنجام بدەن، و کۆمپانیای ناوبراویش چەندین گرفتی شەرعی هەیە و مامەڵە کردن لەڕێی ئەوەوە دروست نییە[١].

ماوە ئەوە بڵێین کە کڕینی پشك و قەواڵە ناکرێت وەك یەك سەیر بکرێن؛ چونکە لەزۆر ڕووەوە جیاوازن لەوانە:

١- قەواڵە بریتییە لەپێدانی قەرز، بەڵام پشك بریتییە لەکڕینی بەشێك لە کۆمپانیا یان پرۆژەکە.

٢- ئەو کەسانەی قەواڵە دەکڕن تەنها قەرزیان لای کۆمپانیایە، بۆیە هیچ مافێکیان لەبەڕێوەبردنی کۆمپانیادا نییە، وناشتوانن بەشداری کۆبوونەوەکانی دەستەی گشتنی بەڕێوەبردنی بکەن، مەگەر لەهەندێك حاڵەتی تایبەتدا نەبێت، بەڵام ئەوانەی پشکیان هەیە

١ - بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی کۆمپانیای (UniqueFinance) و شێوازی کار و مامەڵەکانی و هۆکاری حەرامییەکەی، بگەڕێرەوە سەر پەرتووکی (حوکمی مامەڵە ئەلکترۆنییەکان) نووسینی: پرۆفیسۆر. خالید موحەممەد ساڵح. لاپەڕە (١١٠-١٢٤).

وەك خاوەنی کۆمپانیا ئەژمار دەکرێن ومافی بەڕێوەبردن وبەشداریکردنی گشت کاروچالاکییەکانی کۆمپانیایان هەیە.

٣- ئەو کەسانەی قەواڵە دەکرن قازانجێکی دیاریکراوی خۆیان هەیە و وەری دەگرن، تەنانەت ئەگەر کۆمپانیا ئیفلاسیش بکات ومایە پووچیش بێت؛ چونکە ئەوان قەرزیان لای کۆمپانیایە وهیچ پەیوەندییان بەزیان وقازانجی کۆمپانیاوە نییە؛ بەڵام ئەوانەی پشکیان هەیە تا کۆمپانیا قازانج نەکات هیچ قازانج نابەن، وئەگەریش کۆمپانیا زەرەری کرد بەشێك لەزەرەرەکانی کۆمپانیایان بەردەکەوێت.

٤- ئەو کەسانەی قەواڵەیان هەیە بەکۆتایی هاتنی ماوەی قەواڵەکە پارەکانی خۆیان وەردەگرنەوە؛ بەڵام ئەو کەسانەی پشکیان هەیە پارەی پشکەکانیان بۆ ناگەڕێتەوە تا بە ئارەزووی خۆیان پشکەکانیان نەفرۆشن، یان مەگەر کۆمپانیا هەڵبوەشێتەوە وتەمەنی پشکەکانیان کۆتایی پێبێت.

٥- لەکاتی مایەپووچبوونی کۆمپانیادا (إفلاس الشركة) ئەوانەی قەواڵەیان هەیە بەر لەخاوەن پشکەکان ماف وپارەکانی خۆیان وەردەگرنەوە؛ چونکە ئەوانە قەرزیان لای کۆمپانیایە؛ بەڵام خاوەن پشکەکان خاوەنی کۆمپانیان و ئەوەی لە خاوەن قەرزەکان دەمێنێتەوە ئەوە وەردەگرنەوە.

## بەشی نۆ[١]

## ڕێکارە شەرعییەکان بۆ خۆپاراستن لەسوو

یەکێك لە جوانترین وناوازەترینی دیاردەکانی حوکمی شەرعی ئەوەیە، کە کاتێك ڕێگە لەکارێکی نەشیاو وزیانبەخش دەگرێت، دەیەها ڕێگا و ورێکاری شەرعی تر بۆ خەڵکی والآ دەکات کە دەیانگەیەنێتە هەمان مەبەست وئامانجی خۆیان، بەبێ هیچ زیان ومەترسییەك لە ئێستا ولەداهاتویشیاندا.

ئێستایش لێرەدا وپاش ئەوەی باسی ڕێگە ناشەرعی وزیانبەخشەکانمان کرد بۆ وەرگرتنی قەرز، باس لە ڕێکارە شەرعییەکان و ئەو مامەڵانە دەکەین، کە حکومەت وبانك وکۆمپانیاکان دەتوانن لەبری سوو بەکاری بهێنن، وخۆیشیان وخەڵکیش لەکاری ناشەرعی بپارێزن.

گرنگترینی ئەو ڕێکارانەیش ئەمانەن:

یەکەم: فرۆشتنەوە لەسەر مایە وبە قازانج (بيع المرابحة).

دووەم: هاوبەشیبوون بەپارەی لایەنێك وکاری لایەنەکەی تر (المضاربة).

سێیەم: بەکردندان (الإستصناع).

چوارەم: بەقەرز کڕین بەگران، وبەحازر فرۆشتنەوە بەنرخێکی کەمتر (الزرنقة، التورق).

پێنجەم: فرۆشتنی پێشوەختە (بيع السلم).

شەشەم: هاوبەشیبوون بەپارە وکاری هاوبەش (المشاركة).

حەوتەم: بە کرێدان لەگەڵ بەڵێنی پێفرۆشتن یان پێبەخشین (الإجارة المنتهية بالتمليك).

---

١ - ئەم بەشە ڕۆژی (٢٠١٥/١/٣١) تۆمار کرا.

**یەکەم: فرۆشتنەوە لەسەر مایە وبە قازانج (بیع المرابحة):**

**فرۆشتنەوە بەقازانج دوو واتای کۆنو نوێی هەیە:**

لەکۆندا وکاتێك دەگەڕێیتەوە سەر پەرتووکی زانایان دەبینین ئەوان مەبەستیان لە (مرابحة) ئەوە بووە، کە کەسێك لەسەر مایە شتێك بفرۆشێتەوە بەقازانج بە کەسێکی تر، بۆ نموونە کەسێك خانوویەکی کڕیوە وکەسێك دەیەوێت لێی بکڕێتەوە، ئەم هەمان نرخ ومایەکەی خۆی پێ دەڵێت کە پێی کڕیوە، ولەسەر ئەوەوە شتێك قازانجی لێ وەردەگرێت. خۆ ئەگەر لەسەر مایە بەکەمتر وبەزیان پێی فرۆشت ئەو کات پێی دەگوترێت (وضيعة)، ئەگەریش بەمایەکاری وبەهەمان ئەو نرخەی کەپێی کڕیوە پێی فرۆشتەوە، ئەوکات پێی دەگوترێت (تولية).

هەرچەندە هەندێك لە زانایان لەکۆندا ئەو شێوازە فرۆشتنەیان بەقازانج ولەسەر مایە پێ پەسەند نەبووە[1]؛ چونکە لەوانەیە هەندێك فێڵ وناپاکی ودرۆی تێبکەوێت؛ بەڵام لەهەمان کاتیشدا بەحەرامیان لە قەڵەم نەداوە، بەڵکو هەندێك مەرج و ڕێکاریان بۆ داناوە تا بەر بە مەترسییەکانی بگرن لەوانە:

١- دەبێت نرخی یەکەمی کڕینی کاڵاکە لای کڕیارەکە زانراو ودیار بێت.

٢- دەبێت نرخەکەی چەندە وچۆنە ڕاستگۆیانە بێ زیاد وکەم پێی بگوترێت.

٣- دەبێت بڕی قازانجەکەیش دیار بێت کە لەسەر مایەوە لێی وەردەگرێت.

سەرەڕای ئەو مەرجانەیش وایان پێ باشتر بووە کەسەکە بەعەقڵی خۆی وبەنرخی ڕۆژ مامەڵە بکات نەك لەسەر مایە.

چونکە گوتویانە لەوانەیە کەسی یەکەم خۆی فێڵی لێ کرابێت وزیاتریان لێ سەندبێت، ئەویش ئەم ڕاستییە بەکەسی کڕیار ناڵێت، بەڵکو سوێند دەخوات کە ئەوەندەی پێداوە وڕاستیش دەکات؛ بەڵام ئەو باسی ئەوە ناکات کە خۆی فێڵی لێکراوە وخەڵەتێنراوە، یان لەوانەیە ئەو شتەی ئەم ئێستا دەیفرۆشێتەوە نرخەکەی دابەزیبێت وئەم لای کڕیارەکە باسی ئەوە ناکات، بەڵکو لەسەر نرخی ئەو کاتەی کەگران بووە پێی دەفرۆشێتەوە

---

١ - لەوانە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر، سەعیدی کوڕی موسەییەب، موحەممەدی کوڕی سیرین، حەسەنی بەصری، نەخەعی، قەتادە، ئیمامی ئەحمەد، ئیسحاق؛ بەڵام بۆچوونەکەیان لاوازە وزۆرینە لەسەر ئەوەن کە دروستە. بڕوانە: إبن المنذر، الإشراف على مذاهب العلماء، ج٦،ص١٣٤، مصدر سابق.

وزیاتریشی لێوەردەگرێت، یان لەوانەیە ئەو شتە سیفەت وشێوازی گۆڕابێت وئێستا نرخەکەی دابەزیبێت، بۆ نموونە ئەگەر کاڵاکە ئۆتۆمبێلێك بێت، لەوانەیە ئەم کە کڕیویەتی بەو نرخە کەم ڕۆیشتبێت بەڵام ئێستا لای ئەم زۆر ڕۆیشتوە، یان مۆدێلەکەی کۆن بووە، یان تووشی ڕووداوی هاتووچۆ بووە، یان بۆیاخ کراوەتەوە، بەڵام ئەم لای کڕیارەکەی باسی هیچ کام لەمانە ناکات، وسوێند دەخوات کە ئەوەندەم پێداوە، بەڵام ناڵێت کەی وچۆن بووە کە ئەوەندەم پێداوە، ئەمانە وزۆر شتی تر هەیە کە زانایان ترسیان لێی هەبووە کە ببێتە هۆی حەرامبوونی مامەڵەکە، بۆیە پێیان باشتر بووە لەسەر مایە پێی نەفرۆشێتەوە.

بەڵام لە ئێستادا واتای ئەم مامەڵەیە بەتەواوی گۆڕاوە و زانایانی هاوچەرخ کە باسی فرۆشتنەوە بەقازانج (بیع المرابحة) دەکەن شێوازێکی تریان لەفرۆشتن مەبەستە کە بریتیە لەوەی: کاتێك کەسێکی دەست کورت دەیەوێت کاڵایەکی وە خانوو یان ئۆتۆمبێل، یان ناوماڵ، یان دوکان، یان هەرشتێکی تر بکڕێت، بەڵام پارەی نییە، وکەسیش لەبەر خوا قەرزی ناداتێ، ئەو کەسە دەچێتە لای بانك، یان کۆمپانیا، یان هەر خاوەن دەسمایەیەك وداوای لێ دەکات کە بڕوات ئەو خانووە، یان ئۆتۆمبێل، یان دوکانە بکڕێت، وبەڵێنی ئەوەی پێدەدات کە ئەگەر کڕی، دواتر ئەم بەنرخێکی زیاترو بە گۆژمە (قسط) لێی دەکڕێتەوە، وکەسی یەکەمیش کە بانکە یان کۆمپانیا لەسەر بەڵێنەکەی ئەم دەچێت کاڵاکە بەپارەی حازر دەکڕێت، ودواتر وبەو نرخە زیادەی لەسەری ڕێکەوتون وبەگۆژمە دەیفرۆشێتەوە بەم.

هەرچەندە ئەم شێوازە لە فرۆشتن لەکۆنیشدا هەبووە، بەڵام نەبوەتە دیاردە بۆ نموونە: ئیمامی شافیعی لە پەڕتووکی (الأم) دا ئاماژەی پێ دەکات و دەڵێت: (وإذا أرى الرجلُ الرجلَ السلعة فقال: اشتر هذه و أربحك فيها كذا، فاشتراها الرجل، فالشراء جائز، والذي قال أربحك فيها بالخيار: إن شاء أحدث فيها بيعاً و إن شاء تركه)[1]. واتە: ئەگەر کەسێك کاڵایەکی نیشانی کەسێکی تر دا و پێی گوت: ئەوە بکڕە ومن دواتر بەوەندە قازانج لێت دەکڕمەوە، وکەسەکەیش لەسەر قسەی ئەم کاڵاکەی کڕی، ئەو جۆرە مامەڵەیە دروستە، ودواتر ئەو کەسەی بەڵێنی پێداوە کە بەزیاتر لێی بکڕێتەوە ئازادە لەوەی لێی بکڕێتەوە یان نەیەوێت.

---

١ - الشافعي، الأم، ج٣/ص٩٣، مصدر سابق.

بەڵام ئەمە کاتی خۆی بە (بیع المرابحة) نەناسراوە، ئەگەر چی لە ئێستادا واتای ڕاستەقینەی (بیع المرابحة) ئەمەیە ویەکێکە لە بەربڵاوترینی شێوازەکانی وەبەرهێنان وزۆربەی دەزگا دارایی وخاوەن دەسمایەکان کاری پێ دەکەن، وزۆربەی بوارەکانی ژیانی خەڵکیشی گرتۆتەوە.

زۆرینەی زۆری زانایانیش لەسەر ئەوەن کە ئەم شێوازە لەمامەڵە شەرعییە وڕێگە پێدراوە، بەڵام بەمەبەستی تەواو شەرعیبوونی مامەڵەکە، ودوور کەوتنەوە لەهەر فێڵ وناشەرعی وئەگەرێکی نەخوازراو، کۆمەڵێك مەرجیان بۆ داناوە پێویستە لە مامەڵەکەدا هەبن، مەرجەکانیش بریتین لە:

١- دەبێت لایەنی داوالێکراو وخاوەن دەسمایە کە بانکە یان کۆمپانیا بەشێوازێکی کرداری وڕاستەوخۆ لەڕێی خۆی، یان کارمەند، یان نوێنەرێکییەوە، هەستێت بەکڕینی کاڵاکە، وسەرەتا کاڵاکە بەگرێبەستێك یان بەهەر ڕێکارێکی شەرعی یان یاسایی تر بچێتە سەر ناوی ئەو، دواتر ئەو بیفرۆشێتەوە بەو کەسەی کەبەڵێنی کڕینی پێداوە؛ بۆیە دروست نییە کەسی داواکار پارەکە لە کەسی خاوەن دەسمایە وداوالێکراو وەربگرێت وخۆی بچێت کاڵاکە بکڕێت، بەڵکو پێویستە خاوەن دەسمایە خۆی بەو کارە هەستێت وە بەرپرسیارێتی فەوتان یان زیانی کاڵاکە لە ئەستۆی خۆیدا بێت تا ئەوکاتەی دەیفرۆشێتەوە بەکەسی داواکار[(١)].

٢- پاش ئەوەی کۆمپانیا بەگرێبەستێك وبەناوی خۆیەوە کاڵاکەی کڕی، دواتر وبەگرێبەستێکی تری سەربەخۆ کاڵاکە دەفرۆشێتە بەو کەسەی داوای کردوە، وبەو نرخەی لەسەری ڕێکەوتون. خۆ ئەگەر مامەڵەکە بەم دوو قۆناغەدا نەڕوات شەرعی نا بێت

---

١ - کۆمکاری فیقهی ئیسلامی دەربارەی ئەم مەرجە دەڵێن: (إن بيع المرابحة للآمر بالشراء إذا وقع على سلعة بعد دخولها في ملك المأمور، وحصول القبض المطلوب شرعا، هو بيع جائز، طالما كانت تقع على المأمور مسؤولية التلف قبل التسليم، وتبعة الرد بالعيب الخفي ونحوه). واتە: فرۆشتنەوەی کاڵایەك بەقازانج بەو کەسەی کە فەرمانی بەکڕینی کاڵاکە کردوە، پاش ئەوەی کاڵاکە دێتە سەر ناوی فەرمانپێکراو بەکڕین، وئەم دەبێتە خاوەنی شەرعی، مامەڵەیەکی دروستە، بەمەرجێك بەرپرسیارێتی تیاچوونی کاڵاکە، یان گەڕاندنەوەی بەهۆی هەر کەم وکورتیەکی شاراوەوە لەکاڵاکەدا لە ئەستۆی کەسی فەرمانپێکراو بێت. مجمع الفقه الإسلامي الدولي المنعقد في دورة مؤتمره الخامس بالكويت من ١- ٦ جمادى الأولى ١٤٠٩ الموافق ١٠ — ١٥ كانون الأول (ديسمبر) ١٩٨٨م، قرار رقم: ٤٠ - ٤١ (٢/٥ و ٣/٥). مجلة المجمع، ع٥، ج٢، ص ٧٥٤ و ٩٦٥.

ودروست نییە، بۆ نموونە ئەگەر بانك یان کۆمپاینا کەسی کڕیار خۆی نارد، وگوتی بڕۆ کاڵاکە بکڕە ومن پارەکەی دەدەم، ئەوە یەکسەر حەرام دەبێت، ودەبێتە سوو؛ چونکە بانك هیچی پێ نەفرۆشتوە، بەڵکو ئەو خۆی چووە ڕاستەوخۆ شتەکەی کڕیوە، بانك یان کۆمپانیا تەنها پارەکەی بۆ داوە، ودواتر زیاتری لێ وەرگرتۆتەوە. خۆ ئەگەر کاڵاکە هی بانك یان کۆمپانیا خۆی بێت، وبەگوژمە پێی بفرۆشێت، ئەو کات مامەڵەکە ڕاستەو خۆ لەنێوان خۆی وکەسی کڕیاردا دەبێت وهیچ کێشەی نیە.

٣- دەبێت مامەڵە وگرێبەستەکە ڕاستە وخۆ لەنێوان کڕیار وفرۆشیاردا بێت و کەسی سێیەمی تێنەکەوێت، خۆ ئەگەر کەسی سێیەمی تێکەوت، ئەو کات حەرام دەبێت، ودەبێتە سوو؛ چونکە لە ئێستادا هەندێك کۆمپانیا فێربوون لە گەڵ بانك یان هەر دامەزراوەیەکی دارایی تر ڕێك دەکەون، کە ئەگەر کۆمپانیا هەر کاڵایەکی فرۆشت بە گوژمە، کڕیارەکە ڕەوانەی بانك دەکات و لەوێ بانك بارمتەو ڕێکارەیاساییەکانی تر لەگەڵ کەسی کڕیار تەواو دەکات و ئەوجا بانك لە بری کڕیار پارەکە بەکاش دەخاتە سەر ژمارە حیسابی کۆمپانیا و دواتر بەگوژمە و بەبڕێکی زیاتر لە کەسی کڕیاری وەردەگرێتەوە و ئەمەیش دروست نییە و دەبێتە سوو؛ چونکە وەك پێشتریش باسمان کرد، هەر کەس بیەوێت ئەو کارە بکات دەبێت سەرەتا خۆی بڕوات بیکڕێت ئەوجا مافی فرۆشتنەوەی هەیە بەڵام لێرەدا بانك نایکڕێت و هیچ بەرپرسیارێتییەکیش ناگرێت ئەستۆ، بەڵکو تەنها نرخی کاڵاکە دەدات و دواتر بەزیاد وەری دەگرێتەوە. خۆ ئەگەر بانك و کۆمپانیا هی یەك کەس بوون ئەو کات دروستە و هیچ کێشەی نییە.

٤-دەبێت ڕێکەوتنی بانك یان کۆمپانیا لەگەڵ کەسی کڕیار کەبەڵێنی کڕینەوەی کاڵاکەیان پێ دەدات، تەنها وەکو بەڵێن سەیر بکرێت نەك گرێبەستی کڕین، واتا پاش ئەوەی بانك یان کۆمپانیا ولەسەر بەڵێنی کەسی کڕیار کاڵاکەیان کڕی، نا بێت کڕیارەکە ناچار بکەن لەسەر ئەوەی کاڵاکەیان لێ بکڕێتەوە، بەڵکو ئەو ئازادە لەوەی کە لێیان دەکڕێتەوە یان نا، هەرچەندە هەندێك لەزانایان بەتایبەتی مالیکییەکان پێیان وایە کە پێویستە کەسەکە پابەند بێت بەبەڵێنەکەیەوە، بەڵام ئەم بۆچوونە پەسەند نیە وزۆرینەی زانایانی هاوچەرخ کاری پێ ناکەن؛ چونکە ئەو تەنها بەڵێنی کڕینەوەی پێداون وگرێبەستی

کڕینی لەگەڵ نەکردون، ئەو دوو شتەیش لێك جیاوازن، خۆ ئەگەر ناچاری بکەن لەسەر کڕینەوەی کاڵاکە ئەو کات دوو گرفتی شەرعی دروست دەکات:

أ- بانك یان کۆمپانیا شتێکیان فرۆشتوە کە خاوەنی نەبوون؛ چونکە ئەو کاتەی کڕیارەکە بەڵێنی پێدان کە ئەگەر ئەوان کاڵاکە بکڕن لێیان دەکڕێتەوە، ئەوان خاوەنی کاڵاکە نەبوون، ئیتر چۆن ئەوکات فرۆشتویانە وگرێبەستیان لەسەر کردوە[1].

ب- دەبێتە دوو مامەڵە لەیەك گرێبەستدا؛ چونکە وەك ئەوە وایە بەکڕینی بانك یان کۆمپانیا بۆ کاڵاکە یەکسەر لەوانیشەوە فرۆشرابێتەوە بەکڕیارەکە وئەمەیش پێغەمبەری خودا ﷺ نەهی لێکردوە، وئەبو هورەیرە لەپێغەمبەرەوە بۆمان دەگێڕێتەوە ودەفەرموویێت: {نَهَى عَنْ بَيْعَتَيْنِ فِي بَيْعَةٍ}[2]. واتە: پێغەمبەری خودا ﷺ ڕێگری کردوە لەوەی دوو مامەڵەی کڕین و فرۆشتن لەیەك گرێبەستدا بکرێت.

بەڵام پێویستە لێرەدا ئەو خاڵە ڕەچاو بکرێت، کە ئەگەر بانك یان کۆمپانیا تووشی هەر زیانێك بوون لەدەرئەنجامی پابەند نەبوونی کڕیارەکە بەبەڵێنەکەیەوە، ئەوکات کەسی کڕیار ناچار دەکرێت قەرەبووی زیانەکەیان بۆ بکاتەوە، بۆ نموونە کاڵاکە نرخی دابەزی، یان هەر زیانێکی تری لێکەوت، ئەوە ئەوان مافی شەرعی خۆیانە قەرەبووی زیانەکەیان لەکەسی کڕیار وەربگرنەوە.

---

١ - کۆمکاری فیقهی ئیسلامی دەربارەی ئەم مەرجە دەڵێن: (المواعدة - وهي التي تصدر من الطرفين- تجوز في بيع بيع المرابحة بشرط الخيار للمتواعدين، كليهما أو أحدهما، فإذا لم يكن هناك خيار فإنها لا تجوز؛ لأن المواعدة الملزمة في بيع المرابحة تشبه البيع نفسه، حيث يشترط عندئذ أن يكون البائع مالكا للمبيع حتى لا تكون هناك مخالفة لنهي النبي ﷺ عن بيع الإنسان ما ليس عنده). واتە: ئەو بەڵێننامەیە کە هەردوولا لەسەری ڕێدەکەون دروستە، بەمەرجێك هەردوو لا مافی ئەوەیان هەبێت پێوەی پابەند نەبن، چونکە بەڵێننامەیەك کە هەردوولا پێوەی پابەند بن ومافی هەڵوەشاندنەوەیان نەبێت وەکو خودی گرێبەستی فرۆشتن وایە، ولەم کاتەیشدا پێویستە فرۆشیار خاوەنی ڕاستەقینەی فرۆشراوەکە بێت، تا سەرپێچی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ نەکات، کە نەهی لەفرۆشتنی شتێك کردوە مرۆڤ خاوەنی نەبێت. مجلس مجمع الفقه الإسلامي الدولي المنعقد في دورة مؤتمره الخامس بالكويت من ١- ٦ جمادى الأولى ١٤٠٩ الموافق ١٠ – ١٥ كانون الأول (ديسمبر) ١٩٨٨م، قرار رقم: ٤٠ - ٤١ (٢/٥ و ٣/٥). مجلة المجمع، ع٥، ج٢، ص ٧٥٤ و ٩٦٥.

٢ - إبن حبان، صحيح إبن حبان، ج١١، ص٣٤٧، مصدر سابق. الترمذي، سنن الترمذي، ج٣، ص٥٣٣، وقال الألباني في تخريجه: صحيح. مصدر سابق. النسائي، سنن النسائي الكبرى، ج٤، ص٤٣، مصدر سابق.

٥- بانك یان كۆمپانیا بەرپرسیارە لەپاراستن وسەلامەتی كاڵاكە تا ئەو كاتەی دەگاتە دەستی كڕیارەكە، وبڕیاری لەسەر دەدات. بۆنموونە: ئەگەر كاڵایەكمان لە سەر داوای كڕیار لە وڵاتی صین كڕی، ودواتر كەشتی بارهەڵگرەكە كەوتە ژێر ئاوو كاڵاكەی ئێمەیش فەوتا، ئێستا كەسی بەرپرسیار لەكاڵاكە وفەوتانی بانك وكۆمپانیایە نەك كەسی كڕیار، چونكە هێشتا نەگەیشتۆتە دەستی ئەو، تا نەیشگاتە دەستی ئەو وبڕیاری كڕینی نەدات، هیچ پەیوەندیەكی بەوەوە نیە، با لەسەر داوای ئەویش كڕدرابێت.

ئەمەیش لەگەڵ خاڵی پێشتر لەو ڕووەوە جیاوازە: كە ئەگەر كاڵاكە وەكو خۆی ولەسەر ئەو سیفەتەی كەكڕیارەكە داوای كردوە گەیشتە دەستی وبەڵام ئەو پابەند نەبوو بەبەڵێنەكەیەوە ونەیكڕی ئێستا بەو هۆیەوە هەرچی زیانێك بەر بانك یان كۆمپانیا بكەوێت لە ئەستۆی كڕیارە، بەڵام فەوتان یان زیانپێكەوتنی كاڵاكە بەر لەوەی بگاتە دەستی كڕیار لەئەستۆی بانك یان كۆمپانیا خۆیەتی، ودەبێت ئەو دوو خاڵە تێكەڵ نەكەین.

٦- ئەو پارەیەی وەكو قازانج دەخرێتە سەر نرخی كاڵاكە پاش فرۆشتنەوەی بەكڕیار نابێت لەسەرمایەی كاڵاكە جیابكرێتەوە، بۆ نموونە: نابێت بانك یان كۆمپانیا بەكڕیارەكە بڵێت ئەو سەیارەیەت بۆ دەكڕم بەڵام بە (١٠٪) نرخەكەی زیاتر پێت دەفرۆشمەوە، بەڵكو دەبێت دەسمایە وقازانجەكە بەیەك گوژمە بڵێت، گریمان ئۆتۆمبێلەكە بە (١٠٠٠٠$) ئەو دەبێت بڵێت بە (١١٠٠٠$) پێت دەفرۆشمەوە، وبەمەیش ڕێژەی قازانج ودەسمایەكە لێك جیا نابنەوە، وگومانی سووی لێ ناكرێت[1].

٧- نابێت كۆمپانیا یان بانك مەرجی سوودی دواكەوتنی دانەوەی قەرز لەسەر كڕیار دابنێت، بۆ نموونە: ئەگەر كڕیار لەدانەوەی گوژمەكان دواكەوت، نابێت لەبەرامبەردا بانك یان كۆمپانیا سزای دارایی لەسەر دابنێت، وپارەی زیاد بخاتە سەر پارەكانی، چونكە وەكو

---

١ - كۆمكاری فیقهی ئیسلامی دەربارەی ئەم مەرجە دەڵێن: (لا يجوز شرعا في بيع الأجل التنصيص في العقد على فوائد التقسيط، مفصولة عن الثمن الحال، بحيث ترتبط بالأجل..). واتە: لەكاتی فرۆشتن بەقەرزدا، دروست نییە لەگرێبەستەكەدا ئەو سوود وزیادەیەی دەچێتە سەر گوژمەكان جیا بكرێتەوە لەنرخی كاڵاكە بەحازر، وبەشێوازێك كە ئەو زیادانە وابەستەی كاتەكە بكرێت. مجمع الفقه الإسلامي المنعقد في دورة مؤتمره السادس بجدة من ١٧- ٢٣ شعبان ١٤١٠ هـ الموافق ١٤ - ٢٠ آذار (مارس) ١٩٩٠م.

پێشتریش گوتمان ئەوە سوویەکی ئاشکرایە وحەرامە. بەڵکو لەبری ئەوە بانك دەتوانێت کەفیلی دەستەبەر یان بارمتەی موڵك یان خانوو، یان کۆمپیالەی لەکەسی کڕیار وەربگرێت.

هەر مورابەحەیەك ئەم مەرجانەی تێدا ڕەچاو کرا دروستە وهیچ کێشەی نییە، خۆ ئەگەریش مەرجێك لەم مەرجانەی تێدا نەهاتە دی ئەو کات حەرامە و دروست نییە.

## دووەم: هاوبەشیبوون بەپارەی لایەنێك وکاری لایەنەکەی تر (المضاربة):

ئەمە یەکێکی ترە لەو شێوازە شەرعییانەی کە حکومەت وبانك وکۆمپانیاکان دەتوانن لەبری پێدانی پارە بەسوو بەکاری بهێنن.

بیرۆکەی ئەم شێوازە بریتییە لەوەی بانك، یان کۆمپانیا، یان کەسێکی سەرمایەدار بڕێك پارە یان کاڵا یان کارێك بدات بەلایەنێکی تر کەدەسمایەی نییە، بەڵام شارەزایی باشی لەبواری بازرگانی یان پیشەیەکدا هەیە، تا کاری پێوە بکات. ولەداهاتەکەیدا بەڕێژەیەکی دیاریکراو بەشداربن.

ماوەی هاوبەشی بوونەکە، وڕێژەی قازانجی هەر لایەکیان، وشێوازی بەکارهێنانی دەسمایەکە بەپێی ڕێکەوتنی هەردوو لادەبێت، ولایەنی خاوەن دەسمایە لەبەرامبەر دەسمایەکەیدا بڕێك قازانج وەردەگرێت، ولایەنی هەڵسوڕێنەری دەسمایەکەیش لەبەرامبەر کار و ماندووبوونەکەیدا بڕێك قازانج وەردەگرێت.

ئەم جۆرە مامەڵەیە دوو شێوازی هەیە:

أ- شێوازی ڕەها (المضاربة المطلقة): لەم شێوازەدا خاوەن دەسمایە مەرج لەسەر کەسی خاوەن کار دانانێت بەوەی چۆن ولەچیدا پارەکان بەکار بهێنێت، بەڵکو سەرپشکی دەکات لەوەی هەرچۆن وهەرچی پێ باشبوو بازرگانی پێوە بکات.

ب- شێوازی سنوردار (المضاربة المقیدة): لەم شێوازەدا خاوەن دەسمایە مەرج لەسەر کەسی خاوەن کار دادەنێت وسنووری کارەکەی، وشێوازی بەکارهێنانی بۆ دیاری دەکات، بۆ نموونە پێی دەڵێت: پارەکانی من تەنها لەکڕین وفرۆشتنی خانوو وزەویدا بەکاربهێنە، یان تەنها لە کەلوپەلی ناو ماڵ بەکاری بهێنە، یان هەندێك جار سنووری کارەکەی بۆ دیاری دەکات وپێی دەڵێت پارەکانی من تەنها لەسلێمانی یان لەهەولێر مامەڵە پێوە بکە، لەم

حاڵەتەدا کەسی خاوەن کار پێویستە پابەند بێت بەو مەرج وشێواز وسنوورەی کە خاوەن دەسمایە دیاری دەکات، وئەگەر پابەند نەبێت ئەو کات خۆی بەرپرسیار دەبێت لەهەر زیانێك کە لێیان دەکەوێت.

زانایان بۆ دروستی ئەم جۆرە مامەڵەیە و پاراستنی مافی لایەنەلانی گرێبەستەکە چەند مەرجێکیان داناوە کە ئەمانەن:

١- دەبێت دەسمایەی کارەکە پارە ودراو یان کار یان کاڵایەکی دیاریکراو بێت لەڕووی بڕ وجۆر گشت سیفاتەکانی ترەوە، چونکە بڕی قازانجی هەردوو لا لەسەر بنەمای دەسمایەکە یان کارەکە دیاری دەکرێت، خۆ ئەگەر دەسمایەکە نەزانراو بوو ئەو کات بڕی قازانجەکەیش نەزانراو دەبێت.

٢- دەبێت دەسمایەکە یان کاڵاو کارەکە ئامادە بێت وکاتی ڕێکەوتنەکە ڕادەستی کەسی خاوەن کار بکرێت، بۆیە ناکرێت دەسمایەکە قەرزێکی لای خاوەن کار بێت، بۆ نموونە ئەگەر خاوەن دەسمایە قەرزێکی لای خاوەن کارەکە بوو، وهێشتا کاتی وەرگرتنەوەی نەهاتبوو، یان کاتی دانەوەی قەرزەکە هاتبوو بەڵام قەرزارەکە نەیبوو بیداتەوە، دروست نییە لەم حاڵەتانەدا لەسەر ئەوە ڕێبکەون کە کەسی قەرزار بەو قەرزەوە کار بکات ولەداهاتەکەیدا هاوبەش بن، یان هەر لایەنێکیان داوای ئەوە بکات؛ چونکە ئەمە یەکسەر دەبێتە سووی قەرز نەك قازانج، بەڵام ئەگەر قەرزەکە کاتی دانەوەی هاتبوو وەکەسی قەرزار پارەکەی هێنایەوە وڕادەستی خاوەن قەرزەکەی کرد، لەم حاڵەتەدا دەتوان لەسەر ئەم شێوازەی کارکردنە ڕێبکەون، وخاوەن قەرزەکە ئەم جارە بەم شێوازە مامەڵەیە پارەکە ڕادەستی خاوەن کارەکە بکاتەوە.

خۆ ئەگەر قەرزەکە لای کەسێکی تر بێت کە هیچ پەیوەندییەکی بەخاوەن کارەکەوە نەبێت، وخاوەنی قەرزەکە خاوەن کارەکە ڕابسپێرێت کە بڕوات پارەکە لەقەرزارەکە وەربگرێتەوە، وبەهاوبەشی کاری پێوە بکات، ئەم جۆر ڕێکەوتنە هەرچەند باش نییە بەڵام ڕێگەپێدراوە ودروستە، حەنەفییەکان لەو بارەیەوە دەڵێن: (وَإِنْ كَانَ عَلَى غَيْرِهِ بأن قَالَ: اقْبِضْ مَالِي عَلَى فُلَانٍ ثُمَّ اعْمَلْ بِهِ مُضَارَبَةً فَهُوَ جَائِزٌ، وَإِنْ كَانَ مَكْرُوهًا لِأَنَّهُ شَرَطَ لِنَفْسِهِ مَنْفَعَةً قَبْلَ الْعَقْدِ)[1].

---

١ - إبن نجيم، البحر الرائق، ج٧،ص٢٦٣، مصدر سابق.

واتە: ئەگەر قەرزەکە لای کەسێکی تر بوو پێی گوت: قەرزەکەی لای فلان کەسم بۆ وەربگرەوە وبڕۆ بەهاوبەشی کاری پێوە بکە ئەوە دروستە، هەرچەندە باشیش نیە؛ چونکە ئەو بەر لە ئەنجامدانی گرێبەستەکە مەرجی سوودی بۆ خۆی داناوە.

٤- دەبێت ڕێژەی قازانجی هەردوولا (خاوەن دەسمایە، وخاوەن کار) دیاریکراوبێت، وەك نیوەیی، یان یەك لەسەر سێ، یان هەر ڕێژەیەکی تر کەخۆیان لەسەری کۆك بن.

بەڵام نابێت هیچ کامیان بڕێك لەقازانجی بڕاوە (مقطوع) بۆ خۆی دیاری بکات، بۆ نموونە: خاوەن دەسمایەکە بڵێت من مانگی (١٠٠٠$) م دەوێت، ئیتر من پەیوەندیم بەزەرەر وقازانجەوە نییە، ئەمە نابێتە مامەڵە بەڵکو دەبێتە پێدانی قەرز بەسوو، یان خاوەن کارەکە وابڵێت، چونکە ئەوە دەبێتە کرێ وشێوازی مامەڵەکە لە هاوبەشیبوون بەشێوازی (مضاربة) دەچێتە دەرەوە بۆ بەکرێگرتن وهەموو مەرج وحوکمەکانی دەگۆڕێت. یان دروست نییە هیچ کامیان ڕێژەیەك لەپارەی دەسمایەکە وەکو قازانج بۆ خۆیان دیاری بکەن، بۆ نموونە بڵێت: من مانگانە (١٠٪) قازانجی پارەکەم دەوێت، چونکە ئەمیش وەکو حاڵەتی پێشوتر وایە، وهەمان حوکمیشی هەیە.

یان بۆ نموونە ئەگەر پارەکە لەدوو جۆر بازرگانیکردن بەکار دەهات: وەك زەوی و ئۆتۆمبێل، دروست نییە لەسەر ئەوە ڕێبکەون کەیەکێکیان قازانجی زەوی وەربگرێت، وئەوی تر قازانجی ئۆتۆمبێل بەڵکو لەکۆی قازانجی هەر دوو مامەڵەکەدا پێکەوە هاوبەش دەبن بەو ڕێژەیەی لەسەری ڕێکەوتوون.

٥- زیان وقازانجی مامەڵەکە لە کۆتایی ماوەی گرێبەستەکە ئەژمار دەکرێت نەك هیچ کاتێکی تر، بۆ نموونە ئەگەر گرێبەستەکە بۆ ماوەی ساڵێك بێت لەکۆتایی ساڵەکەدا قازانج وزیان یەکلا دەکرێتەوە، وهەر قازانجێك هەبوو بەو ڕێژەیەی لەسەری ڕێکەوتوون دابەش دەکرێت، یان ئەگەر ڕێککەوتنەکە لەسەر وەجبە بوو ئەو کات پاش کۆتایی وەجبەکە زەرەرو قازانج یەکلا دەکرێتەوە، بۆ نموونە کەسێك کێڵگەیەکی پەلەوەری مریشکی هەیە دەیداتە کەسێك بۆی بەڕێوە ببات و لە داهاتەکەیدا هاوبەش بن، ئەگەر وا ڕێککەوتن کە پاش هەر وەجبەیەك ئەژماری زەرەرو قازانج بکەن، ئەو کات زەرەرو قازانجی وەجبەکان تێکەڵ ناکرێت و هەر وەجبەیەو بە جیا ئەژمار دەکرێت، خۆ ئەگەریش وا ڕێککەوتبون کە

ساڵانە ئەژماری زەرەرو قازانج بکەن ئەو کات کۆی کاری ساڵەکە ئەژمار دەکرێت و زەرەرو قازانجی وەجبەکان تێکەڵ دەکرێت وپاشان لەکۆی ڕێژەی هەمووی زەرەر و قازانج دیاری دەکرێت.

٦- لەکاتی بوونی زیاندا تەنها خاوەن دەسمایە زیانی بەردەکەوێت نەك خاوەن پیشەو ئەو کەسەی کارەکانی هەڵسوڕاندوە، چونکە خاوەن کار زیانی ئەرك وماندوبوونەکەی بەرکەوتووە، وخاوەن دەسمایەیش زیانی پارەکان، خۆ ئەگەر خاوەن دەسمایە ئەم جۆرە مەرجە لەگرێبەستەکەدا دابنێت، یان خاوەن کار خۆی گوتی من گرەنتی ئەوە دەدەم کە دەسمایەکە پارێزراو دەبێت وهیچ زیان ناکەین، ئەوە جگە لەوەی مەرجەکە حەرامە گرێبەستەکەیش بەتاڵ دەکاتەوە وهەڵیدەوەشێنێتەوە و ئەو کاتیش هەر خاوەن کار هیچ زیان نادات.

تەنها لە دوو حاڵەتەدا زیانی دەسمایە دەکەوێتە ئەستۆی خاوەنی کار:

أ- ئەگەر بەهۆی کەمتەرخەمی وخەمساردی ئەوەوە زیانەکە ڕوویدا بوو.

ب- ئەگەر سەرپێچی مەرجەکانی گرێبەستەکە وخاوەن دەسمایەکەی کردبوو، بۆ نموونە خاوەن دەسمایەکە مەرجی ئەوەی بۆ دانابوو کەتەنها لەسلێمانیدا کار بەپارەکانەوە بکات، بەڵام ئەو شتی فرۆشتبوو بەئێران وبەو هۆیەوە پارەکە فەوتا، ئەو کات هەموو زیانەکە دەچێتە ئەستۆی خاوەنی کارەکە، چونکە ئەمە زیانێکی سروشتی نییە بەڵکو بەهۆی سەرپێچی ئەوەوە ڕوویداوە، ودەبێت هەر خۆیشی قەرەبووی بکاتەوە.

ئەمانە ئەو مەرجە شەرعییانەن کە پێویستە لەم جۆرە مامەڵانەدا هەبن و پێویستە خاوەن دەسمایە و خاوەن پیشەکانیش لێیً بە ئاگا بن تا هیچ لایەکیان تووشی کێشە و حەرام نەبن.

سێیەم: بەکردندان (الإستصناع):

لەم جۆرە مامەڵەیەدا حکومەت یان کۆمپانیا یان بانك یان هەر کەسێك کەپێویستی بەدروستکردنی شتێکە رێك دەکەوێت لەگەڵ کارگەیەك یان کۆمپانیایەك یان لایەنێکی خاوەن پیشە یان خاوەن کار یان بەڵێندەر (مقاول) تا شتەکەی بۆ دروست بکات، ئیتر شتەکە کارگە، یان ئۆتۆمبێل، یان پرۆژەی خزمەتگوزاری، یان وەبەرهێنان، یان گەشتیاری ، یان هەرشتێکی تر بێت.

ئەمە یەکێکە لەو رێگانەی کەدەکرێت بۆ خۆ پاراستن لەسوو پەنای بۆ ببرێت، بۆ نموونە ئەگەر لایەنێك پێویستی بەپرۆژەیەك یان کارێك بوو لەبری ئەوەی خاوەن دەسمایەکە پارەی بەقەرز وبەسوو بداتێ، خۆی پرۆژەکەی بۆ دروست دەکات، لەسەر ئەو شێوازەی کە داوای دەکات، ودواتر بەچەند گوژمەیەکی کەم ودرێژ خایەن پارەکەی لێوەردەگرێتەوە.

هەرچەندە ئەم جۆرە مامەڵەیە لەبنەڕەتدا گرفتی شەرعی هەیە؛ چونکە کڕیار وفرۆشیار گرێبەست لەسەر شتێك دەکەن کە ئێستا بوونی نیە، واتا (معدوم) ە، وفرۆشتنی شتی نەبوویش حەرامە ودروست نییەك؛ بەڵام لەبەر بەرژەوەندی گشتی رێگەپێدارە، بەرژەوەندی لایەنی کڕیار لەو ڕووەوە کەبەپێی ئەو شێواز ومواسەفاتەی کەخۆی دەیەوێت شتەکە بەکرد دەدات، بەرژەوەندی لایەنی فرۆشیاریش لەو ڕووەوە کە هەتا کڕیار بۆ کاڵاکەی نەدۆزێتەوە شتەکە دروست ناکات، وپارە ودەسمایە وجێ وڕێی لێ ناگیرێت..

بەڵام ئەم گرێبەستەیش وەك سەرجەم گرێبەستەکانی تر کۆمەڵێك مەرجی هەیە، پێویستە لایەنەکانی گرێبەستەکە پێوەی پابەند بن لەوانە:

١- دەبێت کاڵا داواکراوەکە بڕ، وقەبارە، وشێوە، ونرخ، ومۆدێل، وکاتی تەواو کردن، وسەرجەم سیفاتەکانی تری لای هەردوو لایەنی گرێبەستەکە زانراو وئاشکرابێت.

٢- دەبێت کاڵاکە سروشتی وابێت بچێتە بواری دروستکردنەوە، وەکو (خانوو، ئۆتۆمبێل، جلوبەرگ...)، هەربۆیە فرۆشتنی دانەوێڵە، وزەوی، وئاژەڵ، ناچنە چوارچێوەی ئەم جۆرە مامەڵەیەوە.

٣- دەبێت کاتی تەواو کردن وڕادەستکردنی کاڵاکە دیاری کراو بێت، ودەکرێت بەڵێندەرەکە (مقاول، متعهد) هەڵبنرێت لەبەرامبەر ئەوەی زوو کارەکەی تەواو کات پارەی زیاتری پێبدرێت، بۆ نموونە: دەکرێت بڵێین ئەگەر لەماوەی چوارمانگدا خانووەکەت تەواو کرد ئەوە (١٠٠.٠٠٠$) ئەدەینێ، خۆ ئەگەر زیاتر هەوڵ بدەیت وزووتر، ولەماوەی دووم مانگدا تەواوی بکەیت (١٢٠.٠٠٠$) دەدەینێ.

لەهەمان کاتیشدا دەکرێت مەرجی ئەوە دابنرێت، ئەگەر کارەکە لەکاتی دیاریکراوی خۆی تەواو نەبوو بەڵێندەرەکە سزا بدرێت وغەرامە بکرێت، و بۆ هەموو ڕۆژێك بڕێك پارەی لەکۆی نرخی پرۆژەکەی لێ دابشکێنرێت[1]، وئەم مەرجانە هەموویان شەرعین وهیچ گرفتیان نییە، وهیچیان ناچنە خانەی سووەوە، چونکە تۆ کارت لای بەڵێندەر وخاوەن پیشەکەیە نەك پارە، بەڵام بەپێچەوانەوە بەڵێندەرەکە ناتوانێت هیچ کام لەم جۆرە مەرجانە لەسەر لایەنی کڕیار وخاوەن پارە دابنێ، چونکە ئەو پارەی لای کڕیارەکەیە وهەریەك لەم مەرجانە دابنێت یەکسەر دەبێت بەسوو، وکارەکە حەرام دەکات، وگرێبەستەکەیش هەڵدەوەشێنێتەوە[2].

---

١ - ئەمە ئەگەر هاتوو دواکەوتنەکە بەهۆی کەمتەرخەمی بەڵێندەرەکەوە بوو، بەڵام ئەگەر دەرکەوت دواکەوتنەکە بەهۆی شتێکی دەرەکییەوە بوو کەلەتوانای ئەودا نەبووە، ئەوکات حەرامە سزا بدرێت وغەرامە بکرێت.

٢ - کۆمکاری فیقهی ئیسلامیی لەو بارەیەوە دەڵێت: إن مجمع الفقه الإسلامي المنعقد في دورة مؤتمره السابع بجدة في المملكة العربية السعودية من ٧-١٢ ذي القعدة ١٤١٢هـ الموافق ٩ – ١٤ أيار (مايو) ١٩٩٢ م، بعد اطلاعه على البحوث الواردة إلى المجمع بخصوص موضوع عقد الاستصناع، وبعد استماعه للمناقشات التي دارت حوله، ومراعاة لمقاصد الشريعة في مصالح العباد والقواعد الفقهية في العقود والتصرفات، ونظرا لأن عقد الاستصناع له دور كبير في تنشيط الصناعة، وفي فتح مجالات واسعة للتمويل والنهوض بالاقتصاد الإسلامي قرر ما يلي:

أولا: إن عقد الاستصناع – وهو عقد وارد على العمل والعين في الذمة – ملزم للطرفين إذا توافرت فيه الأركان والشروط .

ثانيا: يشترط في عقد الاستصناع ما يلي:

أ- بيان جنس المستصنع، ونوعه، وقدره، وأوصافه المطلوبة.

ب- أن يحدد فيه الأجل.

ثالثا: يجوز في عقد الاستصناع تأجيل الثمن كله، أو تقسيطه إلى أقساط معلومة لآجال محددة .

رابعا: يجوز أن يتضمن عقد الاستصناع شرطا جزائيا بمقتضى ما اتفق عليه العاقدان ما لم تكن هناك ظروف قاهرة. والله أعلم.

مجلة المجمع،ع ٧، ج٢، ص ٢٢٣، قرار رقم: ٦٥ ( ٣/٧) بشأن عقد الاستصناع.

ئەم مەرجانە بۆ ئەو حاڵەتەیە کە ئەگەر کەسی بەڵێندەر خۆی ڕاستەوخۆ هەستا بە ئەنجامدانی کارەکە، بەڵام ئەگەر ئەویش کەسێکی تری ڕاسپارد کارەکە ئەنجام بدات[1]، ئەو کات کۆمەڵێك مەرجی تر هەیە زیاد لەو مەرجانەی تر کەلەسەرەوە باسمان کرد پێویستە لایەنەکان پێوەی پابەند بن مەرجەکانیش بریتین لە:

٤- نابێت کاری بەڵێندەری یەکەم خۆی لەگرێبەستەکەدا بەمەرج گیرا بێت یان نرخێکی مەعنەوی هەبێت، بۆ نموونە کەسێك دەچێت لەگەڵ بەڵێندەرێکی خاوەن ئەزموون گرێبەستێك دەکات خانوویەکی بۆ دروست بکات، دروست نیە ئەم بەڵێندەرە بڕوات لەگەڵ کەسێکی بێ ئەزموون گرێبەست بکات وبەو بڵێت خانووەکە دروست بکە، چونکە لایەنی کڕیار لەبەر ئەزموونەکەی ئەمی هەڵبژاردوە، بۆیە ئەم خاڵە وەکو مەرج سەیر دەکرێت.

یان کەسێك دەچێت لەگەڵ بانکێك ڕێك دەکەوێت کە ئۆتۆمبێلێکی لەمارکەی پۆرش بۆ دروست بکات، هەمووومان دەزانین کە مارکەی ئەم کۆمپانیایە وبەرهەمەکانی، نرخیان لەنرخی بەرهەمی زۆرێك لەکۆمپانیاکانی تر زیاترە، بۆیە بانکەکە ناتوانێت بڕوات گرێبەست لەگەڵ کۆمپانیایەکی تر بکات تا ئەو ئۆتۆمبێلەکە بۆ لایەنی یەکەم دروست بکات، با هەموو مەرجەکە داواکراوەکانیشی تێدا بێت؛ چونکە مارکەی پۆرش لەگەڵ هەر مارکەیەکی تر جیاوازە، ئەویش بۆیە ئەو مارکەیەی هەڵبژاردوە.

٥- دەبێت بەڵێندەری یەکەم بەشێوازێکی سەربەخۆ وگرێبەستێکی نوێ لەگەڵ بەڵێندەری دووەم ڕێك بکەوێت، ونابێت لەیەك گرێبەستەدا ئەو جۆرە ڕێکەوتنە ئەنجام بدرێت.

٦- هەموو بەرپرسیارێتیەکی جێبەجێکردنی پرۆژەکە بەو شێوازەی کە لایەنی یەکەم لەگەڵ بەڵێندەری یەکەم ڕێکەوتوە، هەر لە ئەستۆی بەڵێندەری یەکەمە، وئەو لەهەموو کەم وکورتییەکانی پرۆژەکە بەرپرسیارە، وبۆی نییە لایەنی کڕیار یان داواکار بەرەو ڕووی بەڵێندەری دووەم بکاتەوە، بەو بیانووەی کە جێبەجێ کاری پرۆژەکە بەڵێندەری دووەمە؛

---

١ - لەم جۆرە گرێبەستانەدا مەرج نییە لایەنی بەڵێندەر خۆی ڕاستەوخۆ شتەکە دروست بکات، بەڵکو ئەویش دەتوانێت بڕوات لەگەڵ کەسێکی تر گرێبەست بکات ولایەنی سێیەم شتەکە دروست بکات، وبەم شێوازەیش دەگوترێت (الإستصناع الموازی).

چونکە لایەنی داواکار هیچ پەیوەندییەکی لەگەڵ بەڵێندەری دووەم نییە، وهیچ گرێبەستێکیش لەنێوانیاندا نییە.

٧- هەر سەرپێچی وزیانێك لەنێوان بەڵێندەری یەکەم ودووەم دروست بێت، لایەنی یەکەم لێی بەرپرسیار نییە وهیچ پەیوەندی بەوەوە نییە، وبەڵێندەری یەکەم لێی بەرپرسیارە.

## چوارەم: بەقەرز کڕین بەگران، وبەحازر فرۆشتنەوە بە کەمتر (الزرنقة) (التورق)[١]:

ئەمە ڕێگە چارەیەکی ترە بۆ خۆ پاراستن لە سوو، لەم شێوازە مامەڵەیەدا لایەنێك کە پێویستی بەپارەیە، لەبری ئەوەی بچێت بە سوو پارە وەربگرێت، دەڕوات ئۆتۆمبێلێك یان خانوویەك یان هەرشتێکی تر بەقەرز دەکرێت بەنرخێکی زیاتر، ودواتر دەچێت دەیفرۆشێتەوە بەپارەی حازر بەنرخێکی کەمتر، وبەمەیش دەسمایەی دەست دەکەوێت، ودەتوانێت بازرگانی پێوە بکات، وپارەی قەرزەکەیشی بەگوژمە بداتەوە.

هەر چەندە هەندێك لە زانایانی وەك ئیبن تەیمیە و ئیبن قەییم ئەم شێوازی مامەڵەیەیان پێ دروست نەبووە، بەڵام زۆرینەی زانایان لەحەنەفی، ومالیکی، وشافیعی، وحەنبەلییەکان، وزانایانی هاوچەرخیش بەکۆی دەنگ ڕێگەیان پێداوە[٢].

---

١ - شافیعییەکان بەم جۆرە مامەڵەیە دەڵێن (الزرنقة). حەنبەلییەکانیش پێی دەڵێن (التورق).

٢ - بڕوانە: إبن عابدين، حاشية إبن عابدين، ج٥، ص٣٢٦، مصدر سابق. الصاوي (أحمد بن محمد الخلوتي)، بلغة السالك لأقرب المسالك إلى مذهب الإمام مالك، ج٣، دار المعارف/ بيروت، ص١٣٠. زكريا الأنصاري (زكريا بن محمد بن زكريا الأنصاري)، أسنى المطالب في شرح روض الطالب، ج٢، دار الكتاب الإسلامي، بيروت، ص٤١. المرداوي (علي بن سليمان المرداوي)، الإنصاف في معرفة الراجح من الخلاف، ج٤، دار إحياء التراث العربي، بيروت، ص٣٣٧.

سەبارەت بە بۆچوونی زانایانی هاوچەرخیش کۆمکاری فیقهی ئیسلامی دەربارەی ئەم جۆرە مامەڵەیە دەڵێت: (إن مجلس المجمع الفقهي الإسلامي برابطة العالم الإسلامي في دورته الخامسة عشرة المنعقدة بمكة المكرمة التي بدأت يوم السبت ١١ رجب ١٤١٩ هـ الموافق ٣١ /١٠ / ١٩٩٨ م قد نظر في موضوع حكم بيع التورق، وبعد التداول والمناقشة، والرجوع إلى الأدلة، والقواعد الشرعية، وكلام العلماء في هذه المسألة قرر المجلس مايأتي:

أولا: أن بيع التورق: هو شراء سلعة في حوزة البائع وملكه بثمن مؤجل، ثم يبيعها المشتري بنقد لغير البائع، للحصول على النقد.

ثـانـيا: أن بيع التورق هذا جائز شرعا، وبه قال جمهور العلماء؛ لأن الأصل في البيوع الإباحة، لقول الله تعالى: ﴿وَأَحَلَّ اللهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا﴾. البقرة: ٢٧٥، ولم يظهر في هذا البيع ربا لاقصدا ولا صورة؛ ولأن الحاجة داعية إلى ذلك لقضاء دين، أو زواج أو غيرهما.

بەڵام بەهۆی ئەوەی کە لەوانەیە ئەم جۆرە مامەڵەیە سەر بکێشێت بۆ کار ودیاردەی خراپ و خەڵکانێك خراپ بەکاری بهێنن زانایان کۆمەڵێك مەرجیان بۆ داناوە کە بریتین لە:

١- نابێت کڕیار کاڵاکە بفرۆشێتەوە بەو کەسەی کە لێی کڕیوە، یان هەرکەسێك کە شەریکی ئەو بێت، یان ئەو ڕایسپاردبێت؛ بەڵکو بۆی هەیە بیفرۆشێت بەهەرکەسێکی تر کە پەیوەندی بەفرۆشیاری یەکەمەوە نەبێت. جگە لەمە بۆیشی نییە بیکاتە بریکار (وکیل) بۆ ئەوەی کاڵاکەی بۆ بفرۆشێتەوە بەکەسێکی تر، بەڵکو دەبێت خۆی کاڵاکە بەکەسێك بفرۆشێتەوە کە هیچ پەیوەندییەکی بەفرۆشیاری یەکەمەوە نەبێت.

بۆیە ئەوەی ئێستا لە هەندێك بانك یان کۆمپانیادا ڕوودەدات کە کەسەکە کاڵاکە لەبانك دەکڕێت بەڵام وەری ناگرێت و هەر بانك خۆی دەکاتە وەکیل بۆ ئەوەی کاڵاکەی بۆ بفرۆشێتەوە بەکەسێکی تر و لە نێوەندە بازرگانییەکاندا بە (التورق المنظم) ناسراوە بەهیچ شێوەیك شەرعی و دروست نییە.

٢- دەبێت بەشێوازێکی کرداری وڕاستەقینە کاڵاکە بکڕێت وببێتە خاوەنی و وەریبگرێت ئەوجا بیفرۆشێتەوە بەکەسێکی تر، نەوەك هەر تەنها قسەو بەڵێن بێت؛ چونکە مامەڵەکە بەو شێوەیە حەرام دەبێت.

٣- دەبێت تەنها بۆ حاڵەتی پێویستی و پاش بێ هیوابوون لەڕێگە چارە شەرعییەکانی تری وەك قەرز و زەکات و خێر پەنا بۆ ئەم جۆرە مامەڵەیە ببرێت، نەوەك بکرێتە ئامڕازێکی بازرگانی و هۆکارێك بۆ خۆ دەوڵەمەند کردن؛ چونکە ئەو کات ئەم جۆرە مامەڵەیە حەرام دەبێت و دروست نییە.

---

ثـالـثـا: جواز هذا البيع مشروط بأن لايبيع المشتري السلعة بثمن أقل مما اشتراها به على بائعها الأول لا مباشرة ولا بالواسطة، فإن فعل فقد وقعا في بيع العينة المحرم شرعا؛ لاشتماله على حيلة الربا فصار عقدا محرما).

ليژنەی هەمیشەیی توێژینەوەی زانستی وفەتوای سعودیش دەڵێت: (مسألة التورق هي أن تشتري سلعة بثمن مؤجل، ثم تبيعها بثمن حال على غير من اشتريتها منه بالثمن المؤجل؛ من أجل أن تنتفع بثمنها، وهذا العمل لا بأس به عند جهور العلماء). أحمد بن عبد الرزاق الدويش، فتاوى اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والإفتاء، ج١٣،ص١٦٢.

## پێنجەم: فرۆشتنی پێشوەخته (بيع السلم)[١]:

بیرۆکەی ئەم مامەڵەیە بەو شێوەیەیە کە کاتێك لایەنێکی وەکو حکومەت یان هەر کارگە یان کۆمپانیایەك پێویستی بەپارە ودەسمایە دەبێت، بۆ بەگەڕ خستنی کارگە وپرۆژەکانی، یان دەزگا وەبەرهێنەرەکانی، لەبری ئەوەی پارە بەسوو وەربگرێت، دەتوانێت بەشێك لەبەرهەمەکانی وەکو نەوت یان غاز یان هەر بەهەمێکی تری پێشوەخت بەپارەیەکی هەرزانتر لەبازاڕ بفرۆشێت و پارەکەی وەربگرێت، وپاش ماوەیەکی تر کاڵاکە بەرهەم بهێنێت یان دروستی بکات و ڕادەستی لایەنی کڕیاری بکات.

بەمەیش خاوەن پرۆژەو و کارگەکان سوود لەو پارانە وەردەگرن وپرۆژە وبەرهەمەکانی خۆیانی پێ بەگەڕ دەخەن و زیاد دەکەن، خاوەن دەسمایەکانیش سوود لەهەرزانی نرخەکان دەبینن. و هەردوولا قازانج دەکەن.

کەواتە فرۆشتنی پێشوەخته (سلم): بریتییە لە فرۆشتنی کاڵایەکی دیاری ئامادەنەبوو زانراو بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بەنرخێکی حازر و ئامادە.

زانایان ئەم جۆرە مامەڵەیەیان ناوناوە بە (بيع المحاويج) واتا: فرۆشتنی خەڵکانی خاوەن پێداویستی.

عەبدوڵلای کوڕی عەبباس دەڵێت: (قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ الْمَدِينَةَ، وَهُمْ يُسْلِفُونَ بِالتَّمْرِ السَّنَتَيْنِ وَالثَّلَاثَ، فَقَالَ: {مَنْ أَسْلَفَ فِي تَمْرٍ، فَلْيُسْلِفْ فِي كَيْلٍ مَعْلُومٍ، وَوَزْنٍ مَعْلُومٍ، إِلَى أَجَلٍ مَعْلُومٍ}..)[٢].

واتە: کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ تەشریفی هێنایە مەدینە، خەڵکی مەدینە بۆ ماوەی دووساڵ وسێ ساڵ پێش وەخت خورمایان دەکڕی، پێغەمبەری خودا ﷺ پێی فەرموون: هەرکەس شتێکی کڕی کە ئێستا بوونی نیە، با شتێك بکڕێت کە پێوانە، وکێشانە، وکاتی ڕادەستکردنی دیار وزانراو بێت.

ئەم جۆرە مامەڵەیەیش ناچێتە خانەی فرۆشتنی شتی نەبووەوە (بيع المعدوم) و ئەو فەرموودەیەی کە حەکیمی کوڕی حیزام دەیگرێتەوە کە دەڵێت: (قُلْتُ يَا رَسُولَ اللهِ ﷺ يَأْتِينِي

---

١ - لێرەوە بەشی دەیەمی بەرنامەکە دەستپێدەکات؛ کە لە ڕۆژی (٢٠١٥/٢/٧) تۆمار کرا. بەڵام لەبەر ئەوەی بەشی نۆیەم و دەیەمی باسەکە لەسەر یەك بابەتن بۆیە لێرەدا وەك یەك بەش دامانناوە تا هزری خوێنەر پەرت نەبێت.

٢ - البخاري، صحيح البخاري، ج٣، ص٨٥، رقم الحديث (٢٢٤٠)، مصدر سابق. مسلم، صحيح مسلم، ج٥، ص٥٥، رقم الحديث (٤٢٠٢)، مصدر سابق، واللفظ لمسلم.

الرّجُلُ يَسْأَلُنِي مِنْ الْبَيْعِ مَا لَيْسَ عِنْدِي فَأَبِيعُهُ مِنْهُ ثُمّ أَبْتَاعُهُ مِنْ السّوقِ فَقَال: {لَا تَبِعْ مَا لَيْسَ عِنْدَكَ}..)[1]. واتە: گوتم ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ کەسی وا دێتە لام داوای فرۆشتنی شتێکم لێ دەکات کەخۆم نیمە، منیش پێی دەفرۆشم، ودواتر دەچم لە بازاڕ دەیکڕم وڕادەستی ئەوی دەکەم. پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: شتێك مەفرۆشە کە خاوەنی نیت.

چونکە ئەم فەرموودەیە تایبەتە بەفرۆشتنی شتێکی دیاریکراو کە هی کەسێکی ترە، بۆ نموونە فرۆشتنی خانوویەك یان ئۆتۆمبێلێکی دیاریکراو کە هی کەسێکی ترە، وئێمە خاوەنی نین، ئیتر چۆن مافی ئەوە بدەین بەخۆمان کەبیفرۆشین بەکەسێکی تر وکێ دەڵێت خاوەنەکەی دەیفرۆشێت؟!، یان لەوانەیە بەر لەوەی ئێمە بیکڕین بفەوتێت، ئەمەیش جیاوازە لەوەی کە تۆ شتێك بفرۆشیت کە بڕو قەبارە وشێوەی زانراو بێت، بەڵام دیاریکراو نەبێت، چونکە دڵنیاین لەوەی کە لەو شێوەیەمان هەر دەست دەکەوێت، وهاوشێوەی فرۆشراوەکە زۆرە لەبازاڕدا، وەك ئەوەی کەسێك مامەڵەی ئۆتۆمبێل یان مۆبایل یان تەلەفیزۆنێك کە لە ئێستادا نییەتی - و گشت مۆدێل و مواسەفاتەکانی دیار وزانراوە و لە سەدەها شوێن دەست دەکەوێت - لەگەڵ کەسێك بکات و دواتر بۆی بهێنێت و پێی بفرۆشێت.

زانایان ئەو شتانەی لەکاتی گرێبەستدا بوونیان نییە و مامەڵەیان لەسەر دەکرێت دەکەن بەسێ بەشەوە:

١- نەبوویەکی زانراو: کە هەموو سیفاتەکانی دیار وئاشکرا بێت، وهاوشێوەی زۆر بێت وفرۆشتنی ئەم جۆرەیش بەکۆی دەنگ دروستە.

٢- نەبوویەك کە پاشکۆ وپەیوەستەی شتێکی هەبووە، وئەمانیش دەبن بە دووبەشەوە:

أ- بەشێکیان کڕین وفرۆشتنیان دروستە، وەکو ئەو بەروبوم وبەرهەمانەی کە جیاوازییەکی ئەوتۆ لەنێوان دانەکانیدا نییە، بۆ نموونە: بەرهەمەکانی هەر کارگەیەك هەموو نموونەکانی وەك یەکن، وجیاوازییەکی ئەوتۆ لەنێوان دانەکانیدا نییە، بۆ نموونە:

---

١ - البيهقي، السنن الكبرى، ج٥ص٢٦٧، رقم الحديث (١٠٧٢٥) مصدر سابق. والحديث صححه الألباني في إرواء الغليل، أنظر. الألباني، إرواء الغليل، ج٥، ص١٤٢، رقم الحديث (١٢٩٢)، مصدر سابق.

تۆ کاتێك ئۆمبێلێکی دروستکراوی کارگەیەك دەبینیت، دەتوانیت هەزار ئۆتۆمبێل لەو کارگەیە بکڕیت کەئێستا بوونی نییە، وپاش دوو ساڵی کە ئۆتۆمبێلەکان وەربگریت، چونکە جیاوازیەکی ئەوتۆ لەنێوان ئەوەی هەیە وئەوەیشی نییە دروست نابێت، فرۆشتنی ئەم جۆرەیش دروستە و هیچ کێشەی نییە.

ب- بەشەکەی تریشیان ئەوەیە کە لەوانەیە جیاوازی بەرچاو لەنێوان دانەکانی بەرهەمەکەدا دروست بێت، وەکو شوتی، وکاڵەك، وئەم جۆرە بەرهەمانە، کەزۆر ئاستەمە بتوانیت خەملاندنی بۆ بکەیت، بۆ نموونە شوتی هەیە لەوانەیە (٢٠کغم) بێت وهەیشە لەوانەیە تەنها (٢کغم) بێت.

زانایان لەسەر فرۆشتنی ئەم بەشە دوو بۆچوونیان هەیە:

- بۆچوونی پەسەند ئەوەیە کە فرۆشتنی ئەم بەشەیش دروستە وکێشەی نییە؛ چونکە لەکۆی گشتیدا دەتوانین لەسەر کێشێکی مام ناوەند ڕێك بکەوین.

- بۆچوونەکەی تر پێی وایە کە ئەم جۆرە بەرهەمانە هەتا پێنەگەن فرۆشتنیان دروست نییە، وئەم بۆچوونەیش لاوازە وئاستەنگی زۆر بۆ جوتیار وخەڵکانی وەبەرهێن دروست دەکات، وبەپێی ئەم بۆچوونە بێت دەبێت ئەم جۆرە بەرهەمانە هەتا بەتەواوی پێنەگەن کڕین وفرۆشتنیان پێوە نەکرێت.

٣- نەبوویەك کە ئەگەری بوونی لاوازە ونازانین بەردەست دەبێت یان نا، ئەمەیان زانایان بەکۆی دەنگ پێیان وایە فرۆشتنی حەرامە، نەك لەبەر ئەوەی لەئێستادا بوونی نیە، بەڵکو لەبەر ئەوەی لەدواتریشدا ئەگەری بوونی لاوازە ومەترسی نەبوونی لێدەکرێت، وئەمەیش گرێبەستەکە پوچ دەکاتەوە.

ئەم بەشەیە کە لەفەرموودەکەی حەکیمی کوڕی حیزامدا ڕێگری لەفرۆشتنی کراوە نەك بەشەکانی تر، ئیبن قەییم لەڕاڤەی ئەو فەرموودەیەدا دەڵێت: (ليس في كتاب الله، ولا في سنة رسول الله ﷺ، ولا في كلام أحد من الصحابة أن بيع المعدوم لا يجوز، لا بلفظ عام ولا بمعنى عام، وإنما في السنة النهي عن بيع بعض الأشياء التي هي معدومة، كما فيها النهي عن بيع بعض الأشياء الموجودة، فليست العلة في المنع لا العدم ولا الوجود، بل الذي وردت به السنة النهي عن بيع الغرر، وهو ما لا يقدر على تسليمه، سواء كان موجودا أو معدوما

كبيع العبد الآبق والبعير الشارد إن كان موجودا؛ إذ موجب البيع تسليم المبيع، فإذا كان البائع عاجزا عن تسليمه فهو غرر، ومخاطرة، وقمار)[١]. واتە: نە لەقورئانەکەی خوای گەورە، ونەلەسوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺ ونە لە قسەی هیچ کام لە هاوەڵانی پێغەمبەردا ﷺ نەهاتووە، کە فرۆشتنی شتی نەبوو دروست نییە؛ بەڵکو ئەوەی لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە ڕێگری لەفرۆشتنی هەندێك شتی نەبوو کراوە، هەر وەك چۆن ڕێگری لە فرۆشتنی هەندێك شتی هەبوویش کراوە، کەواتە هۆکاری ڕێگیریەکە بوون ونەبوونی کاڵاکە نییە، بەڵکو ئەوەیە کە شتەکە نەزانراوە و داهاتووی دیار نییە وتوانای ڕادەستکرنی نییە، جا هەبێت یان نا جیاوازی نییە، وەکو فرۆشتنی کۆیلەیەکی هەڵهاتوو، یان وشترێکی ونبوو با بوونیشیان هەبێت؛ چونکە یەکێك لە بنەماکانی فرۆشتن ڕادەستکردنی شتە فرۆشراوەکەیە بە کڕیارەکە، خۆ ئەگەر کەسی فرۆشیار توانای ڕادەستکردنی کاڵاکەی نەبوو ئەوە نەزانی، ومەترسی، وقومار دروست دەکات.

لەشوێنێکی تردا وبۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی مەبەستەکەی وەڵامی گومانێکی تر دەداتەوە ودەڵێت: (وقد ظن طائفة أن بيع السلم مخصوص من النهى عن بيع ما ليس عنده، وليس هو كما ظنوه فإن السلم يرد على أمر مضمون في الذمة ثابت فيها مقدور على تسليمه عند محله ولا غرر في ذلك ولا خطر)[٢]. واتە: هەندێك پێیان وایە فرۆشتنی پێشوەختە تایبەت کراوە ودەرهێنراوە لەحوکمی فرۆشتنی ئەوشتانەی کەبەهۆی نەبوونیانەوە ڕێگری لەفرۆشتنیان کراوە، ئەم گومانەیشیان لەجێی خۆیدا نییە؛ چونکە فرۆشتنی پێشوەخت بۆ کاڵایەکی دیاری جێگیر دێت لەئەستۆی خاوەنەکەی کەتوانای ڕادەستکردنی هەیە لەکات و شوێنی دیاریکراوی خۆیدا، وئەمەیش هیچ مەترسی ونەزانراویەکی تێدا نییە.

بەڵام ئەم مامەڵەیەیش وەك سەرجەم مامەڵەکانی تر کۆمەڵێك مەرجی تایبەتی خۆی هەیە، کە پێویستە لایەنەکانی گرێبەستەکە پێوەی پابەند بن، مەرجەکانیش بریتین لە:

---

١ - إبن القيم (محمد بن أبي بكر)، إعلام الموقعين عن رب العالمين، ج٢، دراسة وتحقيق: طه عبد الرؤوف سعد، مكتبة الكليات الأزهرية، القاهرة، ط١٣٨٨هـ/١٩٦٨م، ص٣٠.

٢ - إبن القيم (محمد بن أبي بكر)، زاد المعاد في هدي خير العباد، ج٥، ط١٤، مؤسسة الرسالة- بيروت، مكتبة المنار الإسلامية- الكويت، ص٧٨، تحقيق: شعيب الأرناؤوط - عبد القادر الأرناؤوط.

١- دەبێت هەموو سیفاتەکانی کاڵا فرۆشراوەکە زانراوبێت، لەڕووی جۆر، وکێش، وقەبارە، وهتد. هەر وەك لە فەرمووودەکەدا هاتووە: {فَلْيُسْلِفْ فِي كَيْلٍ مَعْلُومٍ، وَوَزْنٍ مَعْلُومٍ، إِلَى أَجَلٍ مَعْلُومٍ}. بۆ نموونە: ئێمە ئۆتۆمبێلێکمان بەپارەی پێشەکی فرۆشتوە بۆ شەش مانگی تر، دەبێت هەموو مواسەفاتەکانی ئەو ئۆتۆمبێلە لەڕووی نرخ، وجۆر، ومۆدێل، ورەنگ، وقەبارە، وگشت وردەکارییەکانی تری ڕوون وئاشکرا بێت وەك ئەوەی لەبەر چاو بێت، ئەگەر نا ئەوە مامەڵەکە نەزانی تێدەکەوێت، ودروست نابێت.

٢- نابێت نرخ وکاڵاکە هاوڕەگەز بن بەتایبەتی لەو شتانەی کە سوویان تێدا دروست دەبێت: بۆ نموونە نابێت نرخەکە دینار یان دۆلار یان هەر دراوێکی تر بێت وکاڵاکەیش ئاڵتون یان زیو بێت، یان نرخەکە گەنم بێت وکاڵاکەیش گەنم یان جۆ یان هەر دانەوێڵەیەکی تر بێت، چونکە ئەوانە هەموویان سوویان تێدا دروست دەبێت وشەرعی نییە بەو شێوەیە مامەڵەیان پێوە بکرێت، بەڵام دەکرێت نرخەکە دراوبێت وکاڵاکە گەنم یان جۆ بێت.

٣- دەبێت کاڵاکە ئێستا ئامادە نەبێت وبۆ ماوەیەکی تر بەردەست بێت، خۆ ئەگەر ئێستا یان تا یەك دوو ڕۆژی تر بەردەست بوو ئەوە پێی ناگوترێت سەلەم، بەڵکو مامەڵەیەکی ئاساییە.

٤- دەبێت کاڵاکە شتێکی دیاریکراوی سنوردار یان دانسقە ودەگمەن نەبێت، بۆ نموونە: لەسەر ئەوە ڕێك بکەون کە لە گەنمەکەی زەوی فلان کەس گەنمی بداتێ، یان ئۆتۆمبێلەکەی فلان کەسی پێ بفرۆشێت، یان دەبێت شتەکە بەرهەمی فرۆشیار خۆی بێت، ئەمانە هیچیان دروست نین؛ چونکە کێ دەڵێت زەوی فلان کەس ئەو ساڵە بەرهەمی دەبێت، یان ئۆتۆمبێلی فلان کەس تا ئەو کات دەمێنێت یان دەیفرۆشێت، یان ئەو کەسە خۆی ئەو کاڵایەی پێ بەرهەم دەهێنرێت، بەڵکو ئێمە جۆری شتەکە دیاری دەکەین، وکەسی فرۆشیار پێویستە لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا شتەکەمان بەو مواسەفاتەی لەسەری ڕێکەوتوین بۆ ئامادە بکات، ئیتر چۆنە وەی هەرکەسێکە ئەوە کێشە نییە.

٥- دەبێت كاتی بەردەستبوون ورادەستكردنی كاڵاكە دیاریكراو بێت، ودڵنیایش بین كە كاڵاكە لەو كاتەدا بوونی دەبێت[1]؛ چونكە یەكێك لەو مەجانەی تر كە پێغەمبەری خودا ﷺ لەفەرمووودەكەیدا باسی كردوە دەبێت: {إِلَى أَجَلٍ مَعْلُومٍ}. بێت. خۆ ئەگەر ئەو كاتە بەردەست نەبوو ئەوە كڕیارەكە سەرپشك دەكرێت لەچاوەڕوانكردنی پەیداكردنی كاڵاكە، یان هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستەكە و وەرگرتنەوەی پارەكەی.

٦- دەبێت نرخی كاڵاكە ڕادەستی فرۆشیار بكرێت وقەرز نەبێت؛ چونكە ئەگەر نرخەكەیش بوو بەقەرز وكاڵاكەیش خۆی قەرزە ئەو كات دەچێتە ژێر خانەی فرۆشتنی قەرز بەقەرز وئەمەیش زانایان بەكۆی دەنگ دەڵێن حەرامە، بەڵام ئەگەر دواكەوتنەكە بۆ دووسێ ڕۆژ بێت و پاساوی شەرعی هەبێت كێشەی نییە و دروستە[2].

خۆ ئەگەر كەسی كڕیار بەشێك لەپارەكەی ڕادەست كرد، ئەو كات گرێبەستەكە تەنها لەو بەشەدا دروستە كەپارەكەی ڕادەست كراوە، وئەوەی تری هەڵدەوەشێتەوە، بۆ نموونە ئەوان لەسەر فرۆشتنی دە تەن گەنم ڕێكەوتون، بەڵام كەسی كڕیار تەنها پارەی پێنج تەنی ڕادەست كردوە، لەم حاڵەتەدا گرێبەستەكە تەنها بۆ پێنج تەنیان دروستە وئەوەی تر كەپارەكەی ڕادەست نەكراوە هەڵدەوەشێتەوە.

٧- لە ئەگەری دواكەوتنی ڕادەستكردنی كاڵاكە نابێت گرێبەستكە مەرجی سزایی دارایی لەسەر فرۆشیار دابنێت، وئەگەر ئەو مەرجەی تێدا بوو یەكسەر دەبێتە سوو ومامەڵەكە حەرام دەبێت.

---

١ - لێرەدا مەرج نیە ڕۆژێكی دیاری كراو باس بكرێت، بەڵكو دەتوانین بڵێین بۆ وەرزی پێگەیشتنی بەروبوومەكە، یان كاتی دروێنە.

٢ - حەنەفی، وشافیعی، وحەنبەلییەكان دەڵێن ئەگەر دواكەوتنەكە بۆ ماوەیەكی كەمیش بێت هەر حەرامە و دروست نییە ودەبێت لە كاتی ئەنجامدانی گرێبەستەكەدا دەستبەجێ پارەكە ڕادەستی فرۆشیار بكرێت وبەهیچ شێویەك دوا نەكەوێت. مالیكییەكانیش هاوڕان لەگەڵیان لەسەر ئەوەی كەدەبێت یەكسەر پارەكە ڕادەست بكرێت؛بەڵام دەڵێن ئەگەر بە هەر هۆكارێك تا سێ ڕۆژ دوا بكەوێت ئەوە كێشەی نییە، چونكە ماوەیەكی كەمە، بەڵام لەوە زیاتر بەكۆی دەنگ دەڵێن دروست نییە. وزۆرینەی زانایانی هاوچەرخیش لەبەر ئاسانكاری بۆچوونی مالیكییەكان پەسەند دەكەن. بڕوانە: إبن رشد (محمد بن أحمد بن رشد)، المقدمات الممهدات، ج٢، ط١، دار الغرب الإسلامي، بيروت، ١٤٠٨، ص٢٨.

٨- نابێت ئەو کاڵایەی کە بەسەلەم کڕدراوە مامەڵەی کڕین وفرۆشتنی پێوە بکرێت تا وەردەگیرێت[(١)]، [(٢)].

---

١ - ئەمەیش بۆچوونی زۆرینەی زانایانی حەنەفی، ومالیکی، وشافیعی، وحەنبەلییەکان، وئیبن تەیمیەیە لەیەکێك لە لە بۆچوونەکانیدا، وئەمان پێیان وایە تا کاڵاکە وەرنەگیرێت، نابێت کڕین وفرۆشتنی پێوە بکرێت لەگەڵ هیچ کەس، نەفرۆشیاری یەکەمی ونە غەیری ئەویش، ئیبن قودامە لەو بارەیە دەڵێت: (أما بيع المسلم فيه قبل قبضه، فلا نعلم فی تحريمه خلافا). إبن قدامه، المغنی، ج٤، ص٢٢٧، مصدر سابق. وکۆمکاری فیقهی ئیسلامیش پشتگیری ئەم بۆچونە دەکات ولەو بارەیەوە دەڵێت: مع التأكيد على قرار المجمع رقم ٦٣ (١/٧) بشأن عدم جواز بيع المسلم فيه قبل قبضه ونصه: (لا يجوز بيع السلعة المشتراة سلما قبل قبضها) انتهى.

٢ - ئەمەیش بڕیارێکی کۆمکاری فیقهی ئیسلامیە دەربارەی ووردەکاریەکانی مامەڵەی سەلەم وئەو مەرجانەی کە باسمان کرد:

إن مجلس مجمع الفقه الإسلامي الدولي المنعقد في دورة مؤتمره التاسع بأبو ظبي بدولة الإمارات العربية المتحدة من (١ – ٦) ذي القعدة ١٤١٥هـ، الموافق ١ – ٦ نيسان (إبريل) ١٩٩٥م، بعد اطلاعه على البحوث الواردة إلى المجمع بخصوص موضوع السلم وتطبيقاته المعاصرة، وبعد استماعه إلى المناقشات التي دارت حوله، قرر ما يلي:

أولا: بشأن (السلم):

أ- السلع التي يجري فيها عقد السلم تشمل كل ما يجوز بيعه، ويمكن ضبط صفاته، ويثبت دينا في الذمة، سواء أكانت من المواد الخام، أم المزروعات، أم المصنوعات.

ب- يجب أن يحدد لعقد السلم أجل معلوم، إما بتاريخ معين، أو بالربط بأمر مؤكد الوقوع، ولو كان ميعاد وقوعه يختلف اختلافا يسيرا لا يؤدي للتنازع كموسم الحصاد.

ج- الأصل تعجيل قبض رأس مال السلم في مجلس العقد، ويجوز تأخيره ليومين أو ثلاثة ولو بشرط، على أن لا تكون مدة التأخير مساوية أو زائدة عن الأجل المحدد للسلم.

د- لا مانع شرعا من أخذ المسلم (المشتري) رهنا أو كفيلا من المسلم إليه (البائع).

ه- يجوز للمسلم ( المشتري ) مبادلة المسلم فيه بشيء آخر – غير النقد – بعد حلول الأجل، سواء كان الاستبدال بجنسه أم بغير جنسه. حيث إنه لم يرد في منع ذلك نص ثابت ولا إجماع، وذلك بشرط أن يكون البدل صالحا لأن يجعل مسلما فيه برأس مال السلم.

و- إذا عجز المسلم إليه عن تسليم المسلم فيه عند حلول الأجل فإن المسلم (المشتري) يخير بين الانتظار إلى أن يوجد المسلم فيه، وفسخ العقد وأخذ رأس ماله، وإذا كان عجزه عن إعسار فنظرة إلى ميسرة.

ز- لا يجوز الشرط الجزائي عن التأخير في تسليم المسلم فيه؛ لأنه عبارة عن دين، ولا يجوز اشتراط الزيادة في الديون عند التأخير.

ح- لا يجوز جعل الدين رأس مال للسلم؛ لأنه من بيع الدين بالدين.

ثانيا: بشأن (التطبيقات المعاصرة للسلم):

انطلاقا من أن السلم في عصرنا الحاضر أداة تمويل ذات كفاءة عالية في الاقتصاد الإسلامي وفي نشاطات المصارف الإسلامية، من حيث مرونتها واستجابتها لحاجات التمويل المختلفة، سواء أكان تمويلا قصير الأجل، أم متوسطا، أم طويلا، واستجابتها لحاجات شرائح مختلفة ومتعددة من العملاء، سواء أكانوا من المنتجين الزراعيين، أم الصناعيين، أم المقاولين، أم من التجار، واستجابتها لتمويل نفقات التشغيل، والنفقات الرأسمالية الأخرى. ولهذا تعددت مجالات تطبيق عقد السلم، ومنها ما يلي:

ئەمانە کۆی ئەو مەرجانە بوون کە پێویستە لە کڕین و فرۆشتنی پێشوەختەدا (بیع السلم) دا بوونیان هەبێت، خۆ ئەگەر مەرجێك لەو مەرجانە نەهاتە دی ئەو کات مامەڵەکە حەرامە و دروست نییە.

### شەشەم: هاوبەشیبوون بەپارە وکاری هاوبەش (المشارکة):

ئەمە یەکێکی ترە لە ڕێکارە شەرعییەکان بۆ خۆپاراستن لە سوو، بۆ نموونە کاتێك حکومەت یان کۆمپانیایەك یان بانکێك یان هەر کەسێك داوای پارە دەکات بۆ ئەنجامدانی پرۆژەیەك، لەبری ئەوەی پارە بەقەرز وبەسوو وەربگرێت، دەکرێت پێکەوە ولەگەڵ چەن لایەنێکی تر بەهاوبەشی پرۆژەکە ئەنجام بدەن ولەقازانج وزیانەکانیدا هاوبەش بن.

جیاوازی ئەم جۆرە لەهاوبەشیبوون لەگەڵ هاوبەشیبوونی بەشی چوارەم (المضاربة) کەباسمان کرد لەوەدایە:

لە (مضاربة) دا یەکێك لەلایەنەکان تەنها بەپارە هاوبەشی دەکات، ولایەنەکەی تریش تەنها بەهەوڵ وماندووبوونی خۆی، بەڵام لەم جۆرەیاندا هەردوو لا بەپارە وبەهەوڵیش بەشداری هاوبەشیبوونەکە دەکەن. هەربۆیە لە (مضاربة) دا ئەگەر پرۆژەکە زیانی کرد ئەو کات زیانەکە لەپارەی خاوەن دەسمایەکە دەکەوێت، ولایەنەکەی تر تەنها ماندوبوونەکەی زیان دەکات. بەڵام لەم جۆرە هاوبەشیبوونەدا هەردوو لا زیانی پارە وماندووبونیش دەدەن.

لەم جۆرە هاوبەشیبوونەدا مەرج نییە هاوبەشەکان ڕێژەی دەسمایەکانیان وەکو یەك بێت، یان ئەرك وماندوبوونیان لەبەگەڕخستنی پارەکاندا وەکو یەك بێت، هەر وەك چۆن

---

أ- يصلح عقد السلم لتمويل عمليات زراعية مختلفة، حيث يتعامل المصرف الإسلامي مع المزارعين الذين يتوقع أن توجد لديهم السلعة في الموسم من محاصيلهم أو محاصيل غيرهم التي يمكن أن يشتروها ويسلموها إذا أخفقوا في التسليم من محاصيلهم، فيقدم لهم بهذا التمويل نفعا بالغا ويدفع عنهم مشقة العجز المالي عن تحقق إنتاجهم.

ب- يمكن استخدام عقد السلم في تمويل النشاط الزراعي والصناعي، ولا سيما تمويل المراحل السابقة لإنتاج وتصدير السلع والمنتجات الرائجة، وذلك بشرائها سلما وإعادة تسويقها بأسعار مجزية.

ج- يمكن تطبيق عقد السلم في تمويل الحرفيين وصغار المنتجين الزراعيين والصناعيين عن طريق إمدادهم بمستلزمات الإنتاج في صورة معدات وآلات أو مواد أولية كرأس مال سلم مقابل الحصول على بعض منتجاتهم وإعادة تسويقها.

مجلة المجمع، ع٩، ج١، ص٣٧١، قرار رقم: ٨٥ (٩/٢).

مەرج نییە ڕێژەی قازانج وزیانیشیان وەکو یەك بێت، یان بەپێی ڕێژەی دەسمایەکانیان بێت، بەڵکو خۆیان لەسەر هەر ڕێژە وشێوەیەك بەپێی دەسمایە، وکارامەیی، وشارەزایی، وماندوبوونیان ڕێبکەون دروستە، بەڵام نابێت هیچ لایەکیان مەرجی ئەوە دابنێت کە زیان نەدات، چونکە ئەوە دەبێتە فێڵێك بۆ سووخۆری.

ئەم جۆرە لە هاوبەشیبوون چەندین جۆر و شێوازی هەیە لەوانە:

١- هاوبەشیبوونی جێگیر وبەردەوام (المشاركة الثابته طويلة الأجل): لەم شێوازی هاوبەشیبوونەدا لایەنەکانی هاوبەشیبوونەکە پێکەوە دەبنە خاوەنی پڕۆژەکە، یان کارە بازرگانییەکە، وهاوبەشیبوونەکەیان لەگەشت قازانج وزیانێکی پڕۆژە یان کارە بازرگانییەکەیاندا بەردەوام دەبێت، بەو ڕێژەیەی لەسەری ڕێکەوتون.

٢- هاوبەشیبوونی ڕوو لەکەمی کە بەخاوەندارێتی یەکێك لەهاوبەشەکان بۆ پڕۆژەکە کۆتایی دێت (المشاركة المتناقصة المنتهية بتمليك أحد الشركاء للمشروع): لەم جۆرەیاندا لایەنەکانی هاوبەشیبوونەکە لەسەر ئەوە ڕێك دەکەون کە یەکێك لەلایەنەکان، بەردەوام وبەچەند گوژمەیەك بەشەکەی خۆی دەفرۆشێتەوە بەلایەنەکەی تر، تا لەکۆتاییدا لایەنێکیان دەبێتە خاوەنی پڕۆژەکە ولایەنەکەی تر لێی دێتە دەرەوە.

بۆنموونە: پڕۆژەکە دابەش دەکەین بەسەر (١٠٠٠) پشکدا، وگریمان هەر لایەنە (٥٠٠) پشکی هەیە، وهەموو ساڵێك یان شەش مانگ جارێك کاتێك ئەژماری قازانج وزیانی پڕۆژەکە دەکرێت، لایەنی یەکەم (٥٠) پشکی پڕۆژەکەی خۆی دەفرۆشێتە لایەنی دووەم بەنرخی ڕۆژ وئەو کاتەی کە پێی دەفرۆشێت، بەم شێوەیە ولەماوەی دەساڵدا لایەنی یەکەم لەخاوەندارێتی پڕۆژەکە دێتە دەرەوە، ولایەنی دووەم دەبێتە خاوەنی ڕاستەقینەی پڕۆژەکە.

یان بۆ نموونە: هەر دوو لا لەسەر ئەوە ڕێك دەکەون کە هەر لەسەرەتاوە پڕۆژەکە بخەملێنن بە بڕێك پارە، با بڵێین (١٠٠،٠٠٠$) لایەنی دووەم بەردەوام لە قازانج وداهاتی خۆی بڕی پارەی لایەنی یەکەم دەداتەوە، کە دەکاتە (٥٠،٠٠٠$) تا لەکۆتاییدا خۆی دەبێتە خاوەنی پڕۆژەکە، وخاوەندارێتی لایەنی یەکەم کۆتایی پێ دێت.

یان بۆ نموونە: بانك یان کۆمپانیا کۆمەڵێك ئامێر وکەل وپەل بۆ کارگەیەك دەکرێت، وڕێك دەکەون لەسەر ئەوەی نرخی ئامێرەکان لەچاو کۆی پڕۆژەکەدا چەندە،

بەرێژەی ئەوەندە دەبنە هاوبەش لەقازانج وزیانی کارگەکەدا، دواتر بانك یان کۆمپانیا بەشەکەی خۆی بەنرخی ڕۆژ وبەیەك گوژمە یان بەچەند گوژمەیەك دەفرۆشێتەوە خاوەنی کارگەکە، وبەمەیش خاوەندارێتی بانك یان کۆمپانیا بۆ پرۆژەکە کۆتایی پێ دێت.

هەتا ئەو کاتەیش کە پرۆژەکە یەکلایی دەکرێتەوە هەردوو لا بەخاوەنی پرۆژەکە ئەژمار دەکرێن، وبەرپرسیار وبەشدارن لەهەموو خەرجی، وتێچوون، وتیاچوون، وزیان، وقازانجی پرۆژەکە بەو ڕێژەیەی کە خاوەندارێتییان ماوە.

ئەمانە وچەندین شێوەی تر هەن کەدەکرێت لەسەری ڕێك بکەون ولەکۆتاییدا هاوبەشیبوونەکەیان کۆتایی پێ دێت، وپرۆژەکە دەبێتە هی لایەنێکیان.

بەڵام لەهەموو ئەو شێوازانەی کەباسمان کرد دەبێت ئەوەمان لەیاد نەچێت، کەهیچ لایەنێك بۆی نییە مەرجی ئەوە دابنێت لەسەر لایەنەکەی تر کە تەنها لەقازنجدا هاوبەش دەبێت؛ بەڵکو دەبێت لەقازانج وزیاندا بەو ڕێژەیەی لەسەری ڕێك دەکەون هاوبەش بن، یان مەرجی ئەوە دابنێت کە ئەو مانگانە ڕێژەیەك قازانجی دیاری کراوی دەوێت، بێ گوێدانە ئەوەی پرۆژەکە قازانجی کردوە یان زیان؛ چونکە ئەمانە هەموویان دەبنە سوو ومامەڵەکە حەرام دەکەن.

٣- هاوبەشیبوونی گۆڕاو (المشاركة المتغيرة): ئەمە یەکێکە لەجێگرەوەکانی پێدانی قەرز بە ئەژماری پاشەکەوت (الحساب الجاری المدین) ولەبری ئەوەی لایەنێك پارە بەقەرز وبەسوو بدات بەلایەنەکەی تر، دەتوانێت بەشێوەی هاوبەشیبوون لەزیان قازانج وبەرێژەیەکی گونجاو پێی بدات، وبۆ هەموو مامەڵە وپرۆژەیەکی نوێیش شێوە وبڕی بەشداری بوون وڕێژەی قازانج وزیانەکەیان دەستکاری بکەن وبگۆڕن.

**حەوتەم: بە کرێدان لەگەڵ بەڵێنی پێفرۆشتن یان پێبەخشین (الإجارة المنتهية بالتمليك):**

لەم شێوازەدا گرێبەستێك لەنێوان دوولایەندا دەکرێت، وبەپێی ئەوگرێبەستە لایەنی یەکەم کاڵایەك بەکرێ دەداتە لایەنی دووەم، بۆ ماوەیەك وبەکرێیەکی دیاری کراو، ودواتر وبەگرێبەستێکی تر لایەنی یەکەم بەڵێن دەداتە لایەنی کرێچی ئەگەر پابەند بوو بەپێدانی کرێکە بەو شێوەیەی لەسەر ڕێك کەوتون، ئەوا پاش کۆتایی هاتنی ماوەی بەکرێدانەکە بەنرخێك کەهەردوو لا لەسەری ڕێك دەکەون کاڵاکە دەفرۆشێتە لایەنی کرێچی، یان هەر بێبەرامبەر پێی دەبەخشێت.

دەشکرێت ماوەی بەکرێدانەکە دیاری نەکەن، ولەسەر ئەوە ڕێك بکەون کە هەرکات کەسی کرێچی ویستی بۆی هەیە کاڵاکە بکڕێتەوە بەنرخی ئەو ڕۆژەی کە گرێبەستی فرۆشتنەکەی تێدا ئەنجام دەدرێت.

جیاوازی نێوان ئەم جۆرە بەکرێدانە وفرۆشتنی بەگوژمە (البيع بالتقسيط) لەوەدایە کە لەفرۆشتن بەگوژمەدا ولەکاتی ئەنجامدانی گرێبەستی فرۆشتنەکەوە مافی خاوەندارێتی کاڵاکە دەگوازرێتەوە بۆ کەسی کڕیار، وکەسی فرۆشیار ناتوانێت کاڵا فرۆشراوەکە لای خۆی بهێڵێتەوە تا ئەو کاتەی بەتەواوی پارەی کاڵاکە وەردەگرێت؛ چونکە یەکێك لەبنەما سەرەکی وسەرەتاییەکانی فرۆشتن ئەوەیە کە کاڵاکە ڕادەستی کڕیار بکرێت، بەڵام لەم حاڵەتەی بەکرێداندا مافی خاوەندارێتی کاڵاکە هەر بۆ خاوەنەکەی خۆیەتی وناگوازرێتەوە بۆ کەسی کرێچی، تا ئەو کاتەی گرێبەستی بەکرێدانەکە تەواو دەبێت وهەموو گوژمەی کرێکان ڕادەستی خاوەنی کاڵاکە دەکرێت، ودواتر ولەو کاتەی کەبەگرێبەستێکی نوێ پێی دەفرۆشێت، یان پێی دەبەخشێت مافی خاوەندارێتییەکە دەگوازێتەوە بۆ کەسی کڕیار.

ئەم جۆرە مامەڵەیە دەکرێت لەو کاتەدا پەنای پێببرێت، کە خاوەنی کاڵاکە وەکو پێویست متمانەی بەکڕیارەکە نەبێت، بۆیە بەم شێوازە مافی خاوەندارێتی کاڵاکە لای خۆی دەهێڵێتەوە تا تەواوی پارەکە وەردەگرێت، ودواتر کاڵاکە ڕادەستی کڕیار دەکات.

ئەو مەرجانەیش کە پێویستە لەم جۆرە مامەڵەیەدا هەبن ئەمانەن:

١- دەبێت مامەڵەکە بەدوو گرێبەستی جیاواز بکرێت، گرێبەستی یەکەم گرێبەستی بەکرێدانی کاڵاکە، وگرێبەستی دووەم، بەفرۆشتن یان بەکرێدانی کاڵاکە، بۆیە دروست نییە بڵێین بەتەواوبوونی ماوەی کرێکە کاڵاکە بۆ خۆت، بەڵکو دەبێت ئەوە پاش ئەنجامدانی گرێبەستی کرێکە بەگرێبەستێکی نوێ بکرێت.

٢- مافی خاوەندارێتی کاڵاکە بەدرێژایی ماوەی بەکرێدانەکە هی خاوەنەکەی خۆیەتی وناگوازرێتەوە بۆ کەسی کرێچی، بۆیە هەر ئەو بەرپرسیارە لەهەر زیان، وتیاچوون، ولەکارکەوتن، وکەم وکورتییەکی کاڵاکە، وهەموو خەرجییەکانی پاراستنی کاڵاکەیش هەر لەئەستۆی ئەوە، جگە لەخەرجییەکانی بەگەڕخستن کە ئەوە لەئەستۆی کەسی کرێچییە، مەگەر زیانێك نەبێت کە لایەنی کرێچی هەر بەئارەزووکاری یان لەدەرئەنجامی کەمتەرخەمی ئەو ڕوویدابێت، ئەو کات بۆی هەیە داوای قەرەبووی زیانەکانی لێبکاتەوە، یان داوای هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستەکە بکات، ئەگەر نا کەسی کرێچی لەهیچ کامی ئەو زیانانەی بەر کاڵاکە دەکەوێت بەرپرسیار نییە.

٣- خاوەنی کاڵاکە بۆی نییە داوای دڵنیایی (تأمین) لەکەسی کرێچی بکات بۆ پاراستنی کاڵاکەی، وئەگەر دڵنیاییەکی هاوکاری (التأمين التعاوني) شەرعیش بکرێت بۆ ئامێرەکان، ئەوە دەبێت لەئەستۆی خاوەنەکی بێت نەك کەسی کرێچی[١].

---

١ - ئەمەیش دەقی فەتوایەکی کۆمکاری فیقهی ئیسلامییە لەو بارەیەوە:

إن مجلس الفقه الإسلامي الدولي المنبثق عن منظمة المؤتمر الإسلامي في دورته الثانية عشرة بالرياض في المملكة العربية السعودية من ٢٥ جمادى الآخرة ١٤٢١هـ إلى غرة رجب ١٤٢١هـ (٢٣-٢٨ سبتمبر ٢٠٠٠). بعد اطلاعه على الأبحاث المقدمة إلى المجمع بخصوص موضوع (الإيجار المنتهي بالتمليك). وبعد استماعه إلى المناقشات التي دارت حول الموضوع بمشاركة أعضاء المجمع وخبرائه وعدد من الفقهاء. قرر ما يلي: الإيجار المنتهي بالتمليك:

أولا: ضابط الصور الجائزة والممنوعة ما يلي:

١- ضابط المنع: أن يرد عقدان مختلفان في وقت واحد على عين واحدة في زمن واحد.

٢- ضابط الجواز:

ا- وجود عقدين منفصلين يستقل كل منهما عن الآخر زمانا، بحيث يكون إبرام عقد البيع بعد عقد الإجارة، أو وجود وعد بالتمليك في نهاية مدة الإجارة، والخيار يوازي الوعد في الأحكام.

ب- أن تكون الإجارة فعلية وليست ساترة للبيع.

٣- أن يكون ضمان العين المؤجرة على المالك لا على المستأجر، وبذلك يتحمل المؤجر ما يلحق العين من غير ناشيء من تعد المستأجر، أو تفريطه، ولا يلزم المستأجر بشيء إذا فاتت المنفعة.

٤- إذا اشتمل العقد على تأمين العين المؤجرة فيجب أن يكون التأمين تعاونيا إسلاميا لا تجاريا، ويتحمله المالك المؤجر وليس المستأجر.

٥- يجب أن تطبق على عقد الإجارة المنتهية بالتمليك أحكام الإجارة طوال مدة الإجارة، وأحكام البيع عند تملك العين.

٦- تكون نفقات الصيانة غير التشغيلية على المؤجر لا على المستأجر طوال مدة الإجارة.

ثانيا: من صور العقد الممنوعة:

١- عقد إجارة ينتهي بتملك العين المؤجرة مقابل ما دفعه المستأجر من أجرة خلال المدة المحددة، دون إبرام عقد جديد، بحيث تنقلب الإجارة في نهاية المدة بيعا تلقائيا.

٢- إجارة عين لشخص بأجرة معلومة ولمدة معلومة مع عقد بيع له معلق على سداد جميع الأجرة المتفق عليها خلال المدة المعلومة، أو مضاف إلى وقت في المستقبل.

٣- عقد إجارة حقيقي، واقترن به بيع بخيار الشرط لصالح المؤجر، ويكون مؤجلا إلى أجل محدد (هو آخر مدة عقد الإيجار). وهذا ما تضمنته الفتاوى والقرارات الصادرة من هيئات علمية ومنها: هيئة كبار العلماء بالمملكة العربية السعودية.

ثالثا: من صور العقد الجائزة:

١- عقد إجارة يمكن المستأجر من الانتفاع بالعين المؤجرة مقابل أجرة معلومة في مدة معلومة، واقترن به عقد هبة العين للمستأجر معلقا على سداد كامل الأجرة، وذلك بعقد مستقل، أو وعد بالهبة بعد سداد كامل الأجرة (وذلك وفق ما جاء في قرار المجمع بالنسبة للهبة رقم (١٣/١/٣) في دورته الثالثة.

٢- عقد إجارة مع إعطاء المالك الخيار للمستأجر بعد الانتهاء من وفاء جميع الأقساط الإيجارية المستحقة خلال المدة في شراء العين المأجورة بسعر السوق عند انتهاء مدة الإجارة (وذلك وفق قرار المجمع رقم ٤٤(٥/٦) في دورته الخامسة.

٣- عقد إجارة يمكن المستأجر من الانتفاع بالعين المؤجرة مقابل أجرة معلومة، في مدة معلومة واقترن به وعد ببيع العين المؤجرة للمستأجر بعد سداد كامل الأجرة بثمن يتفق عليه الطرفان.

٤- عقد إجارة يمكن المستأجر من الانتفاع بالعين المؤجرة مقابل أجرة معلومة، في مدة معلومة، ويعطي المؤجر للمستأجر حق الخيار في تملك العين المؤجرة في أي وقت يشاء على أن يتم البيع في وقته بعقد جديد بسعر السوق (وذلك وفق قرار المجمع السابق رقم ٤٤/٦(٥)) أو حسب الاتفاق في وقته.

رابعا: هناك صور من عقود التأجير المنتهي بالتمليك محل خلاف، وتحتاج إلى دراسة تعرض في دورة قادمة إن شاء الله تعالى. انتهى.

مجلة المجمع، ع١٢، ج١، ص ٣١٣ ، قرار رقم: ١١٠ (٤/١٢).

# بەشی دە[1]

# سووی کڕین وفرۆشتن

لەم بەشەدا قسە لەسەر سووی کڕین وفرۆشتن دەکەین، وسەرەتا لە جۆرەکانییەوە دەستپێدەکەین، وبەم شێوەیەی لای خوارەوە:

**یەکەم:** پێناسەی سووی کڕین وفرۆشتن، وجۆرەکانی.

**دووەم:** بەڵگە شەرعییەکان لەسەر حەرامی سووی کڕین وفرۆشتن.

**سێیەم:** چەند بنەمایەك دەربارەی سووی کڕین وفرۆشتن.

## یەکەم: پێناسەی سووی کڕین وفرۆشتن، وجۆرەکانی:

سووی کڕین وفرۆشتن ئەو سوویە کە لەچەند کاڵایەکی دیاریکراو وبەهۆی مامەڵەی کڕین وفرۆشتن، یان گۆڕینەوەیان بەیەکتر دروست دەبێت و دەبێت بە دوو بەشەوە:

١- سووی زیادە (ربا الفضل): بریتییە لەو سووەی کە تۆ دراوێك یان کاڵایەك کەسووی تێدا دروست دەبێت بفرۆشێت بەهەمان دراو یان کاڵا خۆی بەڵام بەکەمتر یان زیاتر، بۆ نموونە ئەگەر (١٠٠$) بفرۆشیت بە (١١٠$) دۆلار ئەم مامەڵەیە سووە؛ چونکە کڕین وفرۆشتنەکە بەیەك دراوە وکەم وزیادی کردوە، یان ئەگەر (١٠٠٠کغم) گەنم بفرۆشتیت بە (١٠٠١کغم) ئەم مامەڵەیەیش دیسان دەبێتە سوو.

٢- سووی ئامادەنەبوون یان دواکەوتنی یەکێك لەدراوەکان یان کاڵاکان (ربا النسیئة): ئەمیش بریتییە لەو سووەی کە لەکاتی کڕین وفرۆشتنی دراو بە دراودا، یان گەنم بەگەنمدا[2]، یەکێك لە کاڵاکان ئەمادە وبەردەست نەبن لەکاتی ئەنجامدانی گرێبەستەکەدا، بۆ نموونە کاتێك بڕی (١٠٠$) دۆلار دەفرۆشین یان دەگۆڕینەوە بە (١٠٠$) یان بە هەر دراوێکی تر یان زێڕ یان زیو، مەرجی شەرعی دروستبوونی ئەم مامەڵەیە ئەوەیە، کە

---

١ – لە بنەڕەتدا ئەم بەشە یازدەیەمە؛ بەڵآم لەبەر ئەوەی ئێمە بەشی دەمان لە گەڵ نۆ دانا ئەم بەشە دەبێتە بەشی دەیەم و هەموو بەشەکانی تریش کەماوە یەك ژمارە دێنە پێش وئەم بەشە ڕۆژی (٢٠١٥/٢/١٤) تۆمار کرا.

٢ – یان هەر کاڵایەکی تر کە سووی تێدا دروست دەبێت وەك: جۆ بەجۆ، برنج بە برنج، خورما بە خورما، مێوژ بەمێوژ، نیسك بەنیسك، نۆك بەنۆك.

دەبێت هەر دوو دراوەکە یان کانزاکە لەکاتی ئەنجامدانی گرێبەستەکەدا ئامادەبن و کڕیار وفرۆشیار ڕادەستی یەکتری بکەن، ئەگەر نا دەبێتە سوو. ئیبن المنذر دەربارەی ئەم جۆرە سووە دەڵێت: (أجمع كل من احفظ عنه من أهل العلم على أن المتصارفين إذا افترقا قبل أن يتقابضا، أن الصرف فاسد)[1] . واتە: هەموو ئەو زانایانەی ئێمە لێیانەوە فێربووین هاوڕا و کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کە کڕیار وفرۆشیاری دراو ئەگەر جیابوونەوە بەر لەوەی کە هەر یەکە ودراوەکەی خۆی وەربگرێت، مامەڵەکەیان دروست نییە وبەتاڵە.

سووی کڕین وفرۆشتن لەگەڵ سووی قەرز لەدوو خاڵدا جیاوازن:

أ- سووی قەرز لەهەموو شتێکدا دروست دەبێت کە بگونجێت بەقەرز بدرێت؛ بەڵام سووی کڕین وفرۆشتن تەنها لەهەندێك شتی دیاریکراوی وەك: دراو، ئاڵتون، زیو، گەنم، هتددا. دروست دەبێت.

ب- سووی قەرز یەك جۆرە وتەنها سووی پێدانی قەرزەکەیە؛ بەڵام سووی کڕین وفرۆشتن دوو جۆرە وەکو باسمان کرد.

---

١ - إبن المنذر، الإشراف على مذاهب العلماء، ج٦ص٢/ مصدر سابق.

**دووەم: بەڵگە شەرعییەکان لەسەر حەرامی سووی کڕین وفرۆشتن:**

**سەبارەت بە بەڵگە شەرعییەکانی سەر حەرامی ئەم جۆرە سووە:**

- پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: {الذَّهَبُ بِالذَّهَبِ، وَالْفِضَّةُ بِالْفِضَّةِ، وَالْبُرُّ بِالْبُرِّ، وَالشَّعِيرُ بِالشَّعِيرِ، وَالتَّمْرُ بِالتَّمْرِ، وَالْمِلْحُ بِالْمِلْحِ، مِثْلًا بِمِثْلٍ، سَوَاءً بِسَوَاءٍ، يَدًا بِيَدٍ، فَإِذَا اخْتَلَفَتْ هَذِهِ الْأَصْنَافُ فَبِيعُوا كَيْفَ شِئْتُمْ إِذَا كَانَ يَدًا بِيَدٍ}[1]. واتە: ئاڵتون بەئاڵتون، زیو بەزیو، گەنم بەگەنم، جۆ بەجۆ، خورما بەخورما، خوێ بەخوێ، وەك ویەك، ودەست بەدەست، خۆ ئەگەر ئەم جۆرانە جیاواز بوون ئەوکات چۆنتان پێ باش بوو ئاوها بیفرۆشن، بەمەرجێك دەست بەدەست بێت.

- وە دەفەرموێت: {لاَ تَبِيعُوا الذَّهَبَ بِالذَّهَبِ إِلاَّ مِثْلا بِمِثْلٍ، وَلا تُشِفُّوا بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ، وَلا تَبِيعُوا الْوَرِقَ بِالْوَرِقِ إِلاَّ مِثْلا بِمِثْلٍ، وَلا تُشِفُّوا بَعْضَهَا عَلَى بَعْضٍ، وَلا تَبِيعُوا غَائِبًا مِنْهَا بِنَاجِزٍ}[2]. واتە: ئاڵتون بە ئاڵتون مەفرۆشن مەگەر ڕێژەکەیان وەکو یەك بێت، وبا هیچیان لەوی تر زیاتر نەبێت، وە زیو بە زیو مەفرۆشن مەگەر ڕێژەکەیان وەکو یەك بێت، وبا هیچیان لەوی تر زیاتر نەبێت، وە ئەگەر یەکێك لەکاڵاکان ئەمادە نەبوون کڕین و فرۆشتنیان پێوە مەکەن.

- عن سليمان بن أبي مسلم قال: سَأَلْتُ أَبَا الْمِنْهَالِ عَنْ الصَّرْفِ يَدًا بِيَدٍ، فَقَالَ: اشْتَرَيْتُ أَنَا وَشَرِيكٌ لِي شَيْئًا يَدًا بِيَدٍ وَنَسِيئَةً، فَجَاءَنَا الْبَرَاءُ بْنُ عَازِبٍ فَسَأَلْنَاهُ، فَقَالَ: فَعَلْتُ أَنَا وَشَرِيكِي زَيْدُ بْنُ أَرْقَمَ، وَسَأَلْنَا النَّبِيَّ ﷺ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: {مَا كَانَ يَدًا بِيَدٍ فَخُذُوهُ، وَمَا كَانَ نَسِيئَةً فَذَرُوهُ}[3]. واتە: سولەیمانی کوڕی باوکی موسلیم دەڵێت: لەباوکی مینهالمان پرسی: مەبەستی دەست بەدەست لەکڕین وفرۆشتندا کە لە فەرموودەکاندا هاتووە چییە؟ ئەویش گوتی: من وهاوەڵێکم مامەڵەمان دەکرد وهەندێك جار دەست بەدەست کاڵاکانمان دەگۆڕیەوە وهەندێك جاریش بەقەرز، کاتێك بەرائی کوڕی عازب هات بۆ لامان لێمان پرسی، ئەویش گوتی: من وزەیدی کوڕی ئەرقەم هاوبەش بووین ودەربارەی ئەو بابەتە لەپێغەمبەری خودامان ﷺ

---

١ - مسلم، صحيح مسلم، ج٣،ص١٢١٠، رقم الحديث (١٥٨٧).

٢ - البخاري، صحيح البخاري، ج٣،ص٧٤، رقم الحديث (٢١٧٧). مسلم، صحيح مسلم، ج٣،ص١٢٠٨، رقم الحديث (١٥٨٤)، واللفظ للبخاري.

٣ - البخاري، صحيح البخاري، ج٣،ص١٤٠، رقم الحديث (٢٤٩٧).

پرسی، ئەویش لەوەڵامدا فەرمووی: ئەوەی دەست بەدەست دەیگۆڕنەوە دروستە و وەری بگرن، بەڵام ئەوەی دەکەویتە قەرزەوە ویەکێك لەکاڵاکان ئامادە نییە، وازی لێبێنن[1].

- عَنْ مَالِكِ بْنِ أَوْسٍ قَالَ: أَقْبَلْتُ أَقُولُ مَنْ يَصْطَرِفُ الدَّرَاهِمَ فَقَالَ طَلْحَةُ: أَرِنَا الذَّهَبَ حَتَّى يَأْتِيَ الْخَازِنُ ثُمَّ تَعَالَ فَخُذْ وَرِقَكَ. فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: كَلاَّ وَالَّذِى نَفْسِي بِيَدِهِ لَتَرُدَّنَّ إِلَيْهِ ذَهَبَهُ، أَوْ لَتُنْقِدَنَّهُ وَرِقَهُ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: {الذَّهَبُ بِالْوَرِقِ رِبًا إِلاَّ هَا وَهَا، وَالْبُرُّ بِالْبُرِّ رِبًا إِلاَّ هَا وَهَا، وَالشَّعِيرُ بِالشَّعِيرِ رِبًا إِلاَّ هَا وَهَا، وَالتَّمْرُ بِالتَّمْرِ رِبًا إِلاَّ هَا وَهَا}[2]. واتە: مالیکی کوڕی ئەوس دەڵێت: دەگەڕام دەمگوت کێ زیوی هەیە بیفرۆشێت، طەڵحەی کوڕی عوبەید الله گوتی: ئاڵتونەکەتمان نیشان بدە، تاژمێریارەکەمان دێت کەهات وەرە زیوەکەی خۆت وەرگرە، پێشەوا عومەر خوای لێ ڕازی بێت گوتی: بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە شتی وا نابێت، یان ئاڵتونەکەی بۆ دەگێڕیتەوە، یان هەر ئێستا زیوەکەی دەدەیتێ، من گوێم لە پێغەمبەری خودا ﷺ بوو دەیفەرموو: گۆڕینەوەی ئاڵتون بەزیو دەبێتە سوو ئەگەر دەست بە دەست نەبێت، وگۆڕینەوەی گەنم بە گەنم دەبێتە سوو ئەگەر دەست بە دەست نەبێت، وگۆڕینەوەی جۆ بە جۆ دەبێتە سوو ئەگەر دەست بە دەست نەبێت، و گۆڕینەوەی خورما بە خورما دەبێتە سوو ئەگەر دەست بە دەست نەبێت.

- عن أَبِي هُرَيْرَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَعَثَ أَخَا بَنِي عَدِيٍّ الأَنْصَارِيَّ وَاسْتَعْمَلَهُ عَلَى خَيْبَرَ، فَقَدِمَ بِتَمْرٍ جَنِيبٍ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: {أَكُلُّ تَمْرِ خَيْبَرَ هَكَذَا؟}. فَقَالَ: لاَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا نَشْتَرِي الصَّاعَ بِالصَّاعَيْنِ مِنَ الْجَمْعِ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: {لاَ تَفْعَلُوا، وَلَكِنْ مِثْلا بِمِثْلٍ، أَوْ بِيعُوا هَذَا وَاشْتَرُوا بِثَمَنِهِ مِنْ هَذَا، وَكَذَلِكَ الْمِيزَانُ}[3]. واتە: ئەبو هورەیرە بۆمان دەگێڕێتەوە ودەڵێت: پێغەمبەری خودا ﷺ کەسێکی لەنەوەی عەدی ئەنصاری نارد[4] وکردییە کاربەدەست لەسەر خەیبەر، ئەم پیاوە پاش ماوەیەك کە گەڕایەوە خورمایەکی زۆر جوانی لەگەڵ خۆی هێنابوو، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: ئایا هەموو خورمای خەیبەر بەم شێوەیە جوانە؟ ئەویش گوتی:

---

١ - دیارە مامەڵەی ئەمان بەو کاڵایانە بووە کە سوویان تێدایە ورەگەزیان یەك و جۆریان جیاواز بووە، بۆیە تەنها باسی سووی دواکەوتنی یەکێك لەکاڵاکان دەکات.

٢ - البيهقي، السنن الكبرى، ج٥، ص٢٨٣، رقم الحديث (١٠٨١٤). إبن حبان، صحيح إبن حبان، ج١١ص٣٩٤، رقم الحديث (٥٠١٩). وقال شعيب الأرنؤوط في تخريجه: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

٣ - البخاري، صحيح البخاري، ج٩ص١٠٧، رقم الحديث (٧٣٥٠).

٤ - ئەم پیاوە لەهەندێك فەرموودەی تردا ناوی هاتووە وناوی: سەوادی کوڕی غەزیە بووە.

نەخێر ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئێمە چوار مشت لەم خورما جوانە بە هەشت مشت خورمای تێکەڵ دەکڕین. پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: شتی وامەکەن، - ئەو خورما جوانە بەخورما ناشیرینەکە مەگۆڕنەوە مەگەر وەکو یەك بن، یان خورما خراپەکە بفرۆشن بەپارەکەی لەم خورما جوانە بکڕن، ئەگەریش بەکێشانە کڕیتان با هەردووکیان یەك کێشیان هەبێت.

ئەگەر بەوردی سەرنجی ئەو پێنج فەرموودەیە بدەین، ئەوا دەبینین فەرموودەی یەکەم ودووەم باسی هەردوو جۆرەکەی سوو دەکەن. بەڵام فەرموودەی سێیەم وچوارەم تەنها باسی سووی دواکەتن وئامادە نەبوونی یەکێك لەکاڵاکان دەکات، هەرچی فەرموودەی پێنجەمیشە تەنها باسی سووی زیادەی یەکێك لەکاڵاکان دەکات.

### سێیەم: چەند بنەمایەك دەربارەی سووی کڕین وفرۆشتن:

بۆ زیاتر بەرچاوڕوونی هەوڵ دەدەین لە چەند بنەمایەکدا شێوازەکانی سووی کڕین وفرۆشتن بخەینە ڕوو کە ئەمانەن:

١- ئەگەر دوو دراو یان زێڕ یان کاڵامان[١] فرۆشت بەیەکتر هەردووکیان یەك جۆر بوون، ویەك ڕەگەزیشیان هەبوو، ئەو کات دەبێت، ڕێژە، وبڕ، وکێشانە، وپێوانەی هەر دووکیان یەکسان بێت، وهەردووکیشیان لەکاتی ئەنجامدانی گرێبەستەکەدا ئامادە بن.

بۆ نموونە: ئەگەر دیناری عێراقیمان فرۆشت بەدیناری عێراقی، یان دۆلاری ئەمریکی بەدۆلاری ئەمریکی، یان ئاڵتون بەئاڵتون، یان زیو بە زیو، یان گەنم بەگەنم، یان جۆ بەجۆ، یان برنج بەبرنج، ئەوکات وەك گوتمان دەبێت لەبڕ، وکێش، وپێوانەدا، وەکو یەك بن، وهەر دوو کاڵاکەیش بەر دەست وئامادەبن.

خۆ ئەگەر لە بڕ وڕێژە وکێشانە وپێوانەدا جیاواز بوون ئەوکات سووی زیادە (ربا الفضل) دروست دەکات، خۆ ئەگەریش یەکێکیان ئامادە نەبون ئەو کات سووی ئامادە نەبوون یان دواکەوتنی یەکێك لەکاڵاکان دروست دەکات (ربا النسیئة).

---

١ - مەبەستمان لە کاڵا تەنها ئەو شتانەیە کە سوویان تێدا دروست دەبێت وەك: (گەنم، جۆ، خورما، ترێ، هتد).

لێرەدا باش وخراپی شتەکە کاریگەری لەسەر هیچ کام لەو حوکمانەی سەرەوە دروست ناکات، بۆ نموونە ئاڵتونی خەلیجی، یان عێراقی، یان ئێرانی، ئەمانە هەموویان هەر بەئاڵتون ئەژمار دەکرێن، ولەکاتی کڕین وفرۆشتنیاندا دەبێت هەمان کێش وبڕیان هەبێت، وهەردووکیشیان لەکاتی ئەنجامدانی گرێبەستەکەدا ئامادە بن[1]، هەروەها گەنمی موسڵی، یان کوردی، یان قەندەهاری، یان خورمای عەجوە، یان بەرحی، یان ئەشرەسی، ئەمانە هەموویان یەك حوکمیان هەیە. ونابێت لەکاتی گۆڕینەوەیاندا بەیەکتر زیاد وکەم بکەن، وئەگەر خاوەنەکانیان ویستیان هەر یەکە وبە مافی خۆی بگات ئەو کات با گەنمەکەی یان خورماکەی خۆی بەنرخی خۆی بفرۆشێت، وبڕوات بەپارەکەی ئاڵتون، یان گەنم، یان خورماکەی تر بکڕێت.

٢- ئەگەر جۆری دراوەکان یان کاڵاکان جیاواز بوون؛ بەڵام یەك ڕەگەزیان هەبوو، ئەو کات دروستە بڕ وڕێژە وکێشانە وپێوانەیان جیاواز بێت؛ بەڵام هەر دەبێت هەردووکیان لە کاتی ئەنجامدانی گرێبەستەکەدا ئامادەبن.

بۆ نموونە ئەگەر دینارمان فرۆشت بە دۆلار، یان ئاڵتون بەزیوو، یان گەنم بەجۆ، ئەمانە جۆرەکانیان جیاوازە بەڵام ڕەگەزی دینار ودۆلار، وئاڵتون وزیو، هەموویان یەکە وهەموویان دراون، هەروەها ڕەگەزی گەنم وجۆیش یەکە وهەردووکیان دانەوێڵەن، بۆیە لەم کاتانەدا دروستە دینارەکە لە دۆلارەکە زیاتر بێت، یان زیوەکە لە ئاڵتونەکە زیاتر بێت، یان جۆکە لەگەنمەکە زیاتر بێت، وسووی زیادە دروست ناکات، بەڵام دەبێت هەر دووکیان ئامادەبن وڕادەست بکرێن ئەگەر نا سووی دواکەوتنی یەکێك لە کاڵاکان دروست دەکات.

لەم حاڵەتەشدا بوونی یەك ناو حوکمی ناوەڕۆکی شتەکان ناگۆڕێت، بۆ نموونە زەیتی گوڵەبەڕۆژە، لەگەڵ زەیتی کونجی، لەگەڵ زەیتی بادەم، ئەمانە ڕاستە هەموویان ناویان زەیتە بەڵام لە بنەڕەت و ناوەڕۆکدا جۆرەکانیان جیاوازە، وئەوەیان گوڵە بەڕۆژەیە، وئەوەیان کونجییە، وئەوەیان بادەمە، یان ئاردی برنج لەگەڵ ئاردی گەنم، یان سرکەی سێو لەگەڵ سرکەی ترێ، یان شیری مەڕ، لەگەڵ مانگا، لەگەڵ حوشتر، ئەمانە هەرچەند ناویان

---

١ - زۆر بەداخەوە کاتی خۆی خەڵکانێك دیناری ئاسنیان دەگۆڕیەوە بەدیناری کاغەز، ولەبری هەر (١٠) دیناری کاغەزدا (١٢) دیناری ئاسنیان دەدا، ومامەڵەکە بە دە بەدوازدە دەناسرا، وئەمەیش سوویەکی زۆر ئاشکرابوو، بەداخەوە زۆرێك لەخەڵکیش تێوەی گلابوون، وهەندێك مامۆستای ئاینیش پێیان حەڵاڵ بوو.

یەکە بەڵام هەموویان لەڕووی ناوەڕۆکەوە جیاوازن، بۆیە دەکرێت لەکاتی گۆڕینەوەیان بەیەکتر زیاد وکەمیان پێ بکرێت، بەڵام دەبێت هەردووکیان لەکاتی ئەنجامدانی گرێبەستەکەدا ئامادە بن؛ چونکە ڕەگەزیان یەکە.

یان هەموو گۆشتەکان یەك ڕەگەزیان هەیە، بەڵام جۆرەکانیان جیاوازە، گۆشتی مەڕ وبزن بەیەك جۆر ئەژمار دەکرێت، گۆشتی مانگاو گامێشیش جۆرێکی ترە، وگۆشتی حوشتریش جۆرێکی سەربەخۆیە، بۆیە دروست نییە گۆشتی مەڕ بفرۆشرێت بەگۆشتی بزن بەکەم وزیاد؛ چونکە یەك جۆر ویەك ڕەگەزیان هەیە، بەڵام دروستە بەگۆشتی مانگا بفرۆشرێت بەکەم وزیاد، چونکە جۆرەکەیان جیاوازە، یان بەگۆشتی حوشتر، بەڵام لەهەموو حاڵەتەکاندا بەبێ جیاوازی دەبێت هەردوو گۆشتەکە ئامادەبن وڕادەست بکرێن، ئەگەر نا دەبێتە سوو.

گۆشت وجگەر وچەوریش یەك ڕەگەزیان هەیە بەڵام جۆرەکانیان جیاوازە، بۆیە دروستە جگەری مەڕ بفرۆشیت بەگۆشتەکەی یان بەدووگەکەی، یان چەوریەکەی بەزیاد وکەم، چونکە دووجۆری جیاوازن، بەڵام پێویستە هەردووکیان لەکاتی ئەنجامدانی گرێبەستەکە ئامادە بن.

٣- ئەگەر جۆری کاڵاکان لەگەڵ ڕەگەزەکانیشیان جیاواز بوون، ئەو کات هیچ جۆرە سوویەك دروست ناکات، وهەر چۆن مامەڵەیان پێوە بکرێت دروستە.

بۆ نموونە ئەگەر گەنممان فرۆشت بەدینار، یان بە ئاڵتون، یان بەدۆلار، لەم کاتانەدا جۆری کاڵاکان جیاوازە؛ چونکە ئەو دینارە وئەو گەنمە، لەهەمان کاتدا ڕەگەزیشیان جیاوازە چونکە ڕەگەزی دینار دراوە وڕەگەزی گەنم دانەویڵەیە؛ بۆیە هیچ جۆرە سوویەك دروست ناکات، ودروستە یەکێك لەکاڵاکان لەوی تر زیاتر بێت، ولەهەمان کاتیشدا دروستە یەکێکیان ئامادەبێت وئەوی تر ئامادە نەبێت.

٤-نەزانینی بڕ وڕێژە وکێشانە وپێوانەی شتەکان وفرۆشتنیان بەگۆترە وەکو زانینی زیادە وکەمییان وایە، وسوو دروست دەکات ومامەڵەکە حەرام دەکات، بۆنموونە: ئەگەر بەکەسێك بڵێیت بەستەیەك دۆلارت دەدەمێ بەبەستەیەك دۆلار کەنازانین ژمارەی بەستەکان چەندن ئەم مامەڵەیە سووە وحەرامە؛ یان بڵێیت مشتێك ئاڵتونت دەدەمێ بەمشتێك

ئاڵتون، ئەمەیش دیسان سووە، چونکە ئێمە کێشی ئاڵتونەکان نازانین، بۆیە ئەگەر تەواو دڵنیا نەبین لەبڕو کێشی شتەکان حەرامە ئاڵوگۆڕیان پێ بکرێت.

هەر بۆیەیشە فرۆشتن وگۆڕینەوەی ئاڵتونێك کە نقێمی تیدابێت بە ئاڵتونێك کە نقێمی تێدا نەبێت حەرامە[١]، ترێ بەمێوژ[٢]، یان خورمای تەڕ بەخورمای ووشك، یان گەنم بە ئاردی گەنم، یان ئارد بەنان، یان خورما بەدۆشاوی خورما حەرامە؛ چونکە هەموو ئەمانە ڕێژەی تەواوی شتەکان تێیدا دیار نیە، بۆیە دەبێتە سوو.

کەواتە ئەو بەڕێزانەی کە لەبواری زەرەنگەرییدا، یان گۆڕینەوەی دراودا، یان وشکە فرۆشیدا کار دەکەن، دەبێت زۆر ورد و وریا بن، ئەگەر نا دەکەونە ناو سووەوە ومامەڵە ورزقەکەیشیان حەرام دەبێت.

من دەزانم تێگەیشتن وکارپێکردنی ئەم بنەمایانە ئاسان نییە، بەڵام زۆریش پێویست وگرنگن، بۆیە من خوازیارم هەر بەڕێزێك ئەم پەڕتووکەی ئێمەی دەکەوێتە بەر دەست، ئەگەر لێی تێ ناگات با فەتوای پێنەدات هەتا پرسیار دەکاتو لێی تێ دەگات، چونکە هەم خۆی تووشی هەڵە دەبێت، وهەم خەڵکیش تووشی هەڵە دەکات وبەلاڕێیاندا دەبات.

---

١ - چونکە ئێمە کێشی نقێمەکان نازانین، بۆیە کێشی ئاڵتونەکانیش پاش دەرکردنی نقێمەکان بە نادیار دەمێنێتەوە، وئەمەیش مامەڵەکە دەکات بەسوو.

٢ - چونکە ترێ ڕێژەیەك لە تەڕی تیدایە، بەڵام مێوژ وشك بۆتەوە و تەڕییەکەی تێدا نەماوە، ئێستا ئێمە نایزانین هەمان بڕی ترێ هەمان کێشی مێوژەکە بە ووشکی دەدات یان نایدات.

## بەشی یازدە[1]

## ئەو شتانەی سوویان تێدا دروست دەبێت، وسووی دراوەکان

لەم بەشەدا و وەك لەناونیشانی بەشەکەدا دیارە قسە لەسەر دوو تەوەر دەکەین:

١- ئەو شتانەی سوویان تێدا دروست دەبێت.

٢- سووی دراوەکان.

سەرەتا باس لەو شتانە دەکەین کە سوویان تێدا دروست دەبێت.

### یەکەم: ئەو شتانەی سوویان تێدا دروست دەبێت:

پێغەمبەری خودا ﷺ لە فەرموودەکانیدا ئاماژە بەشەش شت دەکات کە سوویان تێدا دروست دەبێت ئەوانیش: (ئاڵتون، زیو، گەنم، جۆ، خوێ، خورما) ن. زانایانیش بەکۆی دەنگ پێیان وایە کە سوو لەم شتانەدا دروست دەبێت؛ چونکە لەدەقەکاندا بەڕوونی ناویان هاتووە.

جگە لەو شتانە ئایا سوو لەهیچ کاڵایەکی تردا دروست دەبێت؟ بۆ نموونە، دینار، دۆلار، برنج، کە ناویان لەفەرموودەکاندا نەهاتووە، ئایا ئەمانەیش حوکمی ئەو شتانەی تریان هەیە کەناویان هاتووە یان نا؟. زانایان لەم بارەیەوە بۆچوونیان جیاوازە، وبوون بەدوو بەشەوە:

١- ظاهیرییەکان کە باوەڕیان بەقیاس نییە وەك سەرچاوەیەکی حوکمی شەرعی، پێیان وایە کە سوو تەنها لەو شەش شتەدا دروست دەبێت کە پێغەمبەری خودا ﷺ لەفەرموودەکانیدا ناوی بردوون، جگە لەمانە سووی کڕین وفرۆشتن لەهیچ شتێکی تردا دروست نابێت.

هەندێك زانای تری وەکو پێشەوا (صەنعانی) و (ئیبن عەقیلی حەنبەلی) کە هەرچەند ظاهیریش نین، بەڵام ئەمانیش هەمان بۆچوونی ظاهیریەکانیان هەیە، نەك لەبەر ئەوەی باوەڕیان بەقیاس نییە؛ بەڵکو لەبەر ئەوەی دەڵێن: هیچ هۆکارێکی بەرجەستە

---

١ - ئەم بەشە ڕۆژی (٢٠١٥/٢/٢١) تۆمار کرا.

نابینینەوە لەو شتانەی پێغەمبەری خودا ﷺ باسی کردون تا بتوانین قیاسی لەسەر بکەین، بۆ نموونە بۆچی ئاڵتونو زیو سوو دروست دەکەن؟. یان بۆچی گەنمو جۆ سوو دروست دەکەن؟. وەڵامەکەی نەزانراوە وزانایان بە عەقڵی خۆیان هۆکاریان بۆ داتاشیون، هەربۆیەیشە بۆچوونەکانیان شپرز وپەرتەوازەیە، وهەندێك جاریش دژ بەیەکە، وقیاسیش هەتا حوکمی ئەصلەکە هۆکارێکی روون وئاشکرای نەبێت جێبەجێ ناکرێت؛ بۆیە ئەمانیش پێیان وایە کە سوو تەنها لەو شەش شتەدا دروست دەبێت، وحوکمی ئەوانە ناگوازرێتەوە بۆ هیچ شتێکی تر.

صەنعانی لەو بارەیەوە دەڵێت: (فذهب الجمهور إلى ثبوته فيما عداها مما شاركها في العلة، ولكن لما لم يجدوا علة منصوصة اختلفوا فيها اختلافا كثيرا، يقوي للناظر العارف أن الحق ما ذهبت إليه الظاهرية من أنه لا يجري الربا إلا في الستة المنصوص عليها)[1]. واتە: زۆرینەی زانایان پێیان وایە کە سوو لەهەر شتێکی تردا دروست دەبێت کە هۆکاری هاوبەشی لەگەڵ ئەو شەش شتەدا هەبێت، بەڵام بەهۆی ئەوەی کەهۆکارێکی دیاریکراویان نەدۆزیەوەتەوە کە لەدەقەکاندا باس کرابێت، ڕاجیاییەکی زۆریان لەو بارەیەوە بۆ دروست بووە، بەشێوەیەك کە کەسی لێزان وبیرتیژ ئەوەی لا پەسەندتر دەبێت کە ڕاست لای ظاهیرییەکانە کەدەڵێن سوو تەنها لەو شەش شتەدا دروست دەبێت کە لەدەقەکاندا ناویان هاتووە.

ئیبن عەقیلی حەنبەلیش دەڵێت: (لِعِلَل القِياسِيّين في مَسأَلة الرِّبا عِلَل ضَعيفَة، وإذا لم تَظهَر فيه عِلَّة امتَنَع القِياس)[2]. واتە: ئەو کەسانەی باوەڕیان بەقیاس هەیە لەبابەتی سوودا کۆمەڵێك هۆکاری لاواز باس دەکەن، وهەرکاتیش هۆکاری حوکم نەزانرا قیاس ناکرێت.

٢- بۆچوونی زۆرینەی زانایان بەهەر چوار مەزهەبەکەوە پێیان وایە ئەو شەش شتەی لەفەرموودەکاندا باس کراون، تەنها خۆیان مەبەست نین بەڵکو هۆکاری حەرامبوونەکەیشیان مەبەستە، وئەو هۆکارانەیش تەنها لەواندا جێگیر نین، بەڵکو لەزۆر شتی تردا دەکرێت بەدی بکرێن و بوونیان هەبێت، وبۆیە فەرموودەکان باس لەو شەش

---

١ - الصنعاني (محمد بن إسماعيل)، سبل السلام شرح بلوغ المرام،ج٣، ط٤، مطبعة مصطفى البابي الحلبي وأولاده، مصر، ١٣٧٩، ص٣٨.

٢ - إبن القيم الجوزية، إعلام الموقعين عن رب العالمين، ج٢، ص١٧٥.

شتە دەکەن چونکە ئەوانە دیارترینی دراو وکاڵا بازرگانییەکانی سەردەمی خۆیان بوون، ودەشبنە بنەما وبنچینە بۆ هەموو کاڵا بازرگانییەکانی تریش، بۆ نموونە: ئاڵتون‌و زیو بنچینەن بۆ هەموو دراوێکی دونیا، وگەنم‌و جۆیش بنچینەن بۆ هەموو خواردنێکی دونیا، هەر بۆیەیش لەهەر سەردەمێکدا هەمان هۆکار لەهەر شتێکی تردا دروست بێت، بێگومان ئەو شتەیش حوکمی هەمان ئەو شەش شتە وەردەگرێت.

وە لەوەڵامی ظاهیرییەکان وهاوڕاکانیاندا دەڵێن ڕاستە دەقەکان هۆکاری حەرامبوونەکانیان دیاری نەکردوە، بەڵام قیاس تەنها بەو شێوەیە ناکرێت، کە هۆکاری حوکمەکە بزانرێت، بەڵکو بەدوو شێواز دەکرێت:

أ- شێوازێکیان ئەوەیە کە هۆکاری حوکمەکە بزانرێت، وەك ئەوەی پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموویێت: {كُلُّ مُسْكِرٍ خَمْرٌ وَكُلُّ خَمْرٍ حَرَامٌ}[1]. واتە: هەموو شتێك کە مرۆڤ سەرخۆش سەرخۆش بکات عارەقە، وهەموو عارەقێکیش حەرامە، کەواتە لێرەدا هۆکاری حەرامبوونەکە ڕوونە کە سەرخۆشکردنە، وهەرچی خواردنێك یان خورادنەوەیەك مرۆڤ سەرخۆش بکات هەمان حوکمی عارەقی هەیە.

ب- شێوازەکەی تر ئەوەیە کە هیچ جیاوازییەك لەنێوان حوکمی ئەصل وفەرعەکەدا نەبینرێت وبەم جۆرە قیاسەیش دەگوترێت (القياس بنفى الفارق)[2]. نموونەیش لەسەر شێوازە قیاسە زۆرن، لەوانە: کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرمویێت: {لَا يَقْضِيَنَّ حَكَمٌ بَيْنَ اثْنَيْنِ وَهُوَ غَضْبَانُ}[3]. واتە: دادوەر نابێت قسە لەکێشەی خەڵکیدا بکات وبڕیاری تێدا بدات ئەگەر تووڕە بوو؛ لێرەدا فەرموودەکە تەنها باسی تووڕە بوون دەکات بەبێ ئەوەی باس لە هۆکارەکەی بکات، بەڵام ئەم فەرموودەیە بەسەر هەموو ئەو حاڵەتانەی تردا دەچەسپێت کە

---

١ - مسلم، صحيح مسلم، ج٣،ص١٥٨٧، رقم الحديث (٢٠٠٣).

٢ - شە نقيطى دەربارەی ئەم جۆرە قیاسە دەڵێت: (إن إلحاق المسكوت عنه بالمنطوق به بنفي الفارق بينهما لا يكاد ينكره إلا مكابر، وهو نوع من القياس الجلي، ويسميه الشافعي ـ رحمه الله ـ القياس في معنى الأصل، وأكثر أهل الأصول لا يطلقون عليه اسم القياس، مع أنه إلحاق مسكوت عنه بمنطوق به؛ لعدم الفرق بينهما). الشنقيطي (محمد الأمين بن محمد بن المختار)، أضواء البيان في إيضاح القرآن بالقرآن، ج٣، دار الفكر، بيروت، ص١٤٧، تحقيق: مكتب البحوث والدراسات.

٣ - البخاري، صحيح البخاري، ج٩،ص٦٥، رقم الحديث (٧١٥٨)، مصدر سابق. مسلم، صحيح مسلم، ج٣، ص١٣٤٢، رقم الحديث (١٧١٧)، مصدر سابق. واللفظ للبخاري.

هەمان کاریگەریی تورەیی لەسەر دەروونی مرۆڤ دروست دەکەن، لەوانە، ترس، برسێتی، تەنگاوی وزۆر شتی تر[1]. یان کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: {لاَ طَلاَقَ...فِي إِغْلاَقٍ}[2]. واتە: تەڵاق ... لەکاتی تورەبونی زۆردا ناکەوێت، لێرەدا فەرموودەکە باسی هۆکاری نەکەوتنی تەڵاقەکە ناکات، بەڵام ئێمە دەزانین بەهۆی ئەو کاریگەرییە خراپەوەیە کە تورەیی لەسەر دەروونی مرۆڤی جێدەهێڵێت؛ بۆیە لە هەموو ئەو حاڵەتانەی تردا کە هەمان کاریگەری تورەییان هەیە تەڵاق ناکەوێت، لەوانە ئازار، وفشار، وپەشۆکان، وترس، وزۆر شتی تر.

کەواتە لەم حاڵەتەیشدا ولەم شەش شتەی کەلە فەرموودەکاندا ناویان هاتووە، ئەگەر چی هۆکاری حەرام بونەکەیشمان نەزانی، ئەوکات دێین ولەگەڵ هاوشێوەکانی خۆیان لێکیان دەچوێنین، بزانین لە زۆر ڕووەوە لە یەك دەچن یان نا، ئەگەر لەیەك دەچوون ئەو کات هەمان حوکمی یەکتر وەردەگرن، ئەگەریش نا ئەو کات قیاس ناکەین[3].

زانایان سەبارەت بەهۆکاری دروستبوونی سوو لە (ئاڵتون و زیو) دا دەڵێن: ئەم دووانە لەسەردەمی خۆیاندا دوو دراو بوون؛ بۆیە لە هەر سەردەمێکدا هەر شتێك بێت بە دراو، هەمان حوکمی ئاڵتونو زیوەکەی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ وەردەگرێت.

سەبارەت بە دروستبوونی سوو لەچوار شتەکەی تردا (جۆ، گەنم، خوێ، خورما) دەڵێن: ئەمانە قوت بوون لەسەردەمی خۆیاندا وژیانی خەڵکیان پێوە بەند بووە، بۆیە لەهەر سەردەم وهەر کۆمەڵگەیەکدا هەر شتێك ببێتە قوتی خەڵك هەمان حوکمی ئەو چوار

---

١ - إبن القيم لەڕاڤەی ئەو فەرموودەیەدا دەڵێت: (فمن قصر النهى على الغضب وحده، دون الهم المزعج، والخوف المقلق، والجوع والظمأ الشديد، وشغل القلب المانع من الفهم، فقد قل فقهه وفهمه، والتعويل في الحكم على قصد المتكلم والألفاظ لم تقصد لنفسها، وإنما هي مقصودة للمعاني، والتوصل بها إلى معرفة مراد المتكلم ومراده يظهر من عموم لفظه تارة، ومن عموم المعنى الذي قصده تارة، وقد يكون فهمه من المعنى). إبن القيم، إعلام الموقعين عن رب العالمين، ج١،ص٢٥٧، مصدر سابق.

٢ - البيهقي، السنن الكبرى، ج٧، ص٣٥٧، رقم الحديث (١٥٤٩٣). وحسنه الألباني في إرواء الغليل أنظر: محمد ناصر الدين الألباني، إرواء الغليل، ج٧،ص١١٣، مصدر سابق.

٣ - لەفەرهەنگی فیقهی کوەیتیدا هاتووە: (اتفق عامة الفقهاء على أن تحريم الربا في الأجناس المنصوص عليها إنما هو لعلة، وأن الحكم بالتحريم يتعدى إلى ما تثبت فيه هذه العلة، وأن علة الذهب والفضة واحدة، وعلة الأجناس الأربعة الأخرى واحدة، ثم اختلفوا في تلك العلة). وزارة الأوقاف والشؤون الإسلامية، الموسوعة الفقهية الكويتية، ج٢٢، ط٢، دار السلاسل، الكويت، ص٦٤.

شتە وەردەگرێت وسووی تێدا دروست دەبێت، وەکو برنج کە ئەمڕۆ بۆتە ژەمی سەرەکی ژیانی خەڵك، بۆیە قیاس دەکرێتە سەر گەنمو جۆ، هەر شتێکی تریش وەکو برنج وابێت هەمان حوکمی ئەوان وەردەگرێت[١].

وئەم بۆچوونەیش بۆچوونێکی پەسەند تر وواقیعی تر وزیاتر لەگەڵ ڕۆحی دەقەکان وشەرعدا دەگونجێت.

## دووەم: سووی دراوەکان:

هەندێك جار لێرەولەوێ بۆچوونێك دەبیستین کەگوایە حوکمی سووخۆری ئەو دراوانە ناگرێتەوە کە ئەمڕۆ خەڵکی مامەڵەیان پێوە دەکەن، وەکو دینار، ودۆلار، وتمەن، ویۆرۆ، وسەرجەم دراوەکانی تریش، بەو بیانووەی کە ئەمانە ئاڵتون وزیو نین؛ بەڵکو تەنها کاغەزێکی چاپکراون، وهەمان حوکمی فلسیان هەیە کە کاتی خۆی زانایان باسیان کردوە، وگوتویانە حوکمی سووخۆری بەسەریدا جێبەجێ ناکرێت.

پێم خۆشە لێرەدا ولەم چەند خاڵەدا وەڵامی ئەم گومانە بدەمەوە:

١- ڕاستە زانایان کاتی خۆی گوتویانە سوو لەفلسدا دروست نابێت؛ بەڵام دەبێت بزانین ئەو فلسەی ئەوان باسیان کردوە چیبووە، وبۆچی گوتویانە سووی تێدا دروست نابێت، بەگەڕانەوە بۆ قسەکانیان بۆمان دەردەکەوێت ئەو فلسەی سەردەمی ئەوان دراو نەبووە، بەڵکو دراو لەو سەردەمانەدا ئاڵتون وزیو بووە، وفلس ووردەیەکی زۆر بێنرخی وەکو یەك دیناری عێراقی ئەم سەردەمەی خۆمان بووە، کەهەر سکەی نییە وهیچیش ناکات، خۆیشیان ڕاشکاوانە باس لەوە دەکەن کە بۆیە سووی تێدا دروست نابێت چونکە دراو نییە، کەواتە ئەو بۆچوونەی ئەوان تەنها بۆ فلسی سەردەمی خۆیان بووە، و هۆکارەکەیشی ئەوە بووە کە فلس بەهایەکی ئەوتۆی نەبووە لەو سەردەمانەدا.

مەقریزی لەو بارەیەوە دەڵێت: (إنَّ الفلوس لم يجعلْها الله سبحانه نقدًا في قديم الدهر وحديثه، حتى راجتْ في أيّام الناصر فرج بن برقوق ٨٠٨ هـ.. وقد حَدَث من رواج الفلوس خرابُ

---

١ - هەرچەندە لێکدانەوەی تر زۆرە بۆ هۆکاری دروستبوونی سوو لەئاڵتون وزیو، وچوار جۆرە خواردەمەنیەکەی تردا، بەڵام ئەوەی لەسەرەوە هەڵمانبژاردوە، وباسمان کردوە دیارترین وبەهێزترینی ئەو بۆچوونانەن.

الإقليم وذَهابُ نِعمة أهل مصر، فإنَّ الفضَّة هي النقد الشرعي، أما الفلوس فهي أشبهُ شيءٍ بلا شيء... ولا يُعلَم في خبرٍ صحيح ولا سقيم عن أُمَّة من الأمم اتَّخذوا نقدًا غير الذهب والفِضَّة، أمَّا السفاسف والمحقَّرات والتوافه فقدِ احتاج الناس لشرائها بأقلَّ مِن الدرهم وأجزائه، فكانت الفلوسُ وسيلةَ هذه المبادلات، ولكنَّها لم تكن نقدًا البتةَ، ولم يوجدْ منها إلا اليسير، ولم تقُمْ في إقليمٍ ما بمنزلة النقدين)[1]. واتە: خوای گەورە نە لەکۆن ونە لە ئێستایشدا فلسی نەکردۆتە دراو ونەخت، تا لە سەردەمی ناصری فەرەجی کوڕی بەرقوقدا لەساڵی (٨٠٨)ك بەهای پەیدا کرد، بەها پەیدا کردنی فلسیش بووە مایەی کاولبوونی وڵات، ونەمانی ڕزق ورۆزی خەڵکی میسر؛ چونکە زیو دراوی شەرعی وسەرەکی بوو، بەڵام فلس لەگشت ڕوویەکەوە لەهیچ ناچێت، ولەهیچ هەواڵێکی ڕاست ودرۆیشدا نەبیستراوە کە میللەتێك لە میللەتان جگە لە ئاڵتون وزیو دراوێکی تریان بەکار هێنابێت، بەڵام بۆ کڕینی شتە بێنرخ وهیچەکان کە خەڵك پێویستی بووە بەکەمتر لەدرهەمێکی زیو وبەشەکانی بیکڕێت، فلس تاکە ئامراز بووە بۆ ئەو جۆرە مامەڵانە، بەڵام هەرگیز بەدراو ئەژمار نەکراوە، وهەمیشەیش ژمارەیان زۆر کەم بووە، ولەهیچ وڵاتێکیشدا جێگەی ئاڵتون وزیوی نەگرتۆتەوە.

پرسیارەکە لێرەدا ئەوەیە ئایا ئەو فلسەی کە زانایان بەو شێوەیە باسی دەکەن و لەو سەردەمانەدا هەبووە، لەم سەردەمەدا بوونی هەیە تا هەمان حوکمی هەبێت؟!، ئایا دینار، ودۆلار، وتمەن، ویۆرۆ، لەم سەردەمەدا وەك ئەو فلسەی سەردەمی ئەوان وایە و ئەوەندە بێ بەهان؟! ئایا ئەو دراوانە لە ئێستادا جێی ئاڵتون وزیوی سەردەمی ئەوانیان نەگرتۆتەوە ودراوی فەرمی نین؟! ئایا هەرچی مامەڵەی حکومات، وبانکەکان، ودامەزراوە داراییەکان، وکۆمپانیاکان، وتاکەکانیشە بەم دراوانە بەڕێوە ناچێت؟! کەواتە چۆن وبەچ بەڵگەیەك بڵێین دینار ودۆلاری ئەمڕۆ هەمان فلسی سەردەمی ئەوانە، وبەهەمان شێوەیش حوکمی سوو نایگرێتەوە.

٢-یەکێك لەهۆکارەکانی دروستبوونی سوو لەئاڵتون وزیودا وەك زانایان باسی دەکەن ئەوەیە کە ئەوانە دراون، ونرخی شت ومەکەکان بەوانە هەڵدەسەنگێنرێت، کەواتە هەرچی وەکو ئەوان وابێت وببێت بەدراو ونرخ بۆ کاڵاکان، هەمان حوکمی ئەوان وەردەگرێت

---

١ - المقريزي (أحمد بن علي بن عبد القادر)، رسائل المقريزي، ط١، دار الحديث، القاهرة، ١٤١٩، ص١٧٢.

لەرێگەی قیاسەوە، ئیتر ئەو شتە هەر ناوو هەر سیفەتێکی هەبێت گرنگ نییە؛ چونکە لە أصولی فیقهدا بنەمایەکمان هەیە دەڵێت: (الأحكام تدور مع عللها وجودا وعدما). واتە: حوکمە شەرعییەکان وابەستەن بەهۆکارەکانیانەوە لەبوون ونەبووندا، وهەرکات هۆکارەکان دروستبوون حوکمە شەرعییەکانیش بوونیان دەبێت، وك ەهۆکارەکانیش نەمان حوکمە شەرعییەکانیش بوونیان نامێنێت.

لێرەشدا وبەهۆی ئەوەی ئەم جۆرە شتانە لەژیانی کۆمەڵگەکاندا جێگیر نین، وبەردەوام گۆڕانکارییان بەسەردا دێت، نابێت حوکم ببەسترێتەوە بەخودی شتەکەوە، بەڵکو بەهۆکارەکەیەوە تا بۆ هەموو سەردەم وکۆمەڵگەیەك گونجاو بێت.

بۆ نموونە: کاتی خۆی ئاڵتون وزیو دراو بوون، دواتر کەنرخی ئاڵتون وزیو بەرز بوویەوە، بیر لەوە کرایەوە کاغەزێك دروست بکرێت هەمان هەبووی (رصيد) ی ئاڵتون وزیوەکەی هەبێت، وخەڵکی لەبری ئەوەی ئاڵتون وزیو لەگەڵ خۆیان هەڵبگرن، ئەو کاغەزانە لەگەڵ خۆیان هەڵبگرن، تا ئاڵتونەکان لەمەترسی ونبوون ودزین وشکان پارێزراوبن.

دواتر ولەدەرئەنجامی پێشکەوتنی ژیانی کۆمەڵگەکان ئەو کاغەزانە خۆیان بوون بە هەبوو (رصيد)، ولەبەرامبەریاندا ئاڵتون نەما، پاش ماوەیەکی تر چەکی بانکی دروستبوو کەتەنها کاغەزێکی چاپکراوە وهیچی تر، وبەسەددەها کاغەزی چاپکراوی لەو چەکە بەبەتاڵی فرێبدە یەك دینار ناکات، بەڵام کە پڕت کردەوە، هەرچەندی لەسەر بنووسیت، بایی ئەوەندە پارەیە، یان کۆمپیالە کەهەر لەسەر کاغەزێکی سپی چاپنەکراویش دەنووسرێت، بڕی چەند پارەی لەسەر بنووسرێت بایی ئەوەندە پارەیە.

ئێستا دەمانەوێت بپرسین ئایا ئەم چەك وکۆمپیالانە دراون یان نا؟!. وە حوکمی سوو دەیانگرێتەوە یان نا؟! لەکاتێکدا ئەمانە تەنها کاغەزێکن وهیچی تر؟! بەدڵنیاییەوە بەڵێ، چونکە هیچ عاقڵێك نەك زانا ناڵێت ئەوانە تەنها کاغەزن ودراو نین وحوکمی سوو نایانگرێتەوە؛ بەڵکو هەموو زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی کە ئەوانە وەکو پارە ودراو مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێت، وهەموو حوکمەکانی پارە ودراویشیان بەسەردا جێبەجێ دەکرێت.

ئەمانەیش ئەو شتانەن کە ئەمڕۆ ولەسەردەمی ئێمەدا بوونیان هەیە، ئیتر ئێمە نازانین لەداهاتوودا چی ڕوو دەدات، ومامەڵەی خەڵك بەچی دەبێت، گرنگ ئەوەیە هەرچی شتێك بوو بەدراو ونرخ بۆ کاڵاکان لەهەر سەردەم وکۆمەڵگەیەکدا، هەمان حوکمی ئاڵتون وزیوی هەیە ئیتر کانزاکەی هەرچی بێت گرنگ نییە.

ئەمەیش هەندێك لە فەتوای زانایانە لەو بارەیەوە:

- پێشەوا مالیك دەڵێت: (وَلَوْ أَنَّ النَّاسَ أَجَازُوا بَيْنَهُمْ الْجُلُودَ حَتَّى تَكُونَ لَهَا سِكَّةٌ وَعَيْنٌ لَكَرِهْتُهَا أَنْ تُبَاعَ بِالذَّهَبِ وَالْوَرِقِ نَظِرَةً)[1]. واتە: ئەگەر خەڵکی ڕازیببوون بەوەی بەپێستی ئاژەڵ مامەڵە بکەن، وکردیانە دراو وسکەیان پێ لێدا، پێم باش نییە بفرۆشرێت بە ئاڵتون و زیو ویەکێکیان (ئاڵتون وزیوەکە، یان پێستەکە) لەکاتی ئەنجامدانی گرێبەستەکەدا ئامادە نەبن.

- پێشەوا شافیعی دەڵێت: (والذهب والورق مباينان لكل شيء، لأنها أثمان كل شيء)[2]. واتە: ئاڵتون و زیو لە هەموو شتێکی تر جیاوازن؛ چونکە ئەوانە نرخ و بەهای هەموو شتەکانن.

- ئیبن حەجەر دەڵێت: (لو راجت الفلوس رواج النقود ثبت لها أحكامها)[3]. واتە: هەرکات فلس وەکو دراوەکانی تر بەهای پەیدا کرد، ئەو کات هەمان حوکمی ئەوان وەردەگرێت.

- ئیبن تەیمییە دەڵێت: (عِلَّةَ تَحْرِيمِ الرِّبَا فِي الدَّنَانِيرِ وَالدَّرَاهِمِ والأظهر أن العلة في ذلك هُوَ الثمنية .. كَمَا قَالَهُ جُمْهُورُ الْعُلَمَاءِ)[4]. واتە: بۆچوونی دیار وپەسەند ئەوەیە کە هۆکاری قەدەغە کردنی سوو لەدینار ودرهەمدا ئەوەیە کە ئەوانە نرخی کاڵا وشمەکەکانن، هەر وەك زۆربەی زانایان دەڵێن. هەروەها دەڵێت: (وأمَّا الدرهم والدينار فما يُعرَف له حدٌّ طبعي، ولا شرعي، بل مرجعُه إلى العادة والاصطلاح؛ وذلك لأنَّه في الأصل لا يتعلق المقصود به، بل الغرضُ أن يكون معيارًا لما يتعاملون به، والدراهم والدنانير لا تُقصد لنفسها، بل هي وسيلةٌ إلى التعامل بها، ولهذا

---

١ - مالك ابن أنس، المدونة، ج٣، ص٥، مصدر سابق.

٢ - الشافعي، الأم، ج٣، ص١٥، مصدر سابق.

٣ - إبن حجر الهيثمي، الفتاوى الكبرى الفقهية على مذهب الإمام الشافعي، ج٤، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤١٧، ص٤١.

٤ - إبن تيمية، مجموع الفتاوى، ج٢٩، ص٤٧١.

كانتْ أثمانًا بخلاف سائرِ الأموال)[١]. واتە: بەڵام دینار ودرهەم پێناسەیەکی شەرعی یان سروشتیان نییە؛ بەڵکو دەگەڕێینەوە بۆ کلتوری کۆمەڵگەکان وناوەڕۆکی شتەکان؛ چونکە لەبنەڕەتدا خودی دراوەکە خۆی مەبەست نییە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە پێوەر بێت بۆ مامەڵەی خەڵکی، درهەم ودیناریش بۆ خۆیان مەبەست نین، بەڵکو ئەوانە تەنها ئامرازێکن بۆ مامەڵە کردن، هەربۆیە ئەوانە نرخن بۆ کاڵاکان جیاواز لەشتەکانی تر.

٣- قیاس کردنی ئەم دراوانە لەسەر فلس بەپێی بنەماکانی فیقهی ئیسلامی قیاسێکی بەتاڵ وپووچە؛ چونکە لە قیاسدا هەمیشە دەبێت حوکمی ئەصلەکە کەدەمانەوێت قیاسی لەسەر بکەین، خۆی دەقی لەسەر هاتبێت، ئێستا فلس خۆی هیچ دەقێکی لەسەر نەهاتووە، بەڵکو قیاس کراوەتە سەر ئاڵتون وزیو ولەوانەوە حوکمەکەی وەرگیراوە، کەواتە خۆی فەرعە نەك ئەصڵ، ئێستا ئێمە کە دەمانەوێت حوکمی ئەم دراوە کاغەزییانە بزانین نابێت قیاسی بکەینە سەر فلس کەخۆی فەرعە ولەئەصلێکی ترەوە حوکمەکەی وەرگرتوە، بەڵکو دەبێت ڕاستە وخۆ قیاسی بکەینە سەر ئەو ئەصلەی کە دەقەکەی لەسەر هاتووە کە ئاڵتون وزیوە نەك فەرعەکە کە فلسە، بۆ نموونە: گەنم لەدەقە شەرعییەکاندا ناووی هاتووە کە سووی تێدا دروست دەبێت، بەڵام برنج ناوی نەهاتووە، وئێمە بۆ دۆزینەوەی حوکمەکەی قیاسی دەکەینە سەر گەنم، دواتر ئەگەر ویستمان حوکمی نیسك بدۆزینەوە، ئایا قیاسی دەکەینە سەر برنج، کەهیچ دەقێکی لەسەر نەهاتووە، وخۆی حوکمەکەی لە ئەصڵێکی ترەوە وەرگرتوە؟ یان ڕاستەوخۆ قیاسی نیسك دەکەینەوە سەر گەنم کە ئەصلەکەیە، بێگومان دەبێت قیاسی بکەینەوە سەر گەنم، وئەمەیش کۆدەنگی زانایانی لەسەرە. کەفەرع قیاس ناکرێتە سەر فەرعێکی تر بەڵکو قیاس دەکرێتە سەر ئەصلەکە، بۆیە ئەم بۆچوونە لەڕووی بنەما فیقهییەکانیشەوە بەتاڵە.

٤- ئەگەر گریمان ئەم بۆچوونە ڕاست بێت کە ئەم دراوانە حوکمی ئاڵتون وزیویان بەسەردا جێبەجێ ناکرێت وسوویان تێدا دروست نابێت، ئەو کات دەبێت بڵێین زەکاتیشیان تێدا واجب نابێت، وهەرکەسیش بیاندزێت دەستی نابڕدرێت؛ چونکە هەموو ئەو حکومانە پەیوەستن بەدراوی ئاڵتون وزیووەوە و ئەم دراوانەیش نەئاڵتونن نە زیو بەڵکو کاغەزن.

---

١ - إبن تيمية، مجموع الفتاوى، ج١٩، ص٢٥٢.

ئایا هیچ كەسێكی ژیر ئەم قسەیە دەكات؟!! مەحاڵە.

ئەمەیش فەتوای زانایانی هاوچەرخە لەو بارەیەوە:

كۆمكاری فیقهی ئیسلامی سەر بە رابیطەی جیهانی ئیسلامی دەڵێت: (قرر المجمع بخصوص أحكام العملات الورقية أنها نقد قائم بذاته لها الأحكام الشرعية المقررة للذهب والفضة من حيث أحكام الربا، والزكاة، والسلم، وسائر أحكامها ،والعلة في ذلك مطلق الثمنية). واتە: كۆمكار سەبارەت بەحوكمی ئەو دراوانەی كە كاغەزن برپاریدا كە ئەوانە دراوێكی سەربەخۆن وهەمان ئەو حوكمە شەرعییانە دەیانگرێتەوە كە بۆ ئاڵتون وزیو بڕیار دراون لەڕووی حوكمەكانی سوو، وزەكات، وسەلەم، وسەرجەم حوكمەكانی تریش، هۆكارەكەیشی ئەوەیە كە ئەوانە نرخن بۆ كاڵاكان[١].

---

١ - ئەمەیش درێژەی دەقی فەتواكەیانە:

قرار (مجلس المجمع الفقهي) برابطة العالم الإسلامي بمكة المكرمة الدورة الخامسة قرار رقم (٦):

أولا: إنه بناء على أن الأصل في النقد هو الذهب والفضة ، وبناء على أن علة الربا فيهما هي مطلق الثمنية في أصح الأقوال عند فقهاء الشريعة.

وبما أن الثمنية لا تقتصر عند الفقهاء على الذهب والفضة، وإن كان معدنهما هو الأصل.

وبما أن العملة الورقية قد أصبحت ثمنا، وقامت مقام الذهب والفضة في التعامل بها، وبها تقوم الأشياء في هذا العصر، لاختفاء التعامل بالذهب والفضة، وتطمئن النفوس بتمولها وادخارها، ويحصل الوفاء والإبراء العام بها، رغم أن قيمتها ليست في ذاتها، وإنما في أمر خارج عنها، وهو حصول الثقة بها كوسيط في التداول والتبادل، وذلك هو سر مناطها بالثمنية.

وحيث إن التحقيق في علة جريان الربا في الذهب والفضة هو مطلق الثمنية، وهي متحققة في العملة الورقية، لذلك كله فإن مجلس المجمع الفقهي يقرر أن العملة الورقية نقد قائم بذاته، له حكم النقدين من الذهب والفضة، فتجب الزكاة فيها، ويجري الربا عليها بنوعيه فضلا ونسيئة، كما يجرى ذلك في النقدين من الذهب والفضة تماما، باعتبار الثمنية في العملة الورقية قياسا عليهما. وبذلك تأخذ العملة الورقية أحكام النقود في كل الالتزامات التي تفرضها الشريعة فيها.

ثانيا: يعتبر الورق النقدي نقدا قائما بذاته كقيام النقدية في الذهب والفضة وغيرهما من الأثمان، كما يعتبر الورق النقدي أجناسا مختلفة تتعدد بتعدد جهات الإصدار في البلدان المختلفة. بمعنى أن الورق النقدي السعودي جنس، وأن الورق النقدي الأمريكي جنس، وهكذا كل عملة ورقية جنس مستقل بذاته، وبذلك يجري فيها الربا بنوعيه فضلا ونسيئة، كما يجري الربا بنوعية في النقدين الذهب والفضة وفي غيرهما من الأثمان. وهذا كله يقتضي ما يلي:

(أ) لا يجوز بيع الورق النقدي بعضه ببعض، أو بغيره من الأجناس النقدية الأخرى، من ذهب أو فضة أو غيرهما، نسيئة مطلقا. فلا يجوز مثلا بيع ريال سعودي بعملة أخرى متفاضلا نسيئة بدون تقابض.

(ب) لا يجوز بيع الجنس الواحد من العملة الورقية بعضه ببعض متفاضلا، سواء كان ذلك نسيئة أو يدا بيد، فلا يجوز مثلا بيع عشرة ريالات سعودية ورقا، بأحد عشر ريالا سعودية ورقا، نسيئة أو يدا بيد.

- کۆمکاری فیقهی ئیسلامی سەر بە ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی دەڵێت: (بخصوص أحكام العملات الورقية: أنها نقود اعتبارية فيها صفة الثمنية كاملة، ولها الأحكام الشرعية المقررة للذهب والفضة من حيث أحكام الربا والزكاة والسلم وسائر أحكامهما)[1]. واتە: سەبارەت بە حوکمی دراوە کاغەزییەکان: ئەوانە دراوی متمانەپێکراون وهەموو سیفاتەکانی نرخبوونیان تێدایە، وهەموو حوکمەکانی ئاڵتون وزیویان بەسەردا دەچەسپێت، لەڕووی دروستبوونی سوو، وزەکات، وسەلەم، وسەرجەم حوکمەکانی تریش.

---

(ج) يجوز بيع بعضه ببعض من غير جنسه مطلقا، إذا كان ذلك يدا بيد، فيجوز بيع الليرة السورية أو اللبنانية بريال سعودي ورقا كان أو فضة، أو أقل من ذلك، أو أكثر. وبيع الدولار الأمريكي بثلاثة ريالات سعودية، أو أقل من ذلك، أو أكثر، إذا كان ذلك يدا بيد، ومثل ذلك في الجواز بيع الريال السعودي الفضة بثلاثة ريالات سعودية ورق، أو أقل من ذلك أو أكثر يدا بيد؛ لأن ذلك يعتبر بيع جنس بغير جنسه، لا أثر لمجرد الاشتراك في الاسم مع الاختلاف في الحقيقة.

ثالثا: وجوب زكاة الأوراق النقدية، إذا بلغت قيمتها أدنى النصابين من ذهب أو فضة، أو كانت تكمل النصاب مع غيرها من الأثمان والعروض المعدة للتجارة.

رابعا: جواز جعل الأوراق النقدية رأس مال في بيع السلم، والشركات. والله أعلم. وبالله التوفيق. وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم. انتهى.

١ - مجمع الفقه الإسلامي المنعقد في دورة مؤتمره الثالث بعمان عاصمة المملكة الأردنية الهاشمية من ٨-١٣ صفر ١٤٠٧هـ /١١ — ١٦ تشرين الأول (أكتوبر) ١٩٨٦م. هەمان کۆمکار لە کۆنگرەیەکی تریدا دەڵێت: (لم يبق الذهب والفضة وسيلة للتبادل في العصر الراهن، واحتلت مكانهما العملات الورقية، وقوانين الدولة كذلك تعتبر العملات الورقية ثمنا بصفة كاملة، وتقرر للناس قبول هذه العملات الورقية كثمن، والحاصل أنه قد أصبحت العملات الورقية ثمنا قانونيا في التعامل والأعراف، ومن ثم ظهرت مشكلات من الناحية الشرعية بصدد هذا التعامل، فتناولت الندوة الموضوع بالبحث والنقاش وبعد ذلك قررت بإجماع المشاركين ما يلي:

أولا: العملات الورقية ليست وثيقة وسندا، ولكنها ثمن، وهي في الشرع بمثابة الثمن الاصطلاحي والقانوني على الوجه الأكمل.

ثانيا: إن العملات الورقية قد احتلت في العصر الراهن صفة الثمن الخلقي (الذهب والفضة) باعتبارها وسيلة للتبادل والتعامل، وعن طريقها يتم التعامل اليوم، وعليه، فإنها تشبه الثمن الحقيقي في الأحكام تماما، لذا لا يجوز تبادل عملة بلد بعملة نفس ذلك البلد بالزيادة أو النقصان لا معجلا ولا مؤجلا.

ثالثا: العملات الورقية لبلدين مختلفين تعتبر جنسين مختلفين، وبناء على هذا يجوز تبادل مثل هذه العملات الورقية بالزيادة والنقصان عند تراضي الطرفين.

رابعا: تجب الزكاة على العملات الورقية. خامسا: يعتبر نصاب الزكاة في العملات الورقية بما يساوي ثمن نصاب الفضة). قرار مجمع الفقه الإسلامي بالهند، في الندوة الفقهية الثانية التي عقدت بجامعة همدرد، (دلهي)في الفترة: ٨-١١ من جمادى الأولى ١٤١٠ هـ الموافق ٨-١١ ديسمبر ١٩٨٩م، القرار رقم: (٢/٢).

- دەزگای گەورە زانایانی سعودی لەفەتوایەکیاندا لەم بارەیەوە دەڵێن: (إنَّ القَول باعتبار مُطلَق الثَّمنيّة عِلَّة في جَرَيان الرِّبا في النِقدين هو الأَظهَر دَليلاً والأَقرَب إلى مَقاصِد الشِريعَة... وأنه يترتب على ذلك الأحكام الشرعية الآتية: أولاً: جَريان الرّبا بنوعَيه فيها كما يَجري الرّبا بنَوعَيه في النَّقدَين الذَّهَب والفِضة وفي غَيرها مِن الأَثَمان كَالفُلوس)[١]. واتە: ئەو بۆچوونەی دەڵێت هۆکاری دروستبوونی سوو لە ئاڵتونو زیودا تەنها ئەوەیە کە ئەوانە نرخن بۆ کاڵاکان، بەڵگەکانی بەهێزترە ونزیکتریشە لە مەبەست وئامانجەکانی شەرعەوە. وئەم بۆچوونەیش ئەم حوکمانەی لەسەر دادەمەزرێت: یەکەم: هەردوو جۆرەکەی سوو لەو دراوانەدا ولەهەرچی دراو ونرخی تریشدایە وەکو فلس دروست دەبێت، وەك چۆن هەردووکیان لە ئاڵتون وزیودا دروست دەبن.

- شێخ بن بازیش دەڵێت: (العملة الورقية منزلة الذهب والفضة في جريان الربا في بيع بعضها ببعض ، وفي بيع الذهب والفضة بها)[٢]. واتە: دراوە کاغەزییەکان وەکو ئاڵتون وزیو وان لەدروستبوونی سوودا، ولە کاتی فرۆشتنیان بەیەکتر، ولە کاتی فرۆشتنی ئاڵتون وزیوییش بەو دراوانە.

- شێخ یوسف قەرەضاویش دەڵێت: (وذهب بعضهم إلى أن الربا إنما هو في الذهب والفضة، ونحن اليوم نتعامل بالنقود الورقية، فلا هي ذهب ولا فضة، وعلى هذا لا يجري فيها الربا، ولا تجب فيها

---

١ - ئەمەیش دەڕێژەی پرسیار وفەتواکەیانە لەو بارەیەوە: (س: هل يقع الربا في الفلوس وفي الليرة التركية المنقوشة بصور مخصوصة، المأخوذة من القرطاس والنحاس، وكذا ريال العربية السعودية الإسلامية، المأخوذة من القرطاس والنحاس أم لا؟. وأجابت بما يلي:

أولا: جريان الربا بنوعيه فيها كما يجري الربا بنوعيه في النقدين الذهب والفضة وفي غيرها من الأثمان كالفلوس وهذا يقتضي ما يلي:

لا يجوز بيع بعضه ببعض أو بغيره من الأجناس النقدية الأخرى من ذهب أو فة أو غيرهما نسيئة مطلقا.

لا يجوز بيع الجنس الواحد منه بعضه ببعض متفاضلا سواء كان ذلك نسيئة أو يدا بيد.

يجوز بيع بعضه ببعض من غير جنسه مطلقا إذا كان ذلك يدا بيد.

ثانيا: وجوب زكاتها إذا بلغت قيمتها أدنى النصابين من ذهب أو فضة، أو كانت تكمل النصاب مع غيرها من الأثمان والعروض المعدة للتجارة إذا كانت مملوكة لأهل وجوبها.

ثالثا: جواز جعلها رأس مال في السلم والشركات.

ا ه. الرئاسة العامة للبحوث العلمية والإفتاء، مجلة البحوث الإسلامية، ج١٠ص١١٩.

٢ - مجموع فتاوى ابن باز،ج١٩، ص١٥٨. مصدر سابق.

الزكاة! وهذا كلام أوهى من أن يرد عليه)[1]. واتە: هەندێك پێیان وایە كە سوو تەنها لە ئاڵتون وزیودا هەیە، وئێمە ئەمڕۆ مامەڵە بە دراوی كاغەز دەكەین، كە نە ئاڵتونە ونەزیو، هەر بۆیە سوویان تێدا دروست نابێت، وزەكاتیان لێ ناكەوێت، ئەم قسە و بۆچوونە زۆر لەوە بێنرخترە كە وەڵامی بدرێتەوە.

بۆیە بەڕێزان ئەركی سەر شانی هەموو لایەكمانە بەشوێن ڕاستییەكاندا بگەڕێنن، وبەڵگەی شەرع لەگەڵ هەركەس بێت بەگوێی بكەین، وبەگومان وقسەی بێ بنەما خۆمان هەڵنەخەڵەتێنین، وحەرام دەرخواردی خومان وخانەوەدا وخەڵكانی موسوڵمان نەدەین.

---

١ - د. يوسف القرضاوي، فوائد البنوك هي الربا الحرام، مقدمة الكتاب. موقع الشيخ القرضاوي:
http://www.qaradawi.net/new/library٢/٢٨٧-٢٠١٤-٠١-٢٦-١٨-٥٣-٤٦/٣٧٥٠

## بەشی دوازدە[١]

## سووی خشڵی ئاڵتون وزیو، ودواکەوتنی یەکێک لەکاڵاکان

لەم بەشەدا قسە لەسەر وەڵامی دوان لەو گومانانە دەکەین کە لەسەر بابەتی سوو دروست دەکرێن و ئەمڕۆ خەڵکانێك بەڵگەی پێ دەهێننەوە بۆ خۆدەربازکرن لە حوکمە شەرعییەکان، گومانەکانیش بریتین لە:

یەکەم: سووی مامەڵەی خشڵ.

دووەم: سووی دواکەوتنی یەکێك لەکاڵاکان.

سەرەتا لەگومانی یەکەمەوە دەستپێ دەکەین:

### یەکەم: سووی مامەڵەی خشڵ:

یەکێك لەو گومانانەی ئەمڕۆ خەڵکانێك خۆیان پێوە سەرقاڵ کردوە، وپاساوی هەندێك مامەڵەی ناشەرعی خۆیانی پێ دەدەنەوە، ئەوەیە کە ئەو ئاڵتون و زیوانەی ئەمڕۆ لەبەر دەستدان هیچیان دراونین، ونرخیش نین بۆ شتومەکەکان، بەڵکو هەموویان خشڵن و کاڵایەکی خۆ ڕازاندنەوەن بۆیە سوویان تێدا دروست نابێت، بەپێچەوانەی ئاڵتون وزیوی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ وهاوەڵانی وزانایانی پێشین کە دراو بوون ومامەڵەیان پێوە کراوە، ونرخی کاڵا و شتومەکەکانیان پێ دیاری کراوە.

بۆ وەڵامدانەوە وڕونکردنەوەی ئەم گومانە ئەم چەند خاڵە دەخەینە ڕوو:

١- ئەوانەی سەرچاوەی ئەم بۆچوون وگومانەن وپێیان وایە خشڵی ئاڵتون وزیو وەکو کاڵا تەماشا دەکرێن، وحوکمی دراوی سەردەمی پێغەمبەریان ﷺ نییە، وسوویان تێدا دروست نابێت کەمینەیەکی زۆر کەمن لە زانایان کە بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن ئەوانیش: (معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان، وإبراهیم، ونەخەعی، وحەسەنی بەصری، وئیبن تەیمییە[٢]، وئیبن قەییم) ن. ئیبن تەیمییە لەو بارەیەوە دەڵێت: (ويجوز بيع المصوغ من

---

١ - ئەم بەشە ڕۆژی (٢٠١٥/٢/٢٨) تۆمار کرا.

٢ - هەرچەندە ئیبن تەیمییە لەم بابەتەدا دوو بۆچوونی دژ بەیەك وجیاوازی هەیە، لەبۆچونێکیدا وەکو زۆرینەی زانایان دەڵێت حەرامە، لەبۆچونێکی تریدا دەڵێت دروستە وحەرام نیە.

الذهب والفضة بجنسه من غير اشتراط التماثل، ويجعل الزائد في مقابلة الصنعة)[١]. واتە: دروستە ئاڵتونو زیو بفرۆشرێت بەئاڵتون وزیوی هاوشێوەی خۆی ئەگەر کرابوون بە خشڵ، بەبێ ئەوەی مەرجی یەکسانبوونیشیان تێدا بێت، وئەو زیادەیەی لەکێشی یەکێکیاندا دروست دەبێت لەبەرامبەر دروستکردنەکەیدا دەبێت.

ئیبن قەییم ی قوتابیشی لەو بارەیەوە دەڵێت: (الحلية المباحة صارت بالصنعة المباحة من جنس الثياب والسلع لا من جنس الأثمان، ولهذا لم تجب فيها الزكاة، فلا يجري الربا بينها وبين الأثمان، كما لا يجري بين الأثمان وبين سائر السلع)[٢]. واتە: خشڵێك كە بەشێوازێكی شەرعی دروستكرابێت وبەكارهێنانی ڕێگەپێدراو بێت، بەبوون وكردنی بەخشڵ ئیتر لە قاڵبی دراو دەچێتە دەرەوە، و دەچێتە قاڵبی پۆشاك وهەر كاڵایەكی ترەوە، هەر بۆیە زەكاتیشی تێدا واجب نابێت، وبەهەر دراوێكی تریش بگۆڕدرێتەوە سووی تێدا دروست نابێت، هەر وەك چۆن سوو لەنێوان دراو وكاڵاكانی تردا دروست نابێت.

٢- ئەو بەڵگانەی ئەم بەڕێزانە پشتیان پێ بەستووە سەرجەمیان بەڵگەی عەقڵیین ولێكدانەوەی خۆیانە[٣]، وتەنانەت یەك بەڵگەی دەقی قورئان، یان فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ، یان قسەی هاوەڵانیشیان بەدەستەوە نییە، ودەتوانین كۆی بەڵگەكانیان لەم چەند خاڵەدا كورت بكەینەوە:

أ- هۆكاری دروستبوونی سوو لە ئاڵتون وزیودا تەنها ئەوەیە كە ئەوانە دراون، وهەركات لەدراوێتی كەوتن و بوون بەخشڵ وبابەتی خۆ ڕازاندنەوە حوكمەكەیان دەگۆڕێت و وەك كاڵایەك تەماشا دەكرێن، با كانزاكەیشیان هەر ئاڵتون وزیوو بێت.

---

١ - إبن تيمية (أحمد بن عبد الحليم بن تيمية)، الفتاوى الكبرى، ج٥، ص٣٩١، مصدر سابق.

٢ - إبن القيم، إعلام الموقعين عن رب العالمين، ج٢،ص١٨٠، مصدر سابق.

٣ - هەرچەندە ئەم دوو زانا بەڕێزە زۆر بەهرەمەند وبلیمەت بوون، وخزمەتێكی بێسنووریان بەئاینی ئیسلام وموسوڵمانان كردوە، وبۆچوون ولێكدانەوەی زۆر بەبەها وناوازەیان هەیە، ودەكرێت وەك قوتابخانەیەكی فیقهی سەربەخۆ تەماشا بكرێن، بەڵام لەسەرئەنجامدا ئەوانیش مرۆڤن، ودەكرێت لەهەندێك بابەتدا نەیانپێكابێت، وبەڵگە شەرعییەكانیان وەكو پێویست بەدەست نەگەیشتبێت، بەڵام گرنگ ئەوەیە هەمیشە پێگەی دەق وڕاستی لە سەروو پێگەی هەموو كەسێكەوەیە، بۆیە ڕەخنە گرتن لەم بۆچوونەیان هیچ لەگەورەیی ئەوان كەم ناكاتەوە، وپێگەی پێشەوایەتییان لەق ناكات.

ب- ئەگەر کەسێك بیست مسقاڵ ئاڵتونی خشڵی هەبێت وبیفرۆشێت بەهەمان کێشی خۆی لەدراوی ئاڵتون، ئەی ئەو هەموو ماندوبوون وخەرجییەی کە بۆ تواندنەوە ولەقاڵبدان ونەخشاندنی خشڵەکە کاری کردوە، دەکەوێت ئەستۆی کێ، وکێ لێی بەرپرسیارە؟. خۆ ئەگەر وابێت وخەڵکی بەهەمان کێشی دراو خشڵەکانیان بفرۆشنەوە ئەو کاتە کەس کاری زەڕەنگەری ناکات؛ چونکە هەموو ئەرك وماندوبوون وخەرجییەکانیشی بە بەلاش دەڕۆن.

ت- ئەگەر گوتمان خشڵیش هەمان حوکمی دراوی هەیە، ئەوکات یان دەبێت بەخەڵك بڵێین کە ئیتر خشڵ دروست مەکەن؛ چونکە دەبێت بە هەمان نرخ وکێشی خۆی لەدراو بیفرۆشنەوە، یان دەبێت بڵێین خشڵەکە بەکاڵایەکی تری وەك گەنم وجۆ بگۆڕنەوە، وئەمانەیش هەمووی بار قورسییە وشەرع قبوڵی ناکات.

ث- لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ کە داوای خێر کراوە، هەندێك جار ئافرەتان خشڵەکانیان داناوە وبەخشیویانە بە خەڵکی هەژار، جا ئەگەر ئەو هەژارانە خشڵەکانیان گۆڕیبێتەوە بە هەمان نرخی خۆی بە دینار، ئیتر چ سوود وقازانجێکیان لێکردوە، بۆیە دەبێت ئەمانە لە بازاڕدا لەنرخی خۆیان زیاتریان کردبێت.

ج - نەبیستراوە هیچ کام لەهاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ڕێگیریان کردبێت لە فرۆشتنەوەی خشڵ ئەگەر بەهەمان کێش یان ڕەگەزی خۆی نەبێت، بەڵکو ئەوەی لێیان بیستراوە ڕێگیریان کردوە لەم جۆرە حاڵەتانە لەکاتی گۆڕینەوەی دراوەکاندا.

ح- قەدەغەکردنی سووی زیادە (ربا الفضل) بۆ ڕێگەگرتن بووە لە ئەگەری خراپ بەکارهێنانی (سد الذرائع)، هەر قەدەغەکردنێکیش بەو هۆکارە بێت، ئەکرێت لەبەر بەرژەوەندی خەڵکی ڕێگەی پێبدرێت، بۆیە فرۆشتنەوەی خشڵیش بەکێشی خۆی زیاتر لەدراوی ئاڵتون یەکێکە لە پێداویستیەکانی خەڵکی بۆیە دەکرێت ڕێگەی پێبدرێت.

ئەمانە کۆی ئەو بەڵگانەن کە ئەمان بۆ پاساو هێنانەوە بۆ بۆچوونەکەیان پشتیان پێ بەستووە و وکو پێشتریش گوتمان سەرجەمی بۆچوونەکانیان بۆچوونی عەقڵین وتاکە یەك بەڵگەی دەقیان تێدا نییە.

لەبەرامبەر ئەم کەمینەیە لەزانایان وبەڵگە عەقڵییەکانیاندا، هەموو قوتابخانەکانی فیقهی ئیسلامی ومەزاهبە ئیسلامییەکان لەکۆن ونوێدا هاوڕان لەسەر ئەوەی کە ئاڵتون وزیو خشڵ بن یان دراو هیچ جیاوازییەکیان نییە، وهەموو ئەو حوکمە شەرعیانەی بەسەر دراوێکی ئاڵتوندا جێبەجێ دەکرێت، بەسەر خشڵێکیشدا جێبەجێ دەکرێت کە کانزاکەی ئاڵتون وزیو بێت بەبێ جیاوازی؛ چونکە کاتێك فەرموودەکان باس لەسووی ئاڵتون وزیو دەکەن بە ڕەهایی باسی دەکەن بەبێ دیاریکردنی هۆکاری حەرامبوونەکەیان، هەربۆیە حوکمەکەیشی هەر بەو ڕەهاییە دەمێنێتەوە، هەرچەند گۆڕانکاری بەسەر شێواز وجۆری بەکارهێنانەکەیشیدا بێت ولەدراویش بکەون، خۆ ئەگەر دەقەکان باسی هۆکاری حەرامبوونەکەیان بکردایە وبەڕوونی بیانگوتایە لەبەر ئەوەیە کە دراوە، ئەو کات ئەگەر لەدراوی بکەوتنایە حوکمەکەیان دەگۆڕا، بەڵام دەقەکان باسی ئەو هۆکارە ناکەن، وبەڕەهایی دەڵێن سوویان تێدایە، کەواتە حوکمەکەیش بەو ڕەهاییە دەمێنێتەوە. تەنانەت وەکو پێشتریش باسمان کرد قیاسکردنی دراو لەسەر ئەوان بەهۆی بوونی هۆکاری هاوبەشەوە (العلة المشتركة) نییە؛ بەڵکو لەبەر نەبوونی خاڵی جیاوازە لەنێوانیاندا (القياس بنفی الفارق).

زیاتر لە (١٧) فەرموودەی دروست لەبەردەستدایە کە پشت ڕاستی ئەم بۆچوونە دەکاتەوە، ودەیسەلمێنێت کە ئالتون وزیو هەرچی وهەرچۆن بن، دراو بن یان خشڵ یەك حوکمیان هەیە، ولەکاتی کڕین وفرۆشتن وگۆڕینەوەیاندا بەپێچەوانەی مەرجە شەرعییەکانەوە، هەردوو جۆرەکانی سوویان تێدا درووست دەبێت. وهەر بۆ نموونە لێرەدا هەندێك لەو فەرموودانە[1] دەخەینە ڕوو:

- عن فَضَالَةَ بْنَ عُبَيْدٍ الأَنْصَارِيَّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ يَقُولُ: أُتِيَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَهُوَ بِخَيْبَرَ بِقِلَادَةٍ فِيهَا خَرَزٌ وَذَهَبٌ، وَهِيَ مِنَ الْمَغَانِمِ تُبَاعُ، فَأَمَرَ رَسُولُ اللهِ بِالذَّهَبِ الَّذِي فِي الْقِلَادَةِ فَنُزِعَ وَحْدَهُ، ثُمَّ قَالَ لَهُمْ

---

١ - دیارە ئێمە پێشتر چەند فەرموودەیەکمان لەو بارەیەوە باس کردبوو، بۆیە لێرەدا دووبارەیان ناکەینەوە وتەنها ئەو فەرموودانە باس دەکەین کەپەیوەندی ڕاستەو خۆیان بەباسکەوە هەیە، وحوکمە شەرعیەکەمان بۆ یەکلا دەکەنەوە.

رَسُولُ اللهِ:{الذَّهَبُ بِالذَّهَبِ وَزْنًا بِوَزْنٍ}[١]. واتە: فوضاڵەی کوڕی عوبەیدی ئەنصاری دەگێڕێتەوە ودەڵێت: لە خەیبەر بووین ملوانکەیەکیان بۆ پێغەمبەر ﷺ هێنا، کە وەك دەسکەوتی شەڕ گیرابوو مورو وئاڵتونی تێدابوو، دەیانوویست بەئاڵتون بیفرۆشن، پێغەمبەرﷺ فەرمانی کرد ئاڵتونی ملوانکەکە لێ بکەنەوە، وپاشان پێی فەرموون: ئاڵتون‌و بە ئاڵتون دەبێت کێشیان بەرامبەر بێت.

باشە خۆ ملوانکە خشڵە ودراو نییە، ئەی بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمان دەدەات ئاڵتونی ملوانکەکە لێبکرێتەوە، وبەهەمان کێشی خۆی بەئاڵتون بفرۆشرێت؟. کەواتە ئەو بۆچوونەی پێشتر ڕاست نییە کەدەڵێت خشڵ وەکو کاڵا مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت، وحوکمی سوو نایگرێتەوە.

- عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ: أَنَّ مُعَاوِيَةَ بْنَ أَبِي سُفْيَانَ بَاعَ سِقَايَةً مِنْ ذَهَبٍ، أَوْ وَرِقٍ بِأَكْثَرَ مِنْ وَزْنِهَا، فَقَالَ أَبُو الدَّرْدَاءِ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ؟ يَنْهَى عَنْ مِثْلِ هَذَا: إِلاَّ مِثْلاً بِمِثْلٍ. فَقَالَ لَهُ مُعَاوِيَةُ: مَا أَرَى بِمِثْلِ هَذَا بَأْساً. فَقَالَ أَبُو الدَّرْدَاءِ: مَنْ يَعْذِرُنِي مِنْ مُعَاوِيَةَ، أَنَا أُخْبِرُهُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟، وَيُخْبِرُنِي عَنْ رَأْيِهِ، لاَ أُسَاكِنُكَ بِأَرْضٍ أَنْتَ بِهَا، ثُمَّ قَدِمَ أَبُو الدَّرْدَاءِ عَلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، فَكَتَبَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ إِلَى مُعَاوِيَةَ: أَنْ لاَ تَبِيعَ ذَلِكَ إِلاَّ مِثْلاً بِمِثْلٍ، وَزْناً بِوَزْنٍ[٢]. واتە: عەطائی کوڕی یەسار دەڵێت: معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان دەفرێکی ئاڵتون یان زیوی فرۆشت بەکێشەکەی خۆی زیاتر، ئەبو دەرداء لەوێ بوو گوتی: من گوێم لە پێغەمبەری خودا بووە ﷺ ڕێگری لەم جۆرە مامەڵەیە کردوە، هەتا کێشەکانیان هاوتا نەبێت. معاویە گوتی: من شتێکی خراپی تێدا نابینم، ئەبو دەرداء گوتی: کێ ئاگای لێیە معاویە چی دەڵی و بۆ وادەکات، من فەرموودەی پێغەمبەری ﷺ بۆ باس دەکەم، وئەو باسی بۆچونی خۆیم بۆ دەکات، سوێند بەخودا لە زەویەکدا دانانیشم کە تۆی تیابیت. پاشان ئەبو دەرداء هات بۆ لای پێشەوا

١ - مسلم، صحيح مسلم، ج٣، ص١٢١٣، رقم الحديث (١٥٩١)، مصدر سابق. لەهەندێك ڕیوایەتی فەرموودەکەدا هاتووە کە کەسێك کڕیویەتی بەحەوت یان نۆ دینار، پێغەمبەری خودا ﷺ مامەڵەکەی هەڵوەشاندۆتەوە وفەرموویەتی: نابێت بفرۆشرێت تا جیانەکرێتەوە. بڕوانە: البغوي (الحسين بن مسعود)، شرح السنة، ج٨، ط٢، المكتب الإسلامي، دمشق، ص٦٦، تحقيق: شعيب الأرنؤوط، محمد زهير الشاويش.

٢ - البيهقي، السنن الكبرى، ج٥، ص٢٨٠، رقم الحديث (١٠٨٠٠)، مصدر سابق.

عومەر وکێشەکەی بۆ گێڕایەوە، پێشەوا عومەر نووسراوێکی بۆ معاویە نووسی: کە بەوشێوەیە نەیفرۆشیت هەتا وەکو یەك نەبن ویەك کێشیان نەبێت[١].

ئەمە بەڵگەیەکی ڕوونی ترە لەسەر لاوازیی بۆچوونی یەکەم، چونکە کەس لاریی لەوە نییە کەدەفر تەنها کاڵایە، تەنانەت خشڵیش نیە، کەچی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ هەمان فەرموودەی پێغەمبەریان ﷺ بەسەردا جێبەجێ کردوە کە باس لەفرۆشتنی ئاڵتون بە ئاڵتون دەکات، وڕێگەیان نەداوە بەکەم وزیاد لەکێشی خۆی بفرۆشرێت، بەبێ ئەوەی کەسێك بیانووی ئەوە بهێنێتەوە کە ئەو فەرموودەیە تەنها باسی دراو دەکات وباسی خشڵ وکاڵا ناکات.

ئیبن عبد البر لەبارەی ئەم ڕووداوەی معاویەوە دەڵێت: (السنة المجتمع عليها..خلاف ما كان يذهب إليه معاوية)[٢]. واتە: ئەو سوننەتەی کە هەموو زانایان کۆدەنگن لەسەری بە پێچەوانەی بۆچوونەکەی معاویەوەیە.

- عَنْ مُجَاهِدٍ أَنَّهُ قَالَ: كُنْتُ أَطُوفُ مَعَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، فَجَاءَهُ صَائِغٌ فَقَالَ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ إِنِّى أَصُوغُ الذَّهَبَ، ثُمَّ أَبِيعُ الشَّىْءَ مِنْ ذَلِكَ بِأَكْثَرَ مِنْ وَزْنِهِ، فَأَسْتَفْضِلُ فِى ذَلِكَ قَدْرَ عَمَلِ يَدِى فِيهِ، فَنَهَاهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ عَنْ ذَلِكَ، فَجَعَلَ الصَّائِغُ يُرَدِّدُ عَلَيْهِ الْمَسْأَلَةَ، وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ يَنْهَاهُ حَتَّى انْتَهَى إِلَى بَابِ الْمَسْجِدِ، أَوْ إِلَى دَابَّتِهِ يُرِيدُ أَنْ يَرْكَبَهَا، ثُمَّ قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ: الدِّينَارُ بِالدِّينَارِ، وَالدِّرْهَمُ بِالدِّرْهَمِ، لاَ فَضْلَ بَيْنَهُمَا، هَذَا عَهْدُ نَبِيِّنَا ﷺ إِلَيْنَا، وَعَهْدُنَا إِلَيْكُمْ[٣]. واتە: موجاهید دەڵێت: لە خزمەتی عەبدوڵلای کوڕی حەزرەتی عومەردا دەسوڕاینەوە، زەڕەنگەرێك هات بۆلای وپێی گوت: ئەی باوکی عەبدوڕەحمان من زەڕەنگەرم خشڵ دروست دەکەم، ودواتر بەکێشی خۆی زیاتر دەیفرۆشمەوە، وزیادەی حەقدەستەکەی خۆمی دەخەمە سەر، عەبدوڵلای کوڕی عومەر پێی گوت شتی وا مەکە، کابرا هەر بەدوایەوە بوو وچەند جارێك

---

١ - کەواتە ئەو بۆچوونەی سەرەتا باسمان کرد کە معاویە پێی وابووە سوو لە خشڵدا دروست نابێت، ئەوە بەر لەم ڕوداوە بووە و فەرموودەکەی پێنەگەیشتووە، بەڵام پاش ئەوەی ئەبو دەرداء پێی دەڵێت وبۆی ڕوون دەکاتەوە، وپێشەواو عومەریش جەختی لەسەر دەکات وپشتیوانی بۆچوونەکەی ئەبو دەرداء دەکات لەبۆچوونەکەی پاشگەز دەبێتەوە.

٢ - إبن عبد البر، الإستذكار، ج٦، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤٢١،٢٠٠٠، ص٣٤٨، تحقيق : سالم محمد عطا ، محمد علي معوض.

٣ - البيهقي، السنن الكبرى، ج٥، ص٢٧٩، رقم الحديث (١٠٧٩٧)، مصدر سابق.

پرسیارەکەی لێ دووبارە کردەوە، وعەبدوڵلای کوڕی عومەریش هەر دەیگوت نابێت ومەیکە، تا گەیشتینە بەر دەرگای مزگەوت، یان لای ووڵاخەکەی کەدەیووسیت سواری بێت، پاشان بەزەرەنگەرەکەی گوت: دینار بەدینار، درهەم بەدرهەم، نابێت هیچ زیاد وکەمی هەبێت، ئەمە پەیامی پێغەمبەری خودایە ﷺ بۆ ئێمە، وپەیامی ئێمەیشە بۆ ئێوە.

بزانن بەڕێزان ئەم ڕووداوە دەڵێی لەمڕۆدا ڕوویداوە، ئەوەتا کابرا زەڕەنگەرە وباسی دروستکردنی خشڵ وحەق دەست دەکات، کەچی عەبدوڵلای کوڕی عومەر ڕێگەی پێنادات لەگەڵ کێشی دینارەکە بە زیاد وکەم بیفرۆشێت. وبەڵگەیش لەمانە زیاتر پێم وانییە پێویست بێت بۆ کەسێك بەشوێن ڕاستیدا بگەڕێت وبیەوێت تووشی حەرام نەبێت.

هەربۆیە و پشت ئەستور بەو دەقانە هەندێك لەزانایان کۆدەنگی زانایانیان لەم بارەیەوە باس کردوە، وەك ئەوەی کە گوێیان بەڕاجیایی ئەو کەمینەیە هەر نەدابێت، ولێرەدا بەنموونە هەندێك لەقسەکانیان لەو بارەیەوە دەخەینە ڕوو:

- پێشەوا نەوەوی لە ڕاڤەی ئەو فەرموودەیەدا کەباس لەسووی ئالتون وزیو دەکات دەڵێت: (قال العلماء هذا يتناول جميع أنواع الذهب والورق من جيد ورديء، وصحيح ومكسور، وحلي وتبر، وغير ذلك، وسواء الخالص والمخلوط بغيره، وهذا كله مجمع عليه)[١]. واتە: زانایان گوتویانە ئەم فەرموودەیە هەموو جۆرەکانی ئاڵتونو زیو دەگرێتەوە، لەباش وخراپ، ساغ وشکاو، خۆڵ وخشڵ، یان هەر شتێکی تر، پاڵفتە بن یان تێکەڵ بن بەکانزای تر، هەموو ئەمانەیش کۆدەنگی زانایانی لەسەرە.

- ئیبن عبد البر لەو بارەیەوە دەڵێت: (والسنة المجتمع عليها أنه لا يباع شيء من الذهب عيناً كان أو تبراً، أو مصوغاً أو نقداً، أو جيداً أو رديئاً، بشيء من الذهب إلا مثلاً بمثل، يداً بيد، وكذلك الفضة...من زاد أو نقص في شيء من ذلك كله، أو أدخله نظرة فقد أكل الربا)[٢]. واتە: ئەو سوننەتەی زانایان کۆدەنگ وهاوڕان لەسەری ئەوەیە، هیچ ئاڵتونێك نافرۆشرێت بە ئاڵتونێکی تر، خۆڵ بێت یان قاڵب، خشڵ بێت یان دراو، باش بێت یان خراپ، ئەگەر یەك

---

١ - النووي، شرح النووي على صحيح مسلم، ج١١ص١٠، مصدر سابق.

٢ - إبن عبد البر، الكافي في فقه أهل المدينة، ج٢ص٦٣٤، مصدر سابق.

کێشیان نەبێت، ودەست بەدەست نەبێت. هەروەها زیویش...هەر کەسێك لەهەر یەکێك لەوانەدا زیاد یان کەم وەربگرێت یان مامەڵەکەی قەرزی تێبکەوێت ئەوە سووی خواردوە.

- تەنانەت ئیبن تەیمییە خۆیشی لەو بارەیەوە کۆدەنگی زانایان باس دەکات، ولەوەڵامی پرسیارێکدا دەڵێت: (امرأة باعت أسورة ذهب بثمن معين، إلى أجل معين، هل يجوز أم لا؟ فأجاب: إذا بيعت بذهب أو فضة إلى أجل لم يجز ذلك باتفاق الأئمة)[١]. واتە: ئافرەتێك چەند بازنێکی ئاڵتونی فرۆشتوە بەنرخێکی دیاریکراو وبەقەرز، دروستە یان نا؟. لەوەڵامدا دەڵێت: ئەگەر فرۆشتبێتی بە ئاڵتون یان زیو بەقەرز بەکۆی دەنگی زانایان حەرامە ودروست نییە.

- قاضی عیاض دەڵێت: (الحديث عام في جميع أجناسها من مشكول، ومصنوع، وتبر، وجيد، ورديء، ولا خلاف في هذا)[٢] واتە: فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ گشتگیرە وهەموو شێوەکانی دەگرێتەوە، لەنەخش، وخشڵ، وخۆڵی ئاڵتون، وباش، وخراپی، وزانایان هیچ جیاوازییان نییە لەو بارەیەوە.

- ئیبن هوبەیرە دەڵێت: (أجمع المسلمون على أنه لا يجوز بيع الذهب بالذهب منفرداً، أو الورق بالورق تبرها، ومضروبها، وحليها إلا مثلاً بمثل، وزناً بوزن، يداً بيد)[٣]. واتە: موسوڵمانان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی دروست نییە خۆڵ ودراو وخشڵی ئاڵتون بەئاڵتون بفرۆشرێت، وزیو بەزیو بفرۆشرێت، مەگەر وەکو یەك بن، ویەك کێشیان هەبێت، ویەکسەریش ڕادەست بکرێن.

- پێشەوا شافیعییش لەو بارەیەوە دەڵێت: (وَلَا خَيْرَ فِي أَنْ يُصَارِفَ الرَّجُلُ الصَّائِغَ الْفِضَّةَ بِالْحُلِيِّ الْفِضَّةَ الْمَعْمُولَةَ، وَيُعْطِيهِ إجَارَتَهُ؛ لِأَنَّ هَذَا الْوَرِقَ بِالْوَرِقِ مُتَفَاضِلًا)[٤]. واتە: باش نییە کەسێك دراوی زیو لەگەڵ زەڕەنگەرێك بگۆڕێتەوە بە خشڵی زیو، وپاشان حەقدەستیشی بداتێ؛چونکە ئەوە گۆڕینەوەی زیوە بەزیو بەزیاتر.

---

١ - إبن تيمية، مجموع الفتاوى، ج٢٩،ص٤٢٥، مصدر سابق.

٢ - القاضي عياض، إكمال المعلم شرح صحيح مسلم، ج٥،ص١٣٨، الكتاب بدون ت ط.

٣ - إبن هبيرة (يحيى بن هبيرة)، اختلاف الأئمة العلماء، ج١، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤٢٣، ٢٠٠٢، ص٣٥٨، تحقيق: السيد يوسف.

٤ - الشافعي، الأم، ج٣، ص٣٥، مصدر سابق.

- شێخ عوسەیمینیش لە زانایانی هاوچەرخ دەربارەی ئەو بابەتە دەڵێت: (تبديل ذهب بذهب مع إضافة أجرة التصنيع إلى أحدهما أمر محرم لا يجوز، وهو داخل في الربا الذي نهى النبي ﷺ عنه.. أما إذا كان التاجر صائغاً فله أن يقول خذ هذا الذهب اصنعه لي – على ما يريد من الصنعة– أعطيك أجرته إذا انتهت الصناعة، وهذا لا بأس به)[1]. واتە: گۆڕینەوەی ئاڵتون بە ئاڵتون لەگەڵ زیادەی حەقدەستی یەکێکیان، کارێکی قەدەغە ونادروستە، ودەچێتە خانەی ئەو سووەی کەپێغەمبەری خودا ﷺ نەهی لێکردوە...بەڵام ئەگەر بازرگانەکە زەڕەنگەر بوو دەتوانێت بڵێت: ئەو ئاڵتونەم بۆ دروست بکە - بیکات بەوەی خۆی دەیەوێت- وهەر کات تەواوت کرد کرێکەیت دەدەمێ، ئەم مامەڵەیە هیچ کێشەی نییە.

هەر بۆیە بەڕێزان: پاڵپشت بەو بەڵگانەی کە باسمان کرد ئاڵتون وزیو هەرچی وهەر چۆن بن، هیچ جاوازییان نییە، وهەر سوویان تێدا دروست دەبێت، ولەکاتی گۆڕینەوەیشیان بەهەر دراوێك وەکو دوو جۆری جیاواز کە یەك ڕەگەزیان هەبێت تەماشا دەکرێن؛ بۆیە دروستە کەم وزیادیان پێ بکرێت بەڵام دەبێت هەردوو کاڵاکە ئامادەبن ودەست بەجێ ڕادەستی لایەنەکانی گرێبەستکە بکرێن، وبەهیچ شێوەیەکیش دروست نییە بەبیانووی شوێنکەوتنی قسەی کەس خەڵکی خۆی لەحوکمە شەرعییەکان بدزێتەوە.

---

١ - ئەمەیش دەقی فەتوایەکی کەیەتی لەو بارەیەوە: (ما الحكم في أن كثيرا من أصحاب محلات الذهب يتعاملون بشراء الذهب المستعمل (الكسر) ثم يذهبون به إلى تاجر الذهب ويستبدلونه بذهب جديد مصنع وزن مقابل وزن تماما، يأخذون عليه أجرة التصنيع للذهب الجديد؟ الجواب: ...ومن هذه الأحاديث نأخذ أن ما ذكره السائل من تبديل ذهب بذهب مع إضافة أجرة التصنيع إلى أحدهما أنه أمر محرم لا يجوز، وهو داخل في الربا الذي نهى النبي صلى الله عليه وسلم عنه ، والطريق السليم في هذا أن يباع الذهب الكسر بثمن من غير مواطأة ولا اتفاق، وبعد أن يقبض صاحبه الثمن فإنه يشتري الشيء الجديد... هذا إذا التاجر تاجر بيع، أما إذا كان التاجر صائغا فله أن يقول خذ هذا الذهب اصنعه لي على ما يريد من الصنعة أعطيك أجرته إذا انتهت الصناعة، وهذا لا بأس به). محمد بن صالح العثيمين، مجموعة أسئلة في بيع وشراء الذهب، موقع:
http://madrasato-mohammed.com/outaymin/pg_٠٦١_٠٠٠١.htm

دووەم: سووی دواکەوتنی یەکێك لەکاڵاکان:

ئەمە گومانێکی ترە و خەڵکانێك دەیوروژێنن کە گوایە سوو تەنها یەك جۆری هەیە، ئەویش سووی دواکەوتنی یەکێك لە کاڵاکانە (ربا النسيئة) و لەو بارەیەوە فەرمودەیەك وەك بەڵگە دەهێننەوە کە عەبدوڵای کوڕی عەبباس لەپێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: {إِنَّمَا الرِّبَا فِي النَّسِيئَةِ}[١]. واتا: سووی کڕین وفرۆشتن تەنها لەدواکەوتنی یەکێك لەبەرامبەرەکاندا دروست دەبێت. ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێت، کەسووی زیادە بوونی نیە، وبەم پێیەیش بێت گۆڕینەوەی ئاڵتون بە ئاڵتون، یان زیو بەزیو، یان گەنم بەگەنم بەزیاد وکەم دروستە، بەمەرجێك هەردوکیان ئامادە بن.

زانایان دەربارەی ڕاڤەکردنی ئەو فەرموودەیە، وچۆنێتی کارپێکردن وگونجاندنی لەگەڵ فەرموودەکانی تردا چەند بۆچونێکیان هەیە لەوانە:

١- زۆرێك لە زانایان دەڵێن عەبدوڵای کوڕی عەبباس بەر لە مردنی لەو بۆچوونەی پاشگەز بۆتەوە، وئەبو سەعیدی خدری دەڵێت جارێکیان چووم پێم گوت کە تۆ شتێکی وات گوتوە، ئەویش لەوەڵامدا گوتی: (جَزَاكَ اللَّهُ يَا أَبَا سَعِيدٍ عَنِّي الْجَنَّةَ فَإِنَّكَ ذَكَّرْتَنِي أَمْرًا كُنْتُ نَسِيتُهُ أَسْتَغْفِرُ اللَّهَ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ وَكَانَ يَنْهَى عَنْهُ بَعْدَ ذَلِكَ أَشَدَّ النَّهْيِ)[٢]. واتە: خوای گەورە بەبەهەشت پاداشتت بداتەوە ئەی باوکی سەعید، بەڕاستی شتێکت یادخستمەوە کەمن بیرم چوبۆوە، داوای لێخۆشبوون لەخوای گەورە دەکەم وپەشیمانم. پاش ئەوە عەبدوڵای کوڕی عەبباس زۆر بەتوندی دژایەتی سووی زیادەی دەکرد.

٢- ئەو حوکمە لەسەرەتای ئیسلامدا وابووە، وتەنها سووی دواکەوتنی یەکێك لە کاڵاکان بوونی هەبووە، بەڵام دواتر ئەم حوکمە هەڵوەشاوەتەوە، وهەر دوو جۆر سووەکە قەدەغە کراوە، بەرائی کوڕی عازب لەو بارەیەوە دەڵێت: (قدم النبي ﷺ المدينة وتجارتنا هكذا،

---

١ - مسلم، صحيح مسلم، ج٥،ص٥٠، مصدر سابق، رقم الحديث (٤١٧٥).

٢ - البيهقي، السنن الكبرى، ج٥،ص٢٨٦، رقم الحديث (١٠٨٢٦)، مصدر سابق. وقال البيهقي في التعقيب عليه: هَذَا الْحَدِيثُ مِنْ حَدِيثِ أَبِي مِجْلَزٍ تَفَرَّدَ بِهِ حَيَّانُ قُلْتُ وَحَيَّانُ تَكَلَّمُوا فِيهِ. ورواه الحاكم في المستدرك وقال: هذا حديث صحيح الإسناد و لم يخرجاه بهذه السياقة، وقال الذهبي في التعليق عليه: حبان بن عبيدالله العدوي فيه ضعف وليس بالحجة. أنظر: الحاكم (محمد بن عبدالله أبو عبدالله الحاكم)، المستدرك على الصحيحين، مع تعليقات الذهبي في التلخيص، ج٢، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤١١،١٩٩٠، ص٤٩، تحقيق: مصطفى عبد القادر عطا.

أي: كنا نعطي الدرهم بالدرهمين، والدينار بالدينارين، أي: كنا نتعامل بالفضل، فلما قدم عليهم وتجارتهم هكذا وأقرهم عليها قال: ثم جاءتنا أحاديث التحريم ففهمنا أن الأمر قد نسخ). واتە: کاتێك پێغەمبەر ﷺ تەشریفی هاتە مەدینە ئێمە بەم شێوەیە بازرگانیمان دەکرد، درهەمێکمان دەدا بە دوو درهەم، وە دینارێکیشمان دەدا بە دوو دینار، وسووی زیادەمان بەکار دەهێنا، کە پێغەمبەر ﷺ هات وبینی بازرگانییەکەمان بەو شێوەیەیە بێدەنگ بوو. گوتی: پاشتر پێغەمبەری خودا ﷺ پێی فەرمووین حەرامە، وتێگەیشتین کە حوکمی حەڵاڵبوونەکەی هەڵوەشاوەتەوە.

٣- ئەو فەرموودانەی پێغەمبەر ﷺ کە باس لەحەرامی سووی زیادە دەکەن تایبەتن (خاص)، وئەوانەیش کە باس لە نەبوونی ئەو جۆرە سووە دەکەن گشتین (عام)، ولەحوکمیشدا هەمیشە حوکمی تایبەت لەپێش گشتییەوە کاری پێدەکرێت؛ چونکە حوکمی تایبەت براوەیە (قطعی) یە، وحوکمی گشتی گوماناوییە (ظنی) یە، وبڕاوەیش لە گوماناوی بەهێز ترە.

٤- ئەو فەرموودانەی کە باس لە حەرامی سووی زیادە دەکەن (منطوق) ن، واتە دەقەکە ڕاشکاوانە باسی حەرامی سووی زیادە دەکات وەکو :{الذَّهَبُ بِالذَّهَبِ وَزْنًا بِوَزْنٍ}. بەڵام ئەوانەی کە باسی ناکەن (مفهوم) ن، واتا ڕاشکاوانە باس لەوە ناکەن کە سووی زیادە بوونی نییە، بەڵام دەڵێن: سوو تەنها ئەوەیە کەیەکێك لەبەرامبەرەکان ئامادە نەبێت، کەواتە ئێمە خۆمان لەم دەقە ئەوە دەخوێنینەوە کە سووی زیادە بوونی نییە. لەم جۆرە حاڵەتانەیشدا تا حوکمی (منطوق) وەستابێت کار بە (مفهوم) ناکرێت؛ چونکە حوکمی (منطوق) لە (مفهوم) بەهێزترە.

٥- ئەو فەرموودانەی کەباس لەحەرامی سووی زیادە دەکەن، گەورە پیاوانی هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ گێڕاویانەتەوە وەکو پێشەوا عومەری کوڕی خەطاب، وعوبادەی کوڕی صامت، وئەبو موسای ئەشعەری، بەڵام ئەوانەی کە باسی نەبوونی دەکەن هاوەڵە منداڵەکان گێڕاویانەتەوە،، وەکو ئوسامەی کوڕی زەید وعەبدوڵڵای کوڕی عەبباس، وعەبدوڵڵای کوڕی مەسعود، بنەمایەکیشمان هەیە دەڵێت: (إذا تعارضت رواية الأكابر مع رواية الأصاغر، قدمت أحاديث الأكابر على أحاديث الأصاغر). واتە: ئەگەر نەگونجان لەنێوان گێڕانەوەی گەورە

پیاوان، ومنداڵاندا هەبوو، هەمیشە گێرانەوەی گەورەپیاوان پێش هی منداڵان دەخرێت؛ چونکە لەوانەیە منداڵەکان وەکو پێویست ئاگاداری وردەکاری حوکمە شەرعییەکان نەبووبن، یان هەندێك شت ڕوویدابێت پێش بەئاگا بوون وپێگەیشتنی ئەوان، یان وەکو پێویست بۆیان لەبەر نەکرابێت.

٦- ئەو فەرموودانەی کە باس لەحەرامی سووی زیادە دەکات، ڕاستەوخۆ لەپێغەمبەرەوە ﷺ بیستراون؛ بەڵام ئەو فەرموودانەی تر کەسووی زیادە ڕەت دەکاتەوەە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خۆی نەیبیستوە بەڵکو لە خەڵکی تری بیستووە وگێڕاویەتییەوە، بەدڵنیاییشەوە فەرموودەیەك ڕاستەوخۆ لە پێغەمبەری خودا ﷺ بیسترابێت، هێز ومتمانەی زیاترە لە فەرموودەیەك کە بە ناڕاستەوخۆ ولەڕێی خەڵکی ترەوە گێڕابێتەوە وبیسترابێت. ئەبو سەعیدی خدری ڕۆژێك عەبدوللای کوڕی عەبباسی بینی پێی گوت، ئەمەی دەیڵێیت سوو تەنها لە دواکەوتنی یەکێك لەکاڵاکاندا دروست دەبێت، شتێکە لەپێغەمبەری خودات ﷺ بیستووە؟ یان لە قورئاندا بینیوتە؟، گوتی: هیچ کامیان، چونکە سەبارەت بەپێغەمبەر ﷺ ئێوە لە من باشتر دەیناسن، وئاشنا وشارەزای سوننەتەکانین، ولە لەقورئانیشدا نەمبینیوە، بەڵام ئوسامەی کوڕی زەید پێی گوتم: پێغەمبەری خودا ﷺ وای فەرمووە[(١)].

٧- لەوانەیە ئەو کەسەی پرسیارەکەی کردوە تەنها باسی سووی زیادەی کردوە، وگوێی بەسووی دواکەوتنی یەکێك لەکاڵاکان نەداوە، بۆیە پێغەمبەری خودا ﷺ ویستویەتی بە ئاگای بێنێتەوە، وپێی بڵێت: کەئەم جۆرە سوویەش هەیە، کەواتە بۆیە فەرموودەکە تەنها باسی ئەو سووەی کردوە کە کەسەکە لێی بێ ئاگایە.

٨- یان پرسیارەکە دەربارەی مامەڵەیەك بووە کەتەنها سووی دواکەوتنی یەکێك لەکاڵاکانی تێدا دروست بووە نەك سووی زیادە، وەك پرسیار دەربارەی فرۆشتنی گەنم بەجۆ کە ئەم جۆرە مامەڵەیە لەبنەڕەتدا سووی زیادەی تێدا دروست نابێت تا باس بکرێت، بۆیە پێغەمبەری خودا ﷺ تەنها ئەو جۆرە سووەی باس کردوە کەئەگەری دروست بوونی هەیە لەمامەڵەکەدا نەك هەموو جۆرەکانی سوو. ئەمەیش ئەوە ناگەیەنێت کەسووی تر بوونی نیە.

---

١ - مسلم، صحیح مسلم، ج٥،ص٥٠، مصدر سابق، رقم الحدیث (٤١٧٥).

٩- یان مەبەست لە فەرمووددەکە گەورەکردن وقورس کردنی بابەتەکەیە بۆ ئەوەی خەڵکی زۆر لێی بەئاگا بن وگرنگی تەواوی پێبدەن تا تووشی نەبن، وهاوشێوەی ئەم فەرموودانەیشمان زۆرن، بۆنموونە کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ باسی حەج دەکات دەفەرموێت: {الحج عرفة}[1]. واتە: حەج بریتییە لەوەستانی ڕۆژی عەرەفە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کەحەج تەنها عەرەفە بێت وهیچ بنەما ومەرجی تری نەبێت، بەڵکو مانای ئەوەیە کە وەستانی عەرەفە گرنگترینی بنەماکانی حەجە تا خەڵکی لێی بە ئاگا بن ئەم فەرموودەیەیش بەهەمان شێوەیە.

لەکۆتاییدا ماوە ئەوە بڵێین: ئەوەی ئێمە لەم زنجیرە بەرنامە وپەرتوکەدا تۆمارمان کردوە، بەدڵنیاییەوە وەڵامی هەموو پرسیارە ئاڵۆزەکانی بازارەکانی ئەمڕۆ و ئێوەی بینەر، وبیسەر، وخوێنەری بەڕێز ناداتەوە، بەڵکو ئەمە تەنها سەرەتا ودەستپێکێکە بۆ ڕاکێشانی سەرنجی هەموو لایەك بۆ بەئاگابوون لەم بابەتە هەستیارە کە بەجۆرێك لەجۆرەکان پەیوەندی بەژیانی هەموو لایەکمانەوە هەیە، تا خەڵکی تووشی حەرامخۆری وکاری بەد نەبن، ودین ودونیایان سەلامەت وپارێزراو بێت.

---

١ – البیهقي، السنن الکبری، ج٥، ص١٧٣، مصدر سابق، رقم الحدیث (٩٥٩٣). وقال الألباني في تخریجه: صحیح. أنظر: الألباني، إرواء الغلیل، ج٤،ص٢٨٣.

## بەشی سیازدە
## پرسیار و وەڵام

ئەم بەشە وەك پاشکۆیەك تایبەت دەکەین بەو گفتوگۆ وپرسیار و وەڵامانەی کە لەکۆی زنجیرە باسەکاندا قسەی لەسەر کراوە، وبەخاتری ئەوەی تووشی دووبارە بوونەوە نەبین، هەوڵ دەدەین لێرەدا تەنها ئەو پرسیارانە تۆمار بکەین، کە لەناوەڕۆکی پەرتوکەکەدا باسیان لێوە نەکراوە وئەوانەی باسیان لێوە کراوە دووبارەیان ناکەینەوە وهەموو پرسیارەکانیش بەهەمان ڕیزبەندی زنجیرە باسەکە وبەدوای یەکدا تۆمار دەکەین وبەم شێوەیەی لای خوارەوە.

پ١/ ئەو دراوانەی لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ بەکاریان هێناوە چی بووە؟ وئایا هی خۆیان بووە؟، یان هی شارستانییەتەکانی تریان بەکار هێناوە؟.

و/ دراوی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ دیناری ئاڵتون، و درهەمی زیو، وفلسی مس بووە، ولەسەردەمی ئەودا بەرهەم نەهێنراون بەڵکو هی شارستانییەتەکانی پێشتر بووە، تەنانەت ئەو وشانە لە بنەڕەتدا ئیغریقین وعەرەبی نین، بۆ نموونە وشەی دینار لە (دیناریوس) وە وەرگیراوە کە بە واتەی دیناری ئاڵتونی بەکارهێنراوە، وشەی درهەمیش لە (دراخمة) وە وەرگیراوە، و وشەی فلسیش لە (فولیس) ە وە وەرگیراوە، کە بەو کیسەیە گوتراوە پارەی تێدا هەڵگیراوە، جگە لەوانیش درهەمی ساسانی کسرەویش بەکار هاتووە وهەندێك جاریش کڕین و فرۆشتن بە دراو نەبووە، بەڵکو بەگۆڕینەوە بووە وگەنم بەجۆ یان بەخورما فرۆشراوە.

پ٢/ ئەو مسقاڵەی ئێستا مەشهورە هەمان دینارە یان جیاوزی هەیە؟.

و/ نەخێر چونکە لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ وەکو گوتمان دیناری ئاڵتون هەبووە نەك مسقال، وهەر دینارێکی ئەو سەردەمە کێشی (٤.٢٥) غرام ئاڵتونی ئەمڕۆی هەبووە، کەواتە کێشی (٢٠) دیناری ئەو سەردەمە کە نیسابی زەکات بووە، دەکاتە (٨٥) غرام ئاڵتونی

ساغی عەیارە (٢٤)ی ئەمڕۆ، دابەشی سەر پێنجی بکەین، چونکە هەر مسقاڵێك پێنج غرامە دەکاتە (١٧) مسقاڵ.

سەبارەت بە درهەمی زیویش کێشی هەر درهەمێك زیو (٢.٩٧ ) غرام بووە، کەواتە کێشی (٢٠٠) درهەمی ئەو سەردەمە کە نیصابی زەکات بووە دەکاتە (٥٩٤) غرام زیوی ئەمڕۆ، دابەشی پێنجی بکەین دەکاتە (١١٨.٨) مسقاڵ زیو.

پ٣/ ئایا نیصابی زەکات بە ئاڵتون ئەژمار دەکرێت یان بەزیو؟ چونکە جاری وا هەیە لەنێوان دوو شاردا جیاوازی هەیە، شاری یەکەم بە ئاڵتون ئەژماری دەکات، وشاری دووەم بەزیو.

و/ بۆچوونی سەرجەم کۆمکارە فیقهی ولیژنەکانی فەتوا وزانایانی هاوچەرخ لەسەر ئەوەیە کە نیصابی زەکات بە ئاڵتون ئەژمار دەکرێت نەك زیو، ونیصابەکەیشی (٨٥) غرام ئاڵتونی ساغی عەیارە (٢٤) وکو گوتمان، واتا هەر کەس پارەی (٨٥) غرام ئاڵتونی ساغی هەبوو، وساڵی بەسەردا تێپەڕیبوو زەکاتی لەسەر واجب دەبێت.

پ٤/ کڕینی ئاڵتون بە قەرز کێشەی هەیە لەبارەی سووەوە؟.

و/ بەڵێ کڕینی ئاڵتون بە قەرز کێشە دروست دەکات، وجۆرێك لەسوو دروست دەکات کەپێی دەگوترێت، سووی دواکەوتنی یەکێك لە بەرامبەرەکان (ربا النسيئة).

پ٥/ کڕینی شت وەك بە قیست وبەنرخی زیاتر دروستە؟.

و/ ئەگەر جۆری شتومەکەکان لەو بابەتانە بوون کەسوویان تێدا دروست دەبێت، وەکو ئاڵتون بە زیو، یان بەپارە، یان پارە بەپارە، یان جۆ بە گەنم یان بە برنج، ئەوە فرۆشتنی بەقیست دروست نیە؛ چونکە لەم کاتانەدا پێویستە هەردوو کاڵاکە لە کاتی گرێبەستەکەدا ئامادە بن، ئەگەر یەکێکیان بکەوێتە قەرزەوە یان دوابکەوێت دەبێتە سوو.

بەڵام ئەگەر شتومەکەکان لەو بابەتانە نەبوون کەسوویان تێدا دروست دەبێت، وەکو: خانوو، وئۆتۆمبێل، وکەلوپەلی ناوماڵ، وجلوبەرگ، وکەرەسەی بیناسازی، ئەمانە دەکرێت

بەقیست وقەرز مامەڵەیان پێوە بکرێت، وهیچ کێشەی نییە، با نرخەکەیشی گرانتر بێت، بەڵام نابێت گرێبەستەکە مەرجی ئەوەی تێدا بێت، کە ئەگەر دانەوەی قیستەکان لەکاتی خۆی دواکەوت ئەوە پارەی زیاتری بچێتە سەر، چونکە دانانی ئەو جۆرە مەرجە لەهەر مامەڵەیەکدا بێت دەیکات بەسوو.

پ٦/ تەسویقی شەبەکی چۆنە، وحوکمی چییە؟.

و/ تەسویقی شەبەکی بریتییە لەوەی کۆمپانیایەك هەڵدەسێت بە فرۆشتن یان بەکرێدانی کاڵایەك، کە نرخی ئەو کاڵایە لەهاوشێوەکانی خۆی گرانترە، وهەر کەس کاڵاکە بکرێت، یان بەکرێی بگرێت، دەتوانێت دواتر بانگهێشتی خەڵکی بکات بۆ بەشداری کردن لە کرینی کاڵاکە، وهەر کات کەسەکە توانی چەند کەسێك قەناعەت پێ بکات بەبەشداری کردن، ئەو کات کۆمپانیا برێك پارە دەداتە ئەو کەسەی کە قەناعەتی بەوان کردوە بەشداری بکەن لەکرینی کاڵاکە، وتا زیاتر خەڵکی لەرێی ئەم کەسەوە بەشداری بکەن داهاتی ئەم زیاتر دەبێت.

هەموو دامەزراوە فیقهییەکانی جیهانی ئیسلامی بە کۆمکاری فیقهی ئیسلامی، ولیژنەی هەمیشەیی توێژینەوەی زانستی وفەتوای سعودی، ولیژنەی فەتوای ئەزهەر، ووەزارەتی ئەوقافی کویتی، ولیژنەی باڵای فەتوای هەرێم هاوران لەسەر ئەوەی بەشداریکردن لەگەڵ ئەم جۆرە کۆمپانیایانە هەر ناو وکاڵایەکیان هەبێت حەرامە ودروست نییە، هۆکاری حەرامبوونەکەیشی یەك شت نییە بەڵکو لەچەند ڕوویەکەوەیە لەوانە: بوونی قومار، سوو بەهەردوو جۆرەکەیەوە، درۆ کردن وچاوبەست کردن، نادیاری چارەنووسی بازرگانییەکە، بەفیرۆدانی سامانی تایبەتی وگشتی وڵات، ئەمانە وچەندین هۆکاری تر، کەهەر یەکێکیان بەسە بۆ حەرامکردنی کارەکە، نەك هەموویان پێکەوە.

بۆیە داواکارم لە لاوان و گەنجان خۆیان بەم جۆرە کارانەوە سەرقاڵ نەکەن، چونکە جگە لەحەرامخۆری، وتەمەڵی، وبێکاری، شتێکی تری لێ ناپێچنەوە.

پ٧/ ئایا فرۆشتنەوەی ئەو چەکانەی ئەمڕۆ حکومەت دەیداتە جوتیاران، یان وەبەرهێنەرەکان، کە هەبوویان نییە لەبانك، بەنرخێکی کەمتر دروستە؟.

و/ چەك یان کۆمپیالە هی هەر کەس ولایەنێك بێت هەمان حوکمی دراوی هەیە، وهەموو ئەو مەرجانەی پێویستە لەگۆڕینەوەی دوو دراودا هەبێت، دەبێت لەگۆڕینەوەی ئەو چەکانەیشدا هەبێت، لەوانە:

- دەبێت چەکەکە هەبوو (رصید) ی تەواوی هەبێت وبکرێت یەکسەر پارەکەی وەربگیرێت، ئەگەر نا ئەوە سووی دواکەوتنی یەکێك لەدراوەکان دروست دەکات.

- دەبێت لەحاڵەتی زیاد وکەم کردندا بەدراوێکی تر بگۆڕدرێتەوە، بۆ نموونە ئەگەر چەکەکە بەدینار بوو دەبێت بەدۆلار یان تمەن بفرۆشرێت، ئەگەر نا سووی زیادە دروست دەکات.

- ئەگەر چەکەکە هەبوو (رصید) ی لەبانك ئامادە نەبوو وەك چەکەکانی ئەمڕۆ ئەوکات ئەگەر بفرۆشرێت بەهەمان درواى چەکەکە بە زیاد وکەم ئەوە هەردوو جۆری سووەکە دروست دەکات، خۆ ئەگەریش بفرۆشرێت بەدراوێکی جیاواز ئەوە جۆرێك لەسوو هەر دروست دەکات، ولەم حاڵەتانەدا تاکە چارەسەری ئەوەیە، بەکاڵا وشتومەك بفرۆشرێت وەکو: ئۆتۆمبێل، وخانوو، وزەوی، وکەرەسەی ناوماڵ، وئەو بابەتانە. یان ئەوەتا بفرۆشرێتەوە بەکەمتر بەو لایەنەی کە قەرزارە وچەکەکەی لەبری قەرزەکەدا داوە، جا حکومەت بێت، یان بانك، یان کۆمپانیا جیاوازی نییە.

پ٨/ ئەگەر پارەی (١٠٠$) بە (٢٥٠) دیناری عێراقی بکڕیت بە (١٣٦٠٠٠) دینار دەیکڕیت، بەڵام ئەگەر بە (١٠٠٠٠) یان بە (٢٥٠٠٠) دیناری بیکڕیت (١٠٠$) بە (١٢٢٠٠٠) دینار دەکڕیت، ئایا ئەم مامەڵەیە شەرعییەو ڕێگە پێدراوە؟.

و/ بەڵێ ئەم مامەڵەیە دروستە وکێشەی تێدا نییە؛ چونکە دینار و دۆلار دوو جۆری جیاوازن، ودروستە لەکاتی گۆڕینەوەیاندا زیاد وکەمیان پێ بکرێت.

پ٩/ ئایا هیچ جیاوازییەك لەنێوان سووی حکومەت وسووی هاووڵاتیەکی ئاساییدا هەیە؟.

و/ نەخێر سووی حکومەت وسووی هاووڵاتیەکی ئاسایی لەهیچ ڕوویەکەوە جیاوازیان نییە؛ چونکە سوو هەر سووە هەرکەس لایەنێك بیدات یان بیخوات جیاوازی نییە وحوکمە شەرعییەکانیش گشتگیرن وکەسی لێ جیا ناکرێتەوە، هەر بۆیە بەدرێژایی مێژووی دەوڵەتی ئیسلامی کەچەندین قۆناغی سەخت ودژواری بینیوە وبڕیوە نەبیستراوە لەهیچ قۆناغێکدا پەنای بۆ سوو بردبێت، یان زانایان بۆیان حەڵاڵ کردبێت. وباسی ئەوەشمان کرد کە کاتی خۆی پێغەمبەری خودا ﷺ خورمای خەیبەریان بۆ هێنا، بەڵام کەزانی مامەڵەکە سووی تێدا بووە ڕەتی کردەوە وقبوڵی نەکرد، ونەیگوت بۆ دەوڵەت یان (بیت المال) حەڵاڵە.

ئەو پاساوانەیش کە بۆ ئەم بابەتە دەهێنرێنەوە هیچیان شەرعی نین، بۆ نموونە باس لە ڕووداوێکی کوڕەکانی پێشەوا عومەر دەکەن وەکو پاساو، کە گوایە مامەڵەکەیان سووی تێدا بووە، وپێشەوا عومەریش پێی ڕازی بووە، کە ئەمە هیچ ڕوویەکی ڕاستی نییە، ومن لێرەدا درێژەی ڕووداوەکە باس دەکەم تا هەموو لایەك بزانن ئەو ڕووداوە نە لەنزیك ونە لە دوورەوە هیچ پەیوەندی بەسووە نەبووە:

ئەبو موسای ئەشعەری والی پێشەوا عومەر بووە لەسەر بەصرە، عبدالله وعبیدالله ی کوڕی پێشەوا عومەر لەگەڵ سوپایەکدا لەوێوە دەگەڕێنەوە بۆ مەدینە، ئەبو موسا پێیان دەڵێت: حەزم دەکرد شتێکتان بۆ بکەم سودێکتان پێ بگەیەنم، پاشان بیر دەکاتەوە وپێیان دەڵێت: پارەیەکی (بیت المال) هەیە دەتاندەمێ بیبەنەوە بۆ مەدینە، بۆخۆتان دەتوانن لێرەوە شتی پێ بکڕن، وکە چوونە مەدینە بیفرۆشن قازانجەکەی هەڵگرن بۆ خۆتان، ئەوانیش لەوێ پارەکە دەدەن بەشت ومەك، وکاتێك دێنە مەدینە شتەکان دەفرۆشن وقازانجەکەی بۆ خۆیان هەڵدەگرن، کە دێنە لای پێشەوا عومەر دەڵێن: ئەم قازانجە هی خۆمانە.

پێشەوا عومەر پرسیاریان لێ دەکات ودەڵێت: هەموو ئەو کەسانەی کە لە سوپاکەدا بوون ئەبو موسا پارەی پێدان تا بازرگانی پێوە بکەن وەکو ئێوە؟ گوتیان: نەخێر، گوتی:

کەواتە بۆیە ئەبو موسا ئەو پارەیەی داوە بە ئێوە لەبەر ئەوەی ئێوە کوڕی پێشەوای موسوڵمانانن، بۆیە پێتان حەلاڵ نییە وەریبگرن، عبدالله بێدەنگ بوو، عوبەید الله گوتی: ئەی پێشەوای باوەڕداران، ئەگەر ئەم پارەیە تیا بچوایە، یان زیانی بکردایە ئێمە لێی بەرپرسیار نەبووین؟!، پێشەوا عومەر گوێی بۆ نەگرت ووەلامی نەدایەوە وگوتی: دەڵێم قازانجەکەیم بدەنێ. یەکێك لە هاوەڵان لەوێ دانیشتبوو هەستی کرد شتەکە لەسەر دڵی عبیدالله زۆر گرانە بۆیە گوتی: ئەی پێشەوای باوەڕداران بیکە بە قازانج بە شەراکەت، پێشەوا عومەریش بەگوێی کرد[1].

ئەم ڕووداوە هیچ پەیوەندییەکی بەسووەوە نییە، تا وەك پاساوی سوو بۆ دەوڵەت بهێنرێتەوە؛ چونکە نەکەس قەرزی داوە بەکەس ونەکەسیش سووی قەرزی وەرگرتۆتەوە.

یان دەڵێن: پێشەوا عەلی دەستی دزێکی نەبڕیوە کە لە (بیت المال) دزی کردبێت، کەواتە (بیت المال) تایبەتمەندی خۆی هەیەك بەلاَم ئەمەیش دیسان بەڵگەیەکی لاوازە چونکە کاتێك پێشەوا عەلی دەستی نابڕێت لەبەر ئەوە نییە کە دزی لە (بیت المال) حەلاڵە ودروستە، بەڵکو لەبەر ئەوە بووە کە سەکە موسوڵمان بووە وپشکی هەبووە لە (بیت المال) ، ئەوەیش گومان دەخاتە سەر جێبەجێکردنی سزاکەی، وەك چۆن ئەگەر ژن لەپارەی مێردەکەی ببات دەستی نابڕدرێت، نەك لەبەر ئەوەی دزییەکەی حەلاڵە، بەڵکو لەبەر ئەوەی خەرجی ژیانی لەسەر مێردەکەیەتی، ومافێکی لەپارەکانیدا هەیە بۆیە دەستی نابڕدرێت، لێرەشدا هەر وایە.

بۆیە کاتێك خوای گەورە شتێك حەرام دەکات وەکو پیاوکوشتن، یان زینا، یان دزی، یان سوو خۆری، ئەمانە لەسەر ئاستی تاك ودەوڵەت هەموو حەرامن وحوکمەکە کەسی لێ هاڵناوێردرێت.

---

١ - البيهقي، السنن الكبرى، ج٦، ص١١٠، رقم الأثر (١١٩٣٩).

پ١٠/ کەسێك کەدەبێتە کەفیل یان شایەت لەمامەڵەیەکدا کە سووی تێدایە حوکمی چییە؟.

و/ ئەگەر کەسەکە زانیبێتی مامەڵەکە سووی تێدایە وبووبێتە کەفیل یان شایەت، ئەوە لەگەڵ کەسی سوخۆر هیچ جیاوازی نییە، وهەردووکیان یەك حوکمیان هەیە و بەر نەفرەتی خوای گەورە دەکەون، خۆ ئەگەریش نەیزانیبێت ئەوو کات ئەم گوناهبار نابێت، بەڵام پێویستە یەکسەر لەمامەڵەکە بێتە دەرەوە ولایەنەکانی گرێبەستەکە ئاگادار بکاتەوە، کە ئەم هیچ پەیوەندی بەو کارەوە نییە.

پ١١/ لەکاتی گۆڕینەوەی پارەدا هەندێك پارەمان دەکەوێتە قەرزەوە، بۆنمونە ئێمە (١٠٠٠$)ی بۆ دەکەینە دیناری عێراقی ئەو لەوانەیە پارەی (٩٠٠$) پێبێت، وبڕی (١٠٠$) دەکەوێتە قەرزەوە لای ئەو؟ ئایا ئەمە حەرامە؟.

و/ لەکاتی گۆڕینەوەی دراودا دەبێت هەردوو دراوەکە ئامادەبن، ئەگەر یەکێکیان بکەوێتە قەرزەوە بەدڵنیاییەوە دروست نییە وحەرامە، بۆیە تۆ بۆت هەیە تەنها ئەو پارەیەی بۆ بگۆڕیتەوە کەحازرە، واتا تەنها (٩٠٠$) ی بۆ بگۆڕیتەوە، کەی بڕەکەی تری هێنا ئەو کات بەنرخی ڕۆژ بۆی بگۆڕەوە.

پ ١٢/ خەڵکێکی زۆر پرسیار لەسەر پێشینەی خانووبەرە دەکەن، کە ئایا چارەسەر چییە بۆ ئەوەی لەم کێشەیە بێینە دەرەوە؟.

و/ چارەسەر ئەوەیە کە ئەو بڕە پارەیەی کە لایان ماوە بە یەك جار بیدەنەوە، وپارەیان لا نەمێنێت، بۆ ئەوەی لە ئەگەری سزای دواکەوتنی دانەوەی قیستی مانگانەی قەرزەکە ڕزگاریان بێت.

پ١٣/ هەندێك كەس دەڵێن ئێمە قیستەكان دواناخەین تا زیادەی بڕواتە سەر، ئایا لەم حاڵەتەدا دروستە؟.

و/ نەخێر چونكە خودی گرێبەستەكە ئەو مەرجە حەرامەی تێدایە، وئەو مەرجەیش سویەكی ئاشكرایە، بۆیە پێویستە خودی گرێبەستەكەیش كە ئەو مەرجەی تێدایە هەڵبوەشێتەوە، یان هەر هیچ نەبێت ئەو مەرجە هەڵبوەشێتەوە، وحكومەتیش هیچ كام لەو دوو ڕێگەچارەیە ناكات، بۆیە هەر حەرامە.

پ١٤/ ئەوەندەی كە ئێمە گوێ لە بەڕێزتان دەگرین شتێكی تێدا نییەكە تۆزێك ئاسانكاری تێدابێت، وپێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت: {يَسِّرُوا، وَلاَ تُعَسِّرُوا}[1]. واتە: ئاسانكاری بۆ خەڵكی بكەن و دینیان لەسەر قورس مەكەن، من پێم وایە كە پێویستی خەڵكی ئەمڕۆ شتێكی زۆر گرنگە ڕەچاو بكرێت، نەك كەسە دوور لەدینەكان بڕۆن پارە بەسوو وەربگرن و بیكەنە خانوو، دواتر كەسە دیندارەكان ببن بە كرێچی لەلایان.

بۆنمونە: لە سعودیە ئەگەر كەسێك بدات لە كامیرا (١٠٠) ریال غەرامە دەكرێت، ئەگەر بۆ مانگی داهاتوو نەدرا ئەبێتە (٢٠٠) ریال، هەرچەند سەرەتا لەلایەن گەورە زانایانەوە مشتومڕێك دروست بوو، بەڵام دواتر وتیان بۆ ئەوەی خەڵكی پابەند بن بە یاساوە دروستە، ئەو غەرامەی كە بەهۆی دواكەوتنەوە لەسەر سولفەی عەقار دانراوە بۆ ئەوەیە كە خەڵك پابەند بێت بەیاساكانەوە، ئیتر بۆچی دروست نییە؟!.

و/ ڕاستە ئاسانكاری لە شەرعدا كارێكی خوازراو وپێویستە، بەڵام كام ئاسانكاری؟.

خاتو عائیشە فەرموودەیەكمان بۆ دەگێڕێتەوە جۆری ئاسانكارییەكە ڕوون دەكاتەوە ودەڵێت: (مَا خُيِّرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي أَمْرَيْنِ إِلاَّ أَخَذَ أَيْسَرَهُمَا مَا لَمْ يَكُنْ إِثْمًا، فَإِذَا كَانَ إِثْمًا كَانَ أَبْعَدَ النَّاسِ مِنْهُ)[2].

واتە: پێغەمبەری خودا ﷺ هەر كاتێك دوو بژاردەی لەبەردەستا بوایە ئاسانەكەی هەڵدەبژارد، بەمەرجێك تاوان نەبوایە، ئەگەر تاوانی تێدا بوایە لە هەموو كەس زیاتر خۆی لێ بەدوور دەگرت.

---

١ - البخاري، صحيح البخاري، ج١،ص٢٥، رقم الحديث (٦٩)، مصدر سابق.

٢ - البخاري، صحيح البخاري، ج٤،ص١٨٩، رقم الحديث (٣٥٦٠)، مصدر سابق.

ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێت کە ئاسانکاری لە حەرامدا ناکرێت بەڵکو نەك حەرام پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردوە لەوەی کە خەڵکی بڕوادار نزیکی شتی گوماناویش بکەون و لەو بارەیەوە فەرموویەتی: {فَمَنِ اتَّقَى الشُّبُهَاتِ اسْتَبْرَأَ لِدِينِهِ، وَعِرْضِهِ، وَمَنْ وَقَعَ فِي الشُّبُهَاتِ وَقَعَ فِي الْحَرَامِ}[1]. واتە: هەر کەس خۆی لەشتی گوماناوی پاراست ئەوە دین و کەرامەتیشی پارێزراو دەبێت، هەر کەسیش شتی گوماناوی کرد، ئەوە کەوتۆتە حەرامەوە؛ بۆیە من ناتوانم سوو بۆ خەڵکی حەلاڵ بکەم وبڵێم دین ئاسانکارییە؛ چونکە لە هیچ تاوانێکی گەورەی وەکو کوشتن، و سوو، وزینا، ودزی، ئاسانکاری تێدا ناکرێت، ئەوانە خوای گەورە حەرامی کردون، کەلەهەموو کەس بەبەزەیی ترە، ولەبەر بەرژەوەندی خەڵکی حەرامی کردوە، خوای گەورە بۆیە سووی حەرام کردوە، دەیەوێت هەژار نەچەوسێنرێتەوە. کە چی ئێمە دەڵێین با حەلاڵی کەین لەبەر بەرژەوەندی هەژار؛ بۆ خوای گەورە دەزانێت بەرژەوەندی هەژار لەکوێدایە یان ئێمە؟!!!.

سەبارەت بەو غەرامەیەی سعودیەیش کە بەڕێزت باسی دەکەیت، من خۆم فەتوای لیژنەی هەمیشەیی توێژینەوەی زانستی وفەتوای سعودیم لایە کە سووی دواکەوتنی قەرز دروست نییە وحەرامە. وئەمەیش فەتوای موفتی گشتی سعودیە (عبدالله بن عبدالعزیز ال الشیخ) لەسەر ئەو بابەتە: (مضاعفة المخالفات المروریة لایصح، ما یقومون بە من عمل مثل المضاعفات المروریة هو الربا المنهي عنه)[2]. واتە: دوو هێندەکردنەوەی سەرپێچییەکانی یاساکانی هاتووچۆ دروست نییە، ئەوەی دەیکەن لە دووهێندەکردنی پارەی سەرپێچییەکانی یاساکانی هاتووچۆ ئەو سوویە کەخوای گەورە حەرامی کردوە.

پ١٥/ چەندین ساڵە پێشینەی خانووبەرە هەیە بۆچی بێدەگن؟! ئایا قسەکردن لەسەر پێشینەی خانووبەرە دوای چەندین ساڵ، درەنگ نییە؟!.

و/ من هەرگیز لەسەر ئەو بابەتە بێدەنگ نەبووم، من هەر ئەو کات کە ئەو یاسایە دەرچو لەکەناڵی ئاسمانی (k.n.n) ولەبەرنامەیەکی تایبەتدا قسەم لەسەر کرد، وڕاشکاوانە

---

١ - مسلم، صحیح مسلم، ج٣ص١٢١٩، رقم الحدیث (١٠٧)، مصدر سابق.

٢ - صحیفة شمس، متابعات: ١٤٣٢/١٠/٢٧ هـ.

گوتم حەرامە، وجگە لەویش لە هەر دوو پێگەی سەرەکی (ئیسلام پەیك) و (دەنگی ئیسلام) لەبەرواری (٢٠١٠/٣/٢٦) بابەتێکم لەسەر بڵاو کردەوە، کە ئەمە بەشێکێتی: (لەو ماوەیەی پێشوودا ولەژێر فشارێکی زۆری لایەنە ئیسلامییەکانی ناو پەرلەمان و وەزارەتی ئەوقاف و یەکێتی زانایان وجەماوەر و خەڵکانی موسوڵمان، حکومەتی هەرێم لەهەنگاوێکی ئیجابیدا بریاریدا بەلا بردنی رێژەی (٢٪) ی سووی پارەی پێشینەی خانووبەرە، هەر چەند ئەم بڕیارە لە سەرەتادا زۆر جێی دڵخۆشی خەڵکی بوو وەخەڵکانێکی زۆریش دوای ئەو بڕیارە مامەڵەی وەرگتنی ئەو پارەیەیان کرد کە پێشتر لەبەر خوا و لەترسی بڕی سووەکە وەریان نەدەگرت؛ بەڵام ئێستایشی لەگەڵدا بێت ئەو پارەیەی کە وەك پێشینەی خانووبەرە دەدرێتە هاوڵاتیان لە ڕووی شەرعییەوە گرفت و ئاڵۆزیەکی زۆری تێدایەوە و پێویستە سەر لە نوێ پێدا چونەوەی پێدا بکرێتەوە و ئەو خاڵانەی کە جێی گفتن لا ببرێن وچارەسەر بکرێن. وەمن لێرەدا وەکو بەرپرسیارێتییەکی ئاینی وئەخلاقی و بۆ وەڵامدانەوەی هەموو ئەو کەسانەی کە لەرێی تەلەفۆن و ئیمەیلەوە داوای ڕوون کردنەوەی حوکمی شەرعییان لەسەر ئەو مەسەلەیە کردوە و بۆ بەرچاوڕوونی ئەو خەڵکانەی کە نایانەوێت سنوورەکانی شەرع ببەزێنن بە پێویستی دەزانم تیشك بخەمە سەر ئەو خاڵانەی کەجێی گرفت وئاڵۆزین لە ڕووی شەرعەوە....... ڕویەکی تری حەرامی وبوونی سوو لەم مامەڵەیەدا ئەوەیە کە حکومەت مەرجی ئەوە دادەنێت، کە هەرکات دانەوەی قیستێك لەکاتی خۆی دوا بکەوێت ئەوە حکومەت پارەی زیادە دەخاتە سەر ئەو کەسە و ئەمەیش سوویەکی زۆر ئاشکرایە و هەرگرێبەستێك مەرجێکی سووی لەو شێوەیەی تێدا بێت ئەو گرێبەستە دەبێت بە گرێبەستێکی ڕیبەوی ئیتر مەرج نیە ئەو کەسە ڕیباکە بدات یان نا، بە تەنها بوونی ئەو مەرجەگرێبەستەکە حەرام دەکات ئەگەر لە واقعیشدا کابرای قەرزدار دانەوەی هیچ قستێك دوا نەخات و سووە زیادەکە نەدات).

ئەمە هەڵوێستی من بووە لەو سەرەتایانەوە و بەڕوونی قسەی خۆم لەسەر حەرامی بابەتەکە کردوە.

پ١٦/ هەندێك لە تۆڕ یان کۆمپانیاکانی پەیوەندیکردن کە بەشداربوویەك یەکەی پێ نامێنێت، بەقەرز یەکەی پێدەدات، دواتر کە رەصیدەکەی پڕ دەکاتەوە، کۆمپانیا پارەیەکی زیاتر لەوەی کە پێی داوە وەردەگرێتەوە، ئایا حوکمی ئەم کارە چییە؟.

و/ ئەم مامەڵەیە هەمان حوکمی قەرزی هەیە؛ چونکە کاتێك کۆمپانیا یەکە دەداتە کەسی بەشداربوو بەقەرز دەیداتێ، بۆیە کاتێك وەری دەگرێتەوە پێویستە هەمان بڕی قەرزەکەی خۆی وەربگرێتەوە، نەك زیادی بخاتە سەر، وە ئەگەر زیادی خستە سەر یەکسەر دەبێتە سوو، بۆیە پێویستە ئەو کۆمپانیایانە ئەم جۆرە مامەڵانە ڕاگرن، ئەگەرنا ئەو کات ئەرکی هاوڵاتیانە یەکەیان بەقەرز لێ وەرنەگرن، تا تووشی حەرام نەبن.

پ١٧/ جیاوازی نێوان (عزیمة) و (رخصة) لە شەرعدا چییە؟ وبۆچی ئێمە (رخصة) ئاسانکاری لە سوودا بەکار ناهێنین؟.

و/ عزیمة: بریتییە لە جێبەجێ کردنی کار و فەرمانە شەرعییەکان وەکو خۆیان لەکاتە ئاساییەکاندا، بۆنمونە: ئێمە پێنج نوێژی فەرزمان هەیە ئەم پێنج نوێژە لە شەوو ڕۆژێکدا دەکرێت، ژمارەی ڕکعاتەکان و کاتەکانیان دیاریکراوە، کردنی ئەو نوێژانە لەکاتە ئاساییەکاندا وەکو خۆی، پێی دەگوترێت عەزیمەت. ئەمە بۆ هەموو پەرستش و سەرجەم حوکمە شەرعییەکانی تریش هەر وایە.

رخصة: بریتییە لەو ئاسانکارییانەی کە شەرع بۆ خەڵکی دەکات لە کاتە نائاساییەکاندا، بۆ نموونە ئەو پێنج نوێژەی باسمان کرد کاتێك مرۆڤەکان سەفەر دەکەن دەتوانن لە (٣) کاتدا ئەنجامی بدەن، وهەرسێ نوێژە چوار ڕکعاتیەکان دەبنە دوو ڕکعات، ئەمە (رخصة) وئاسانکارییە.

سەبارەت بەحوکمی کارپێکردنی (عزیمة) و (رخصة) بەپێی کەس وکات وشوێنەکان دەگۆڕێت:

سەبارەت بەوەرگرتنی (رخصة) بۆ سوو ئەگەر کەسەکە زۆر ناچار بوو بەو شێوەیەی زانایان باسی لێوە دەکەن و ژیانی یان ئەندامێکی جەستەی لەمەترسیدا بوو، وە هەموو

ڕێگە چارەکانی حەلاڵی تاقی کردبۆوە بە سواڵیشەوە، وە لەقەدەر لاچوونی حاڵەتی ناچارییەکە و مەترسییەکەی سەر ژیانی پارەی وەرگرت، ئەو کات بۆی هەیە وەری بگرێت. نەك هەر کەسە وەهەستێ وبۆخۆی فەتوا بدات وبڵێت ناچار بووم.

پ١٨/ کەسێك چەکی چیمەنتۆی هەبێت نەك پارە وە هێشتا کاتی وەرگرتنی چیمەنتۆکە نەهاتبێت دەتوانێت بیفرۆشێتەوە بەپارە؟.

و/ بەڵێ ئاساییە ودروستە؛ چونکە چیمەنتۆ یان شیش یان هەرکەرەسەیەکی تری بیناسازی لەو کاڵایانە نین کەسووی مامەڵەیان تێدا تێدا دروست دەبێت؛ بەڵکو کاڵایەکی خزمەتگوزارین ودەکرێت بەقەرز وبەحازر بفرۆشرێن و مامەڵەیان پێوە بکرێت.

پ١٩/ حوکمی وەرگرتنی مامەڵە پەشیمانی لەشەرعدا چییە؟.

و/ مامەڵە پەشیمانی لەزمانی عەرەبیدا پێی دەگوترێت (بيع العربون)، وزانایان سەبارەت بە حوکمی وەرگرتنی مامەڵە پەشیمانی دوو بۆچونیان هەیە:

زۆرینەی زانایان لە حەنەفییەکان، وشافیعییەکان، ومالیکییەکان مامەڵە پەشیمانییان پێ شەرعی نییە ودەڵێن گوایە پێغەمبەری خودا ﷺ نەهی لێ کردووە. وبەڵگە بەو فەرموودەیە دەهێننەوە کە دەفەرمووێت: {نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ بَيْعِ الْعُرْبَانِ}[١].

حەنبەلییەکان وزۆربەی زانایانی هاوچەرخیش لەوانە کۆمکاری فیقهی ئیسلامی، ولیژنەی هەمیشەیی فەتوای سعودیش پێیان وایە دروستە.

کۆمکاری فیقهی ئیسلامی لەو بارەیەوە دەڵێن : (٢- يجوز بيع العربون إذا قيدت فترة الانتظار بزمن محدود. ويحتسب العربون جزءا من الثمن إذا تم الشراء، ويكون من حق البائع إذا عدل المشتري عن الشراء)[٢]. واتە: مامەڵە پەشیمانی دروستە بەمەرجێك ماوەی پەشیمانییەکە

---

١ - أبو داود (سليمان بن الأشعث)، سنن أبي داود، ج٢، دار الفكر، بيروت، ص٣٠٥، تحقيق: محمد محي الدين عبد الحميد. عبد الرؤوف المناوي، فيض القدير شرح الجامع الصغير، ج٦، ط١، المكتبة التجارية الكبرى، مصر، ١٣٥٦، ص٣٣٢. البيهقي، السنن الكبرى، ج٥،ص٣٤٢، رقم الحديث (١١١٩١).

٢ - مجلس مجمع الفقه الإسلامي المنعقد في دورة مؤتمره الثامن بروناي دار السلام من ١- ٧ محرم ١٤١٤هـ الموافق ٢١- ٢٧ حزيران (يونيو ١٩٩٣م).

دیاری کراوبێت، و ئەو برە پارەیەی وەك مامەڵە پەشیمانی لەسەری ڕێدەکەون دەبێتە بەشێك لەنرخی کاڵاکە، ئەگەر مامەڵەکە سەری گرت، ئەگەریش سەری نەگرت دەبێتە مافی فرۆشیار ئەگەر کڕیار لەکڕینی کاڵاکە پاشگەز بویەوە.

لیژنەی هەمیشەیی فەتوای سعودیش لەو بارەیەوە دەڵێن: (بيع العربون جائز، وهو أن يدفع المشتري للبائع أو وكيله مبلغا من المال أقل من ثمن المبيع بعد تمام عقد البيع، لضمان المبيع؛ لئلا يأخذه غيره على أنه إن أخذ السلعة احتسب به من الثمن، وإن لم يأخذها فللبائع أخذه وتملكه وبيع العربون صحيح)[١]. واتە: مامەڵە پەشیمانی دروستە، و بریتییە لەوەی کڕیار پاش تەواوبوونی مامەڵەکە بڕێك پارە کە کەمترە لەنرخی کاڵاکە بداتە فرۆشیار یان بریکارەکەی بەمەبەستی ئەوەی گرەنتی کاڵا فرۆشراوەکە بۆ خۆی بکات و بەکەسی تر نەفرۆشرێت، وە بەو مەرجەی کە ئەگەر کڕیار کاڵاکەی ویست، ئەو برە پارەیە وەك بەشێك لەنرخی کاڵاکە ئەژمار دەکرێت، وە ئەگەر نەیویست ئەوە ئەو برە پارەیە بۆ کڕیارەکە دەبێت و ئەم مامەڵە پەشیمانییەیش دروستە.

وبەڵگەیشیان ئەوەیە: کە نافیعی کوڕی حارس خانوویەك لە مەککە لە صەفوانی کوڕی ئومەییە دەکڕێت، بۆ ئەوەی بیکاتە بەندینخانە، نافیع وا لەگەڵ صەفوان ڕێدەکەوێت بەمەرجێك پێشەوا عومەر بەگرێبەستەکە ڕازی بێت، ئەگەر ئەو ڕازی بوو ئەوا بەو نرخەی کە لەسەری ڕیکەوتوین دەمانەوێت، ئەگەریش ئەو ڕازی نەبوو ئەوا (٤٠٠) دینار مامەڵە پەشیمانیت دەدەینێ، دواتر پێشەوا عومەر ڕازی بوو وەقبوڵی کرد[٢].

ئەثرەم دەڵێت بە پێشەوا ئەحمەدم گوت: بۆچونت چییە لە سەر ئەم مامەڵەیە، فەرمووی: بۆچوونی چی؟! ئەوە عومەر کردویەتی. واتا کە عومەر کردبێتی چۆن دەتوانم قسەی لەسەر بکەم[٣].

سەبارەت بەو فەرموودەیەی کە حەنەفی، ومالیکی، وشافیعییەکان دەیکەنە بەڵگە لەسەر حەرامی مامەڵە پەشیمانی، ئەو فەرموودەیە لاوازە وکاری پێ ناکرێت، و هەموو ئەو

---

١ - فتاوى اللجنة الدائمة (ج١٣/ ص١٣٣).

٢ - البيهقي، السنن الكبرى، ج٦،ص٣٤، رقم الحديث (١١٥١١)، مصدر سابق.

٣ - فيصل بن عبد العزيز آل مبارك، بستان الاحبار مختصر نيل الاوطار، ج٣،ص١٤،

کەسانەی قسەیان لەسەر فەرموودەکە کردوە هاوڕان لەسەر ئەوەی کەفەرموودەکە لەهەموو ڕێگەکانییەوە لاوازە وکاری پێ ناکرێت[1] .

بۆچوونی پەسەند لەو نێوەندەدا بەلای بەندەوە ئەوەیە کە کار بە هەردوو بۆچونەکە بکەین، بەشێوەیەك ئەگەر پەشیمانبوونەوەی کڕیار یان فرۆشیار زیانی بە کەسی بەرامبەر گەیاند، کەسی زیانلێکەوتو بۆی هەیە بەقەدەر قەرەبووی زیانەکەی کە لێی کەوتووە مامەڵە پەشیمانی وەربگرێت، بەڵام ئەگەر هیچ زیانێکی تووش نەبوو ئەوە باشتر وایە خۆی لەو گومانە بپارێزێت وهیچی لێ وەرنەگرێت.

---

١ - بۆ نموونە: إبن حجر لە بارەیەوە دەڵێت: (رواه مَالِكٌ، وَأَبُو دَاوُد، وَابْنُ مَاجَهْ، مِنْ حَدِيثِ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ، وَفِيهِ رَاوٍ لَمْ يُسَمَّ، وَسُمِّيَ فِي رِوَايَةٍ لِابْنِ مَاجَهْ ضَعِيفَةٍ: عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَامِرٍ الْأَسْلَمِيُّ، وَقِيلَ: هُوَ ابْنُ لَهِيعَةَ وَهُمَا ضَعِيفَانِ، وَرَوَاهُ الدَّارَقُطْنِيُّ، وَالْخَطِيبُ فِي الرُّوَاةِ عَنْ مَالِكٍ، مِنْ طَرِيقِ الْهَيْثَمِ بْنِ الْيَمَانِ، عَنْهُ ... وَالْهَيْثَمُ ضَعَّفَهُ الْأَزْدِيُّ، وَقَالَ أَبُو حَاتِمٍ: صَدُوقٌ، وَذَكَرَ الدَّارَقُطْنِيُّ أَنَّهُ تَفَرَّدَ بِقَوْلِهِ عَنْ عَمْرِو بْنِ الْحَارِثِ. قَالَ ابْنُ عَدِيّ: يُقَالُ: إنَّ مَالِكًا سَمِعَ هَذَا الْحَدِيثَ مِنْ ابْنِ لَهِيعَةَ ، وَرَوَاهُ الْبَيْهَقِيُّ مِنْ طَرِيقِ عَاصِمِ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ، عَنْ الْحَارِثِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُعَيْبٍ ... وَهَذَا ضَعِيفٌ مَعَ إرْسَالِهِ) إبن حجر العسقلاني، تلخيص الحبير في أحاديث الرافعي الكبير، ج٣، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤١٩،١٩٨٩، ص٤٥.

(إبن الملقن) یش لەبارەیەوە دەڵێت: (وَمثل هَذَا لَا يحْتَج بِهِ أَصْحَابنَا وَلَا الْجُمْهُور، وَيُقَال: إِن الثِّقَة هَذَا هُوَ ابْن لَهِيعَة، حَكَاهُ ابْن عدي، وَقد رَوَاهُ ابْن وهب، عَن ابْن لَهِيعَة، عَن عَمْرو بِهِ. وَرَوَاهُ أَبُو دَاوُد، وَابْن مَاجَه فِي سُنَنهمَا عَن مَالك أَنه بلغه عَن عَمْرو، وَهَذَا أَيْضا مُنْقَطع لَا يحْتَج بِهِ، قَالَ أَبُو عَمْرو: رَوَاهُ التنيسِي وَغَيره كَذَلِك عَن مَالك. وَرَوَاهُ ابْن مَاجَه أَيْضا، عَن الْفضل بن يَعْقُوب وَهُوَ الرخامي الثِّقَة الْحَافِظ، عَن حبيب بن أبي حبيب كَاتب الإِمَام مَالك، عَن عبد الله بن عَامر الْأَسْلَمِيّ، عَن عَمْرو بن شُعَيْب بِهِ، وحبيب بن أبي حبيب هَذَا وَعبد الله بن عَامر الْأَسْلَمِيّ ضعيفان بِاتِّفَاق الْمُحدثين، وَذكر الْبَيْهَقِيّ رِوَايَة مَالك السالفة الَّتِي رَوَاهَا أَبُو دَاوُد وَابْن مَاجَه، ثمَّ قَالَ: هَكَذَا رَوَى مَالك هَذَا الحَدِيث فِي «الْمُوَطَّأ» فَلم يسم رَاوِيه الَّذِي رَوَاهُ عَنهُ، قَالَ: وَرَوَاهُ حبيب، عَن مَالك، عَن عبد الله بن عَامر، عَن عَمْرو بن شُعَيْب. وَقيل: إِنَّمَا رَوَاهُ مَالك، عَن ابْن لَهِيعَة، عَن عَمْرو قَالَه ابْن عدي، قَالَ ابْن عدي: والْحَدِيث عَن ابْن لَهِيعَة، عَن عَمْرو بن شُعَيْب مَشْهُور. قَالَ الْبَيْهَقِيّ: وَقد رُوِيَ هَذَا الحَدِيث عَن الْحَارِث بن عبد الرَّحْمَن، عَن عَمْرو بن شُعَيْب. ثمَّ رَوَاهُ بِإِسْنَادِهِ، عَن عَاصِم بن عبد الْعَزِيز، عَن الْحَارِث، عَن عَمْرو، قَالَ: وَعَاصِم هَذَا فِيهِ نظر، وحبيب ضَعِيف، وَعبد الله بن عَامر وَابْن لَهِيعَة لَا يحْتَج بهما، وَالْأَصْل فِي هَذَا الحَدِيث مُرْسل مَالك. هَذَا آخر كَلَامه فِي «سنَنه» وَقَالَ فِي «مَعْرفَته»: بلغنِي أَن مَالِكًا أَخذه عَن عبد الله بن عَامر، وَقيل: عَن ابْن لَهِيعَة، وَقيل: عَن الْحَارِث بن عبد الرَّحْمَن، عَن عَمْرو بن شُعَيْب، قَالَ: وَفِي الْجَمِيع ضعف...وأما حَدِيث عبد الرَّزَّاق فِي مُصَنفه»...فَفِي إِسْنَاده مَعَ الْأَسْلَمِيّ الْإِرْسَال). إبن الملقن (سراج الدين أبو حفص عمر بن علي بن أحمد الشافعي المصري)، البدر المنير في تخريج الأحاديث والأثار الواقعة في الشرح الكبير، ج٦، ط١، دار الهجرة، الرياض، ١٤٢٥،٢٠٠٤، ص٥٢٥،٥٢٦، تحقيق: مصطفى أبو الغيط وآخرون.

جگە لەوانیش ئێخ ئەلبانی وزۆرێکی تریش هەر دەڵێن لاوازە وکاری پێ ناکرێت.

پ٢٠/ کەسێك بڕێك پارە قەرزارە، وپارەی نییە قەرزەکە بداتەوە، وبەخاوەن قەرزەکە دەڵێت بڕێك پارەی ترم بەقەرز بدەرێ، دەڕۆم ئۆتۆمبێلێکی بەقەرز پێ ڕادەکێشم، وپاشان دەیفرۆشمەوە بەحازر وبەکەمتر و هەموو پارەی قەرزەکەی تۆی لێ دەدەمەوە. ئایا ئەم ڕێکەوتنە دروستە؟.

و/ نەخێر دروست نییە وحەرامە، چونکە گوتمان مەرجی سەرەکی دروستی قەرز ئەوەیە سوود بۆ خاوەن قەرزەکە ڕانەکێشێت، بەڵام لێرەدا ئەم قەرزەی دووەم سوودی بۆ ڕادەکێشێت، ولەبەرامبەریشدا کەسی قەرزاریش ئەوەندەی تر باری سەرشانی قورس دەبێت، وبەناچاری دەکەوێتە ژێر باری قەرزێکی قورس تر.

پ٢١/ ئەگەر دوو کەس هاوبەشبوون لە کارێکدا، ئایا دروستە یەکێك لە هاوبەشەکان ڕێژەیەکی قازانجی دیاری کراو بۆ خۆی دابنێت؟

و/ نەخێر دروست نییە وحەرامە؛ چونکە لەوانەیە مامەڵەکە زەرەر بکات وقازانج هەر نەکات، ئەو کات ئەو قازانج لەچی وەردەگرێت، یان لەوانەیە هەر ئەوەندە قازانج بکات کە ئەو بەمەرج بۆ خۆی داناوە، ئەی ئەو کات هاوەڵەکانی تری چی بکەن، بۆیە ئەمە پێی ناوترێت شەراکەت ودروست نییە.

بەڵام دەکرێت یەکێك لەشەریکەکان کەخۆی تەرخان کردوە بۆ کارەکە، وهەر ئەو پێوەی سەرقاڵە مانگانە کرێیەکی بۆ دیاری بکرێت، لەبری ماندوبوون وئەرکەکەی، یان ڕێژەیەك زیاتر قازنجی پێ بدرێت، بەڵام جگە لەم حاڵەتانە دروست نییە، یەکێك لە شەریکەکان بڕێك پارەی بڕاوە بەبێ هیچ بەرامبەرێك بۆ خۆی دیاری بکات.

پ٢٢/ کۆمەڵێك مارکە هەیە لە بازاڕدا، کەسێك دەڕوات هەمان مارکە لە چین دروست دەکاتەوە، ولە ژێر مارکەکەدا دەنووسێت کە لەوڵاتی (چین) دروستکراوە، بەڵام مارکەکە خۆی لەبنەڕەتدا یابانییە، ئایا ئەم کارە دروستە یان نا؟.

و/ نەخێر دروست نییە؛ چونکە ئەمە بەکار هێنانی ناو شۆرەت و ماندوبوونی خەڵکێکی ترە بەبێ پرس و ڕەزامەندی خۆیان؛ چونکە هەر کۆمپانیایەك کاتێك بازاڕ بۆ

کاڵایەکی خۆی دەکاتەوە ڕەنج و ماندووبوون و کات و خەرجییەکی زۆری دەوێت تا بازاڕ وناوبانگ بۆ خۆی دروست دەکات، ئێستا چۆن دەبێت کەسێك بێتە سەر حازری وبچێت لەژێر ناوی ئەودا کاڵا دروست بکات، ئەمە لە لایەك.

لەلایەکی ترەوە کاتێك ئەم کاڵایە بازاڕی هەیە، خەڵك لەجۆر ولە باشێتی کاڵاکە ڕادەبینێت بۆیە دەیکڕێت وپارەی زیاتری پێ دەدات، بەڵام ئەم کاڵایە لەڕاستیدا نە ئەو مارکەیەیە، ونە وەکو ئەویش باش و کارایە، وئەمەیش فیڵ وچاوبەست وفریودانی خەڵکی تێدایە.

هەرچەندە بشنووسیت ئەم مارکەیە مارکەیەکی چینییە، هەر حەرامە، لەبەر خاڵی یەکەم کە ئەمە ناو وئەرکی خەڵکێکی ترە تۆ بەبێ وەرگرتنی مۆڵەت لەوان بۆ خۆت بەکاری دەهێنی، دووەمیش لەبەر ئەوەی زۆرینەی خەڵك کە مارکەکە دەبینێت ئیتر پرسیار ناکات، چونکە دەزانێت ئەو مارکەیە هی فلان وولاتە، وکابرای فرۆشیاریش زۆر جار پێی ناڵێت، ئەمەیش دیاسن جۆرێکە لە فێڵ و هەڵخەڵەتاندن کە شەرع ڕێگری لێ دەکات.

پ٢٣/ حکومەت ئێستا پارەی نییە بیداتەوە بەو کەسانەی قەرزیان لایەتی، بەڵام دەنگۆی ئەوە هەیە کە حکومەت لەگەڵ کۆمەڵێك کۆمپانیایی گەورەدا ڕێکەوتبێت، بەوەی کە ئەوان لەبری ئەو قەرزانە، ئۆتۆمبێل بدەنە خەڵکی، ئایا وەرگرتن وکڕینی ئەو ئۆتۆمبێلانە دروستە؟.

و/ هەر چەندە ئێمە نازانین حکومەت چۆن لەگەڵ ئەو کۆمپانیایانە ڕێکەوتوە، ئایا بە مامەڵە وشێوازێکی حەڵاڵ یان حەرام ڕێکەوتون، چونکە زۆرێك لەو کۆمپانیایانە هی کەرتی تایبەتن وحکومی نین، بەڵام ئەگەر گریمان ڕێکەوتنەکەیان بە شێوازێکی شەرعی بێت، ئەوکات بەڵێ دروستە وهیچ کێشەی نییە خەڵك بڕوات بەو چەکانە کە قەرزە لای حکومەت ئۆتۆمبێل یان هەر کاڵایەکی تر بکڕێت، وبەهەر نرخێکیش کەلەسەری ڕێبکەون وهەردوو لا پێی ڕازی بن کێشەی نیە.

خۆ ئەگەریش ڕێکەوتنەکەی حکومەت لەگەڵ کۆمپانیاکان ناشەرعی بێت ئەوکات خەڵك دەبنە ئامرازی ساغکردنەوە وتێپەڕاندنی ئەو مامەڵە ناشەرعیە؛ بۆیە پێویستە خۆیانی لێ بپارێزن.

پ٢٤/ حکومەت هەندێك چەکی جلو بەرگیان داوە بەو ئاوارانە کە هاتونەتە وڵاتەکەمان، هەندێك لەو ئاوارانە پێویستیان بەو جلو بەرگانە نییە، بۆیە دەڕۆن چەکەکان دەفرۆشنەوە، ئایا کڕینەوەی ئەو چەکانە دروستە یان نا؟.

و/ ئەگەر چەکەکان چەکی کاڵا وجل وبەرگ بێت، بەڵێ دروستە کڕین وفرۆشتنی پێوە بکرێت، بەڵام ئەگەر چەکی پارە بێت نەخێر دروست نیە وحەرامە، چونکە حکومەت ئێستا پارەی ئەو چەکانەی نییە خەرجی بکات و بیداتەوە.

پ٢٥/ ئایا کڕینی دۆلار بە تەلەفۆن دەچێتە خانەی سووی دواکەوتنی یەکێك لەبەرامبەرەکانەوە (ربا النسيئة)؟.

و/ بەڵێ ئەگەر لەکاتی ڕێکەوتن لەسەر گۆڕینەوە یان کڕینی دۆلارەکە بەدراوێکی تر، هەر دوو دراوەکە ئامادە نەبن یان چەکی بانکی بەهەبووی تەواو یان خستنە سەر ئەژماری بانکی لەو کاتەدا بەردەست نەبێت دەچێتە خانەی سووەوە.

ئەمە کێشەی زۆرێك لەبازرگانەکانی ئەمڕۆیە، کەسێك تەلەفۆن دەکات بۆ دوبەی، وبەیەك تەلەفۆن (١٠٠) کیلۆ ئاڵتونی بۆ دەشکێننەوە، بەبێ ئەوەی کە دینارێکی لە کارگەی ئاڵتونەکە ئامادەبێت. یان تەلەفۆن دەکات بۆ بازاڕی دۆلارەکە و(١٠٠.٠٠٠$) ی بۆ دەشکێننەوە بە دینار بەبێ ئەوەی کە دینارێکی ئامادەبێت. ئەمانە هەموویان سوویەکی ڕوون وئاشکران.

چارەسەریش بۆ ئەم حاڵەتە ئەوەیە ئەو کەسەی هەمیشە پێویستی بەحەواڵەیە بابرێك پارەی لای دوکانی حەواڵەکە دابنێت، وهەر کات پێویستی پێی بوو تێلی بۆ بکات وبڵێت بڕی ئەوەندە لەوپارەیەی خۆم بۆ بکە بەتمەن وبۆم حەواڵەکە بۆ فلان شوێن.

یان ئەوەتا بیکات بەوەکیل وبڵێت لەوەکیلی منەوە ئەوەندە تمەنم بۆ بکڕە وبۆم حەواڵە بکە، ئەو کات دوکانی حەواڵەکە لەوەکیلی ئەوەوە تمەنەکە بەپارەی حازر ودەست بەدەست دەکڕێت وبۆی حەواڵە دەکات، دواتر ئەم پارەکە بۆ نووسینگەی حەواڵەکە دەهێنێتەوە وکرێی حەواڵەکەیان دەداتێ ونابێت دوکانی حەواڵەکە بەهۆی ئەوەی کە ئەم پارەکەی ئامادە نەبووە زیاتری لەنرخی حەواڵەی سروشتی لێوەربگرێت، ئەگەر وەری بگرێت دەبێتە سوو، بەڵکو هەمان کرێی حەواڵەی لێوەردەگرێت کە لەکەسێکی وەردەگرێت پارەکەی حازر وئامادەیە.

پ٢٦/ فەتوایەکی (د.علی قەرەداغی) هەیە کە وەرگرتنی سوو لەبانکە سووخۆرییەکان دروستە، ئایا ئەمە تا چەند وایە؟

و/ بەداخەوە خەڵکانێك هەن زۆر نابەرپرسانە مامەڵە لەگەڵ فەتوای زانایاندا دەکەن، وڕووی ڕاستییەکان لەبەر چاوی جەماوەر دەشێوێنن، بۆ نموونە لەم ڕۆژانەدا ئەم دەنگۆیە بڵاوکراوەتەوە کە گوایە دکتۆر عەلی قەرەداغی گوتویەتی: وەرگرتنی سوو لەو بانکانەی کە بەسوو مامەڵە دەکەن دروستە، بەو مانایەی کە دروستبێت کەسێك بڕوات پارە بەسوو لەو بانکانە دابنێت ودواتریش پارەی سووەکە وەربگرێت.

من خۆم بەدواداچوونم بۆ ئەم بابەتە کرد، وگەڕامەوە سەر پێگەی فەرمی دکتۆر خۆی، وڕاستی فەتواکەی لە وەڵامی پرسیارێکدا هاتووە کە ئاراستەیان کراوە، ئایا دروستە پارەی خێر (تبرعات) لەو بانکانە وەربگیرێت کە بە سوو مامەڵە دەکات؟.

ئەویش لەوەڵامدا دەڵێت: هیچ ڕێگرێکی شەرعی نییە کە کە هاوکاری لەو بانکانە وەربگیرێت کە بەسوو مامەڵە دەکەن، بۆ جێبەجێکردنی پرۆژە خێرخوازی وگەشەپێدانەکان، تەنانەت دروستە ئەو هاوکاریانە لەهەر کارێکی خێردا خەرج بکرێت. جگە لەکڕینی قورئان ودروستکردنی مزگەوت نەبێت.

ئەمە دەقی فەتواکەیە وبەهیچ شێوەیەك ئەوەی تێدا نییە کە مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو بانکانەدا دروست بێت، بۆیە پێویستە مرۆڤ بە وردی مامەڵە لەگەڵ فەتواو قسەی زانایاندا بکات وتا تەواو دڵنیا نەبێت لێی باسی نەکات و ئیشی لەسەر نەکات.

پ٢٧/ زۆر جار پرسیاری ئەوە دەکرێت کە زۆرێك لە پزیشکەکان ڕێککەوتنیان هەیە لەگەڵ دەرمانخانە، تاقیگە، سەنتەرەکانی تیشك و سۆنەردا، و لەبەرامبەر ئەوەی نەخۆشیان بۆ دەنێرێت یان دەرمانەکانیان ساغ دەکاتەوە داوای پشك یان دیاری دەکات؟.

و/ دیارە ئەم ڕێککەوتنە و وەرگرتنی ئەم برە پارەیە یان دیارییانە بەکۆمەڵێك مەرج دروستە لەوانە:

أ- پێویستە نەخۆشەکە پێویستی تەواوی بەو پشکنین و دەرمانانە هەبێت کە پزیشکەکە بۆی دەنوسێت، نەك تەنها لەبەر بەرژەوەندی خۆی بۆی بنووسێت.

ب- پێویستە نرخی ئەو تاقیگەیەی کەنەخۆشەکەی بۆ دەنێرێت یان ئەو دەرمانەی کە بۆ نەخۆشەکەی دەنوسێت لەنرخی تاقیگەکانی تر یان دەرمانەکانی هاوشێوەی ئەو گرانتر نەبێت، بەڵکو هەرزانتر یان هەر نەبێت هاوشێوەی ئەوان بێت.

ت- پێیوستە ئەو ئامێر و دەرمانانە، لەڕووی کوالیتییەوە زۆر باش وپێشکەوتو بن، وتا ئاساتێکی باش دەرەنجامەکانی جێی متمانە بن و لە ڕکابەرەکانیان باشتر بن لە بازاڕدا یان هیچ نەبێت هاوشێوەی ئەوان بن.

پ- پێویستە کەسی کارگێڕی تاقیگە یان کارمەندی دەرمانخانە تەواو شارەزا وپسپۆڕ بێت لەبواری خۆیدا.

ئەگەر ئەم خاڵانە ڕەچاو کرا ئەو کات ڕێکەوتنی نێوان پزیشك وتاقیگە یان دەرمانخانە گرفتێکی شەرعی نییە ودروستە، خۆ ئەگەر یەکێك لەو مەرجانە نەیەتە دی ئەو کات ئەو ڕێکەوتنە دەچێتە خانەی خیانەت لەنەخۆشەوە وحەرامە.

پ٢٨/ ئایا قازانج ڕێژەیەکی دیاری کراوی هەیە؟ خەڵك وا تەصەور دەکات کە قازانج دەبێت لە (١٠٠٪) زیاتر نەبێت، ئایا ئەمە ڕاستە؟.

و/ نەخێر ئەمە هەڵەیە و قازانج ڕێژەیەکی دیاری کراوی نییە، وخەڵك ئازادە کاڵا وموڵکی خۆی بەچەند دەفرۆشێت بەمەرجێك مامەڵەکە فێڵ، وستەم، وزۆر، وناپاکی، و قۆرخکاری تێدا نەبێت.

پ٢٩/ پێدانی زەکات بە کەسێك کە قەرزت لایەتی، بەمەبەستی ئەوەی قەرزەکەت بداتەوە دروستە یان نا؟.

و/ ئەگەر بەو مەرجە زەکاتەکەی پێ بدەیت کە قەرزەکەت بداتەوە، ئەوە دروست نییە، وزەکاتی پارەکەیش بەو شێوەیە دەرناچێت، بەڵام ئەگەر بەبێ هیچ مەرجێك یان ڕێکەوتنێك بیدەتێ، دواتر خۆی بۆت بگێڕێتەوە ئەوە دروستە وکێشەی نییە. یان ئەگەر کەسی خاوەن قەرز لە نییەتی خۆیدا وابێت وبڵێت من زەکاتەکەی دەدەمێ بەڵکو ئەویش قەرزەکەم بۆ بگێڕێتەوە، بەڵام بەمەرجێك پێی نەڵێت، وکابرای قەرزداریش هەر هەمان نییەتی هەبێت ئەگەر زەکات وەربگرێت پارەی ئەو کەسە بداتەوە، ئەمەیشیان دیسان دروستە وکێشەی نیە.

یان ئەگەر کەسی قەرزار خۆی داوای کرد وگوتی زەکاتم بدەرێ قەرزەکەت دەدەمەوە، بەبێ ئەوەی خاوەن قەرزەکە باسی بکات، ئەمەیشیان دیسانەوە دروستە.

پ٣٠/ ئەگەر هاتو کەسێکی هەژار قەرزی کەسێکی لا بوو، دروستە کەسێکی تر کە پارەی زەکاتی هەیە، بڕوات قەرزەکەی بۆ بداتەوە بەبێ ئاگادای خۆی؟.

و/ نەخێر بۆچوونی زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەیە کە ئەگەر بەبێ پرسی خۆی بڕوات قەرزەکەی بۆ بداتەوە دروست نییە، وزەکاتەکەی دەرناچێت، بەڵکو دەبێت بە ئاگاداری خۆی بێت وپرس بەخۆی بکرێت ئەوکات دروستە قەرزەکەی بۆ بداتەوە.

پ٣١/ لەبری هەر حەواڵەیەك بڕێك پارەی دیاریکراو بەپێی ڕۆژ وەردەگیرێت پێی دەوترێت کرێی حەواڵە، ئایا ئەمە دروستە؟.

و/ بەڵێ دروستە وهیچ کێشەی نییە.

٣٢/ ئێمە ئەو حەواڵانەی دەیکەین تەنها دۆلار وەردەگرین، بەڵام ئێمە لەوڵاتانی دەرەوە بەپێی ڕۆژ و بەپێی ڕەزامەندی بەرابەر ئەو دراوانە دەشکێنینەوە؟.

و/ ئەمە کێشەیە چونکە ئەو مامەڵەیە تەنها حەواڵە نییە، بەڵکو حەواڵە وپارەگۆڕینەوەیشە، بۆیە دەبێت بەیەکێك لەم ڕێگانە بکرێت ئەوەی مامەڵەکە دروست بێت.

ئەگەر گریمان حەواڵەکە بۆ ئێران بوو:

- یان ئەوەتا هەر لێرە دۆلارەکەی بۆ بگۆڕەوە بەتمەن ودواتر تمەنەکەی بۆ حەواڵە بکە بۆ ئێران.

- یان ئەوەتا دۆلارەکەی خۆی بۆ حەواڵەکە بکە بۆ ئێران، ودواتر لەنووسینگەکەی خۆت لە ئێران، وبە ئامادەبوونی وەکیلەکەی ئەو، وەبەنرخی ئەوکاتە دۆلارەکەی بۆ بشکێنەوە بەتمەن، وتمەنەکەی بدەرێ.

- گرنگ ئەوەیە مادەم پارە گۆڕینەوەی تێدەکەوێت دەبێت دەست بەدەست بێت، وهیچ دراوێکیان نەکەوێتە قەرزەوە.

پ٣٣/ گۆڕینەوەی پارە بەشێوازی (هەوایی) دروستە یان نا؟

و/ ئەمەیش دیسان مامەڵەیەکی حەرام ویاساغە وسووی تەواوە، وبیرۆکەکەی ئەوەیە کە کەسێك یەك دیناری پێ نییە یان بڕێك پارەی کەمی پێیە، تەلەفۆن دەکات بۆ برادەرێکی تری کە ئەویش وەك خۆی وایە، ودەڵێت: (١٠٠.٠٠٠$) پێ دەفرۆشم، با بڵێین بە (١٠٠٠٠٠٠٠٠) تمەن، لەکاتێکدا نە ئەو ئەو بڕە تمەنی هەیە ونەئەمیش ئەم بڕە دۆلارەی هەیە، وڕێکیش دەکەون کە لەڕۆژی یەك شەممە پارەکە بشکێننەوە، زیانی کرد پارەکەی دەداتێ قازانجی کرد پارەکەی وەردەگرێتەوە، ئەم دوو پارەیە نەك ئامادە نین بەڵکو بونیان هەر نییە، ئەمە پێی دەڵێن (هەوایی)، وسوویەکی تەواوە.

یان ئێستا بۆرصە هەیە کەسێك دەڕوات کیلۆیەك ئاڵتون دەکرێت کەنرخەکەی (٣٩٠٠٠$)، وبەڵام ئەم تەنها (١٠٠٠$) دۆلاری پێیە وئەوەندەیش ڕادەستی کەسی فرۆشیار دەکات، کەسی فرۆشیاریش تەلەفون بۆ دوبەی دەکات، کە کیلۆیەك ئاڵتون بخەنە سەر حسابەکەی، وبەو بڕە پارە کەمە ئەم دەبێتە خاوەنی کیلۆیەك ئاڵتون، بەڵام ئەم کرین ومافی خاوەندارێتییە تەنها خەیاڵە ولەسەر شاشەیە ولەڕاستیدا بوونی نییە، چونکە ئەم نەك ئاڵتونەکە وەرناگرێت بەڵکو هەر نایشیبینێت، وپاش ئەوە بۆرصە بەردەوام ئاگای لە

نرخە وچاودێری دەکات، وهەرکات ئەو کیلۆ ئاڵتونە نرخی لە (١٠٠٠$) هاتە خوارەوە، ئەوە دوکانی بۆرصەکە بەبێ پرسی ئەم یەکسەر ئاڵتونەکە دەفرۆشێت و(١٠٠٠$) ی دەڕوات. چونکە زیانی ئاڵتونەکە نابێت لەو پارەیە زیاتر بێت کە ئەم وەکو هەبووی ڕاستەقینە هەیەتی.

ئەمە لەکاتێکدا کەفرۆشتنی ئاڵتون بەقەرز سوویەکی ڕوون وئاشکرایە، بۆیە بەڕێزان ئەمانە وسەدەها مامەڵەی ترمان هەیە کە هیچیان پەیوەندییان بە شەرعی خواوە نییە وهەموویان حەرامن، وزۆربەی ئەوانەیش کەدەیکەن وۆر بەداخەوە خەڵکانی موسوڵمانن وئەهلی مزگەوتن، وبۆ دەستنوێژێك، یان دەستگرتنێك، یان شتێکی زۆر بچوك دەپرسیار دەکەن ویەخەی دە مامۆستا دەگرن، بەڵام بۆ ئەم بابەتە گرنگ وهەستیارانە نەك پرسیاری لەبارەوە ناکەن، بەڵکو گوێی بۆ ناگرن وبەسەد پێچ وپەنا خۆیانی لێ دەدزنەوە، لەکاتێکدا ئەمە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بەدونیا وقیامەتی هەموو لایەکمانەوە هەیە.

خوای گەورە هیدایەتی هەموو لایەکمان بدات، وبمانگێڕێتەوە سەر ڕاستە شەقامی ئاینەکەی خۆی ولەکاری حەرام وپارەی حەرام، وپارووی حەرام بمانپارێزێت.

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين

## کۆتایی

پاش سوپاس وستایشی خوای گەورە لەسەر هەموو ئەو نیعمەتانەی کەپێی بەخشیووین، بەتایبەتی نیعمەتی ئیمان وئیسلام، وبەتایبەت تر نیعمەتی تەواو کردنی ئەم پەرتووکە کە زۆر بەخەمی تەواو کردنییەوە بووم.

پێم خۆشە لەکۆتایی باسەکەماندا گرنگترین دەرئەنجام وراسپاردەکانی لەم چەند خاڵەدا بخەمە ڕوو:

١- سیستەمی ئابووری ئیسلامی، چەندین بنەما وتایبەتمەندی خۆی هەیە کە لە سیستەمە ئابوورییەکانی تری دونیا جیای دەکاتەوە لەوانە: لە سیستەمی ئیسلامیدا ماڵ وسەروەت هەمووی هی خوای گەورەیە، ومرۆڤەکان تەنها مافی بەگەرخستن وبەکارهێنانیان هەیە، وسیستەمی ئابووری ئیسلامی لەسەر بنەمای (خاوەنداریێتی تاك و کۆمەڵگە، ودادگەری کۆمەڵایەتی دامەزراوە). وماڵ لەسیستەمی ئابووری ئیسلامیدا تەنها ئامرازە وئامانج نییە.

٢- بەکارهێنانی وشەی (سوود) لەزمانی کوردیدا بەرامبەر بە وشەی (ربا) لەزمانی عەرەبیدا هەڵەیە، چونکە وشەی سوود بەواتای قازانج دێت کە لەعەرەبیدا پێی دەگوترێت (ربح) یان (فائدة) وئەویش کارێکی ڕێگەپێدراو وخوازراوە، بەڵام (ربا) واتایەکی شەرعی تری هەیە، وکارێکی حەرامە ویەکێکە لەتاوانە گەورەکان، بۆیە ئێمە لێرەدا و لەبەرامبەریدا وشەی (سوو) مان بەکار هێناوە، تا بتوانین لە (سوود) کەشەرعیە ورێگە پێدراوە جیای بکەینەوە.

٣- بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی دیاردەی سووخۆری بەشێوەیەك لەشێوەکان لەهەموو شارستانییەت وکۆمەڵگاکانی مرۆڤایەتیدا بوونی هەبووە. هەر بۆیە بەر لەهاتنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام دیاردەی سووخۆری لەکۆمەڵگا نەفامییەکانی ئەو سەردەمەدا بە بەربڵاوی بوونی هەبووە وپاشان ئاینی پیرۆزی ئیسلام بەچوار قۆناغ قەدەغەی کردوە وبنبڕی کردوە.

٤- سوو یەکێکە لەو بابەتە فیقهیانەی کەتێگەیشتینی ئاسان نییە، ووردەکاری زۆری دەوێت، وبەشێوەیەکی گشتی دوو جۆر سوو هەیە: یەکەم: سووی قەرز (ربا القرض). دووەم: سووی کڕین وفرۆشتن (ربا البيع).

٥- قەرزی شەرعی چەند مەرجێکی تایبەتی خۆی هەیە لەوانە: مەبەست لەپێدانی قەرزەکە تەنها لەبەر خوای گەورە بێت، وپارەی قەرزەکە سەرچاوەیەکی حەڵاڵی هەبێت، ومنەت وقسەی ناخۆش بەسەر کەسی قەرزداردا نەکرێت، وکەسی قەرزاریش لای خۆیەوە پابەند بێن بەگێڕانەوەی قەرزەکە لەکاتی خۆیدا.

٦- سووی قەرز بریتییە لەو سوەوەی کەبەهۆی قەرزەوە تووشی کەسەکان دەبێت، جا یان ئەوەتا هەر لەسەرەتاوە خاوەن قەرزەکە مەرجی ئەوەی داناوە، کە بەسوو قەرزەکەی دەداتێ، یان ئەوەتا کاتێك قەرزارەکە ناتوانێت لەکاتی خۆیدا پارەی قەرزەکە بگێڕێتەوە، ئەم لەبەرامبەر درێژ کردنەوەی ماوەی قەرزەکە پارەی زیاتری لێ وەردەگرێت.

٧- گەڕاندنەوەی قەرز هەمیشە بەهاوشێوەی خۆی دەبێت لەڕووی چەندێتی وچۆنێتیەوە، وهیچ کام لەکەسی قەرزار وخاوەن قەرز ناتوانن بەرامبەرەکەیان ناچار بکەن لەسەر وەرگرتنەوە یان پێدانی دراوێکی تر، وکەم وزیاد کردنی نرخی پارەی قەرزەکە شتێکی سروشتیە مەگەر لە (٣/١) بترازێت.

٨- کڕین وفرۆشتن بەقەرز وبەقیست دروستە وهیچ گرفتی شەرعی نییە، بەڵام کۆمەڵێك مەرج هەیە پێویستە ڕەچاو بکرێت لەوانە: نابێت کڕینو فرۆشتنەکە لەنێوان دوو شتدا بێت کە سوویان تێدا دروست بێت، وئەبێت شێوازی مامەڵەکە ڕوون ودیار بێت، کە بەقەرزە یان بەحازر، وپێویستە ماوەی قەرزەکە، وبڕی گوژمەکان، وکاتی دانەوەیان دیاری کراوبێت، ونابێت گرێبەستەکە مەرجی ئەوەی تێدا بێت ئەگەر کڕیار لە دانەوەی قیستەکان دوا کەوت زیادەی بچێتە سەر، ونابێت ئەو زیادەیەی دەچێتە سەر نرخی کاڵاکە بەقیست لە کۆی نرخەکەی جیابکرێتەوە.

٩- هەرقەرزێك خەرجی هەبێت وئەرکی دارایی بۆ خاوەنی قەرزەکە دروست بکات، ئەوە خاوەنی قەرزەکە بۆی هەیە هەموو تێچوو وخەرجییەکانی قەرزەکەی لەلایەنی قەرزار

وەربگرێتەوە، وجگە لەم حاڵەتە خاوەن قەرز بۆی نییە لەژێر هیچ ناوێکی تردا زیادە بخاتە سەر بڕی قەرزەکەی.

١٠- خاوەن قەرزەکان بۆیان هەیە، داوای قەرەبووی هەمووئەو زیانانە بکەنەوە لەقەرزارەکان، کەبەهۆی کەمتەرخەمی وخەم ساردی ئەوانەوە لەدانەوەی قەرزەکانیان بەریان کەوتووە، بەڵام بەمەرجێك زیانەکان ڕاستەقینە بن، ولیژنەیەکی بێلایەن خەملاندن بۆ بڕ وڕێژەی زیانەکان بکات، وبەقەدەری ڕێژەی زیانەکان قەرەبوویان لێوەر بگرنەوە،

١١- هەرگرێبەستێك مەرجی سووی تێدابێت، شەرعی نییە، ودەبێت خودی گرێبەستەکە خۆی یان ئەو مەرجە نا شەرعییەی کەتێیدایە هەڵبوەشێنرێتەوە، ئەوجا دروستە خەڵکی ئەنجامی بدەن و بەشداری تێدا بکەن.

١٢- زۆربەی ئەو قەرزو پێشینانەی حکومەت دەیداتە هاوڵاتیان لە پێشینەی خانووبەرە، وقەرزی کشتوکاڵی، وگەشت وگوزاری، وپیشەسازی، جگە لەپێشینەی هاوسەرگیری مەرجی سوویان تێدایە وبەمەیش گرفتی شەرعی دروست دەکات.

١٣- دەکرێت قەرزێك حەرامیشی تێدا بێت بۆ حاڵەتی ناچاری وەربگیرێت، بەڵام بۆ ئەم حاڵەتە پێویستە ناچاری لەحاڵەتی پێویستی جیابکرێتەوە، وهەموو مەرجەکانی حاڵەتی ناچاری بێتە دی ئەوجا وەربگیرێت.

١٤- مامەڵە بانکییەکان چەندین بوار دەگرێتەوە لەوانە بارمتەنامە (خطاب الضمان)، وئەژماری پاشەکەوت (حساب التوفیر، جاری مدین )، وئەژماری ڕەوان (الحساب الجاری)، وهەریەك لەمانە مەرج وڕێکاری شەرعی خۆی هەیە، وبەداخەوە زۆربەی ئەو ڕێکارە شەرعییانە لەمامەڵەکانی ئەمڕۆدا پشتگوێ خراون وکاریان پێ ناکرێت، هەربۆیەیش سوود وەرگرتن لەو خزمەتگوزاریە بانکییانە شەرعی نییە.

١٥- کاغەزە بازرگانییەکان لەیاسای بازرگانیدا دەبێت بەدوو بەشەوە: یەکەمیان کاغەزە بازرگانییەکان: ئەوانیش کۆمەڵێك کاغەزن کە جێگەی پارە دەگرنەوە لەڕووی یاساییەوە، وبریتین لە: کۆمپیالە (الکمبیالة، السند للأمر)، چەك (الشیك، الصك)، حەواڵە بازرگانییەکان (الحوالات التجاریة، السفتجة). دووەمیان: کاغەزە داراییەکان: ئەوانیش

فرۆشتنی پشك (الأسهم) وقەواڵە (السندات) دەگرنەوە. هەموو ئەمانە لەڕووی شەرعەوە قسە هەڵدەگرن ومەرجی تایبەتیان هەیە بۆ کارپێکردنیان.

١٦- ڕێکاری شەرعی زۆرمان هەیە بۆ خۆپاراستن لەسوو لەوانە: فرۆشتنەوە لەسەر مایە وبە قازانج (بیع المرابحة). هاوبەشیبوون بەپارەی لایەنێك وکاری لایەنەکەی تر (المضاربة). بەکردندان (الإستصناع). بەقەرز کڕین بەگران، وبەحازر فرۆشتنەوە بەنرخێکی کەمتر (الزرنقة، التورق). فرۆشتنی پێشوەخت (بیع السلم)، هاوبەشیبوون بەپارە وکاری هاوبەش (المشارکة). بە کرێدان لەگەڵ بەڵێنی پێفرۆشتن یان پێبەخشین (الإجارة المنتهیة بالتملیك).

١٧- جۆری دووەم لەجۆرەکانی سوو سووی کڕین وفرۆشتنە وئەمیش دەکرێت بەدوو بەشەوە: یەکەم: سووی زیادە (ربا الفضل)، ودووەم: سووی ئامادەنەبوون یان دواکەوتنی یەکێك لەدراوەکان یان کاڵاکانە (ربا النسیئة).

١٨- ئەو شتانەی سووی کڕین وفرۆشتنیان تێدا دروست دەبێت بەپێی دەقی فەرموودەکان شەش شتن ئەوانیش: (ئاڵتون، زیو، گەنم، جۆ، خوێ، خورما)، وزۆرینەی زانایان بەهەر چوار مەزهەبەکەوە پێیان وایە هۆکاری حەرامبوونی سوو تەنها لەواندا جێگیر نییە، بەڵکو لەزۆر شتی تردا دەکرێت بەدی بکرێت، هەر بۆیەیش لەهەر سەردەمێکدا هەمان هۆکار لەهەر شتێکی تردا دروست بێت، بێگومان ئەو شتەیش حوکمی هەمان ئەو شەش شتە وەردەگرێت. هەربۆیە سوو لەسەرجەم دراوە کاغەزییەکانی ئەمرۆ، وخشڵی ئاڵتون وزیویشدا دروست دەبێت.

سەبارەت بەرپرسیاردەکانی ئەم بابەتەیش لەم چەند خاڵەدا کۆیان دەکەمەوە:

١- با هەموو لایەك ئەوە بزانین کەخوای گەورە لەقیامەتدا دەربارەی زۆربەی جومگە هەستیارەکانی ژیان تەنها یەك پرسیار ئاراستەی مرۆڤ دەکات، بەڵام سەبارەت بەپارە دووجار پرسیاری لەبارەوە دەکات، یەکەمیان دەپرسێت چۆنت پەیدا کرد؟. دووەمیان دەپرسێت لەچیدا خەرجت کرد؟. بۆیە پێویستە بەر لەو کاتە بۆ هەر دینارێك پەیدای دەکەین لەخۆمان بپرسین داخۆ چۆنمان پەیدا کردوە بەحەڵاڵ یان حەرام.

٢- پێویستە هەر موسوڵمانێك کەدەیەوێت کارێك بکات وحوکمەکەی نازانێت، بەر لەوەی کارەکە بکات پرسیاری حوکمەکەی بکات، نەك پاش کردنی، چونکە دواتر دەربازبوون لێی زەحمەتە، وبەزیانی خۆی وخەڵکی تریش تەواو دەبێت.

٣- با هەموومان دڵنیابین لەوەی کەرزقی مرۆڤ لەئاسمانە وبەر لەوەی بێینە دونیا خوای گەورە براندویەتیەوە وزیاد وکەم ناکات، وهەتا یەك پاروە نانی مابێت لەدونیا دەرناچێت ولێی جێ نامێنێت، ئیتر بۆچی پەنا بۆ حەرام ببەین، وحەڵاڵەکان واز لێبێنین.

٤- هەر موسوڵمانێك کە سەرقاڵی کاری بازگانی وکڕین وفرۆشتنە بەتایبەتی ئەو بەرێزانەی لەبواری بانك، ودراو، وئاڵتون، ووشکە دا کار دەکەن، پێویستە وەك چۆن ووردەکاریەکانی نوێژو ڕۆژوو دەزانن ئاوا حوکمی ووردەکاریەکانی مامەڵەکانیان بزانن، ئەگەر نا کارەکەیان حەرام دەبێت، چونکە بەدڵنیاییەوە تووشی حەرام دەبن، وهیچ کات نەزانین لەم سەردەمەدا ناکرێتە پاساوی خۆ دەربازکردن لەحوکمە شەرعییەکان.

٥- تکا کارم مامۆستایانی ئاینی خوێندنەوەی تازەیان هەبێت بۆ هەموو ئەو بابەتە سەردەمییانەی کەڕوو دەدەن، تا گوتاری ئاینی لەپێشکەوتنی ژیانی مرۆڤەکان جێ نەمێنێت، ومتمانە وپێگەی لەناخی خەڵکدا لاواز نەبێت، وبەهیچ شێوەیەکیش، وبۆ هیچ کەس، وبەهیچ پاساوێکیش سازش لەسەر حوکم وبنەما شەرعییەکان نەکەن، تاسنووری حەڵاڵ وحەرامی خوا لەبەرچاوی خەڵکی لێڵ وتێکەڵ نەبێت.

٦- داواکارم لە حکومەت بەهەموو پۆست وئاست وجومگەکانی دەسەڵاتەوە بەتەنگ قیامەتی خەڵکی موسوڵمانی ئەم میللەتەوە بن، وهەوڵێکی ڕاستەقینە بدرێت تا سەرجەم ئەو برگە یاساییانە هەمواربکرێنەوە کەسەر بۆ حەرام دەکێشن، ولەبەرامبەردا پەنا بۆ

ڕێکارە شەرعییەکان ببڕێت، کەمن زۆرێکیانم لەم پەڕتووکەدا باس کردوە، وهەرکەسیش دەستی هەبێت لەهەر کارێکی خێری لەو جۆرەدا، تا قیامەت پاش مردنی خۆیشی بەدەیەها وسەدەها ساڵ بەردەوام خێر وچاکەی بۆ دەنووسرێت، وبەپێچەوانەیشەوە هەرکەس دەستی هەبێت لەدانانی ڕێگەی خراپ وکاری حەرامدا تا قیامەت تاوانی بۆ دەنوسرێت، وتاوانی خۆی وئەو خەڵکانەیش بەهۆی ئەوەوە تووشی حەرامەکە دەبن دەچێتە ئەستۆی ئەو.

پرۆفیسۆر: خالد محمد ساڵح

٢٥/ شوال/ ١٤٣٦- ١٢/٨/٢٠١٥

سلێمانی/ هەواری زانکۆ

کاتژمێر: ١١.٣٢ خولەکی سەر لەبەیانی.

# پێرستی سەرچاوەکان

**قورئانی پیرۆز.**

**ڕاڤەی قورئان:**

١- الجصاص (أحمد بن علي الرازي)، أحكام القرآن، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤١٥، ١٩٩٤.

٢- أبو حيان الأندلسي، تفسير البحر المحيط، دار الفكر، بيروت.

٣- الرازي (محمد بن عمر)، تفسير الرازي(مفاتيح الغيب)،دار الكتب العلمية، بيروت، ط١٤٢١.

٤- الشنقيطي (محمد الأمين بن محمد بن المختار)، أضواء البيان في إيضاح القرآن بالقرآن، دار الفكر، بيروت، تحقيق: مكتب البحوث والدراسات.

٥- إبن العربي (محمد بن عبد الله)، أحكام القرآن، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت.

٦- القرطبي (محمد بن أحمد بن أبي بكر)، تفسير القرطبي (الجامع لأحكام القرآن)، ط٢٠٠٣، دار عالم الكتب، الرياض، تحقيق: هشام سمير البخاري.

٧- إبن كثير (إسماعيل بن عمر)، تفسير إبن كثير (تفسير القرآن العظيم)، ط٢، دار طيبة للنشر،١٤٢٠، ١٩٩٩.

**فەرموودە:**

٨- الألباني (محمد ناصر الدين)، إرواء الغليل في تخريج أحاديث منار السبيل، ط٢، المكتب الإسلامي، بيروت، ط١٤٠٥، ١٩٨٥.

٩- الألباني (محمد ناصر الدين) صحيح الترغيب والترهيب، ط٥، مكتبة المعارف، الرياض.

١٠-الألباني، صحيح وضعيف الجامع الصغير وزيادته، المكتب الإسلامي، بيروت.

١١- البخاري (محمد بن إسماعيل)، صحيح البخاري (الجامع المسند الصحيح المختصر من أمور رسول الله وسننه، وأيامه)، ط١، دار طوق النجاة، تحقيق: محمد زهير بن ناصر الناصر.

١٢-البيهقي (أحمد بن الحسين)، السنن الكبرى، ط١، الناشر مجلس دائرة المعارف النظامية، الهند ، حيدر آباد، ١٣٤٤.

١٣-الترمذي (محمد بن عيسى الترمذي السلمي)، سنن الترمذي (الجامع الصحيح)، دار إحياء التراث العربي، بيروت، تحقيق: أحمد محمد شاكر وآخرون.

١٤-الحاكم (محمد بن عبدالله)، المستدرك على الصحيحين، مع تعليقات الذهبي في التلخيص، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤١١، ١٩٩٩٠، تحقيق: مصطفى عبد القادر عطا.

١٥- إبن حبان (محمد بن حبان بن أحمد)، صحيح ابن حبان بترتيب ابن بلبان، ط٢، مؤسسة الرسالة، بيروت، ١٤١٤، ١٩٩٣، تحقيق: شعيب الأرنؤوط.

١٦- إبن حجر العسقلاني، تلخيص الحبير في أحاديث الرافعي الكبير، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤١٩، ١٩٨٩.

١٧-أبو داود (سليمان بن الأشعث)، سنن أبي داود، دار الفكر، بيروت، تحقيق: محمد محي الدين عبد الحميد.

١٨- فيصل بن عبد العزيز آل مبارك، بستان الاحبار مختصر نيل الاوطار.

١٩- إبن ماجة (محمد بن يزيد)، سنن إبن ماجة، دار الفكر، بيروت، تحقيق، وتعليق محمد فؤاد عبد الباقي.

٢٠- مسلم (مسلم بن الحجاج)، صحيح مسلم، دار إحيار التراث العربي، بيروت، تحقيق: محمد فؤاد عبد الباقي.

٢١- إبن الملقن (سراج الدين أبو حفص عمر بن علي بن أحمد الشافعي المصري)، البدر المنير في تخريج الأحاديث والأثار الواقعة في الشرح الكبير، ط١، دار الهجرة، الرياض، ١٤٢٥، ٢٠٠٤، تحقيق: مصطفى أبو الغيط وآخرون.

٢٢- النسائي (أحمد بن شعيب)، سنن النسائي الكبرى، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤١١، ١٩٩١، تحقيق: د.عبد الغفار سليمان البنداري ، سيد كسروي حسن.

## ڕاڤەی فەرموودە:

٢٣- البغوي (الحسين بن مسعود البغوي)، شرح السنة، ط٢، المكتب الإسلامي، دمشق، تحقيق: شعيب الأرنؤوط، محمد زهير الشاويش.

٢٤- إبن حجر العسقلاني (أحمد بن علي بن حجر)، -فتح الباري شرح صحيح البخاري، دار المعرفة، بيروت، ط١٣٧٩.

٢٥- الصنعاني (محمد بن إسماعيل)، سبل السلام شرح بلوغ المرام، ط٤، مطبعة مصطفى البابي الحلبي ، ١٣٧٩.

٢٦- عبد الرؤوف المناوي، فيض القدير شرح الجامع الصغير، ط١، المكتبة التجارية الكبرى، مصر، ١٣٥٦.

٢٧- القاضي عياض، إكمال المعلم شرح صحيح مسلم، الكتاب بدون ت ط.

٢٨- النووي (يحيي بن شرف النووي)، شرح النووي على صحيح مسلم (المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج)، دار إحياء التراث العربي، بيروت، ط ١٣٩٢.

## فیقهی حەنەفی:

٢٩- إبن عابدين (محمد أمين بن عمر)، حاشية إبن عابدين (رد المحتار على الدر المختار شرح تنوير الأبصار)، ط٢، دار الفكر، بيروت، ١٤١٢،١٩٩٢.

٣٠- عبد الغني الغنيمي، اللباب في شرح الكتاب، المكتبة العلمية، بيروت، تحقيق: محمد محيي الدين عبد الحميد.

٣١- العيني (محمود بن أحمد بن موسى)، البناية شرح الهداية، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤٢٠-٢٠٠٠.

٣٢- الكاساني (أبو بكر بن مسعود)، بدائع الصنائع في ترتيب الشرائع، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤٠٦،١٩٨٦.

٣٣- إبن مازة (محمود بن أحمد بن عبد العزيز)، المحيط البرهاني في الفقه النعماني، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤٢٤،٢٠٠٤، تحقيق: عبد الكريم سامي الجندي.

٣٤- إبن نجيم (زين الدين بن إبراهيم)، البحر الرائق شرح كنز الدقائق، ط٢، دار الكتاب الإسلامي، بيروت.

## فیقهی مالیکی:

٣٥- الحطاب (محمد بن محمد)، تحرير الكلام في مسائل الإلتزام، ط١، دار الغرب الإسلامي، بيروت، ١٤٠٤،١٩٨٤، تحقيق: عبد السلام محمد الشريف.

٣٦- الحطاب (محمد بن محمد)، مواهب الجليل في شرح مختصر خليل، ط٣، دار الفكر، بيروت، ١٤١٢،١٩٩٢.

٣٧- الدسوقي (محمد بن أحمد)، حاشية الدسوقي على الشرح الكبير، دار الفكر، بيروت.

٣٨- إبن رشد (محمد بن أحمد)، المقدمات الممهدات، ط١،دار الغرب الإسلامي، بيروت، ١٤٠٨.

٣٩- الصاوي (أحمد بن محمد الخلوتي)، بلغة السالك لأقرب المسالك إلى مذهب الإمام مالك، دار المعارف/ بيروت.

٤٠- إبن عبد البر، الإستذكار، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤٢١،٢٠٠٠، تحقيق : سالم محمد، محمد علي.

٤١- إبن عبد البر (يوسف بن عبد الله بن محمد)، الكافي في فقه أهل المدينة، ط٢، مكتبة الرياض الحديثة، الرياض، ١٤٠٠،١٩٨٠، تحقيق: محمد محمد أحيد.

٤٢- العدوي (علي بن أحمد بن مكرم)، حاشية العدوي على شرح كفاية الطالب الرباني، دار الفكر، بيروت، ط١٤١٤،١٩٩٤، تحقيق: يوسف الشيخ محمد البقاعي.

٤٣- إبن عليش(محمد بن أحمد)، منح الجليل شرح مختصر خليل،دار الفكر،ط١٤٠٩، بيروت.

٤٤- القرافي (أحمد بن إدريس الصنهاجي)، أنوار البروق فى أنواع الفروق، دار الكتب العلمية، بيروت، ط١٤١٨،١٩٩٨، تحقيق خليل المنصور.

٤٥- القرافي (محمد بن أحمد بن محمد)، القوانين الفقهية.

٤٦- مالك (مالك بن أنس)، المدونة الكبرى، دار الكتب العلمية، بيروت، ، تحقيق: زكريا عميرات.

## فیقهی شافیعی:

٤٧- إبن حجر الهيثمي (أحمد بن محمد بن علي)، الفتاوى الكبرى الفقهية على مذهب الإمام الشافعي، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٩٩٧،١٤١٧.

٤٨- الخطيب الشربيني (محمد بن أحمد)، مغني المحتاج إلى معرفة معاني ألفاظ المنهاج، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٩٩٤،١٤١٥.

٤٩- زكريا الأنصاري (زكريا بن محمد)، أسنى المطالب في شرح روض الطالب، دار الكتاب الإسلامي، بيروت.

٥٠- السبكي (عبد الوهاب بن علي)، الأشباه والنظائر، دار الكتب العلمية، بيروت، ط١٤١١،١٩٩١.

٥١- الشافعي (محمد بن إدريس)، الأم، دار المعرفة، بيروت، ١٤١٠،١٩٩٠.

٥٢- الشيرازي (أبو اسحاق إبراهيم بن علي)، المهذب، دار الكتب العلمية، بيروت.

٥٣- الغزالي (محمد بن محمد الغزالي)، الوسيط في المذهب، ط١، دار السلام، القاهرة، ١٤١٧، تحقيق: أحمد محمود إبراهيم ، محمد محمد تامر.

٥٤- الغمراوي (محمد الزهري)، السراج الوهاج على متن المنهاج، دار المعرفة، بيروت.

٥٥- الماوردي (علي بن محمد بن محمد)، الحاوي الكبير، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت. ط١٤١٩،١٩٩٩، تحقيق: علي محمد معوض، عادل أحمد عبد الموجود.

## فیقهی حەنبەلی:

٥٦- البهوتي (منصور بن يونس)، كشاف القناع عن متن الإقناع، دار الكتب العلمية، بيروت.

٥٧- إبن تيمية (أحمد بن عبد الحليم)، الفتاوى الكبرى، ط١، ١٣٨٦، دار المعرفة، بيروت، تحقيق: حسنين مخلوف.

٥٨- إبن تيمية، مجموع الفتاوى.

٥٩- الزركشي (بدر الدين محمد بن عبد الله)، المنثور في القواعد الفقهية، ط٢، وزارة الأوقاف الكويتية، ١٤٠٥،١٩٨٥.

٦٠- السيوطي ، مطالب أولي النهى في شرح غاية المنتهى، ط٢، المكتب الإسلامي، بيروت.

٦١- إبن قدامة، الشرح الكبير على متن المقنع، دار الكتاب العربي، بيروت.

٦٢- إبن قدامة، المغني، مكتبة القاهرة، ط١٣٨٨، ١٩٦٨.

٦٣- إبن القيم (محمد بن أبي بكر ابن قيم الجوزية)، إعلام الموقعين عن رب العالمين، دراسة وتحقيق: طه عبد الرؤوف سعد، مكتبة الكليات الأزهرية، القاهرة، ط١٣٨٨هـ/١٩٦٨م.

٦٤- المرداوي (علي بن سليمان المرداوي)، الإنصاف في معرفة الراجح من الخلاف، دار إحياء التراث العربي، بيروت.

٦٥- إبن مفلح (إبراهيم بن محمد)، المبدع في شرح المقنع، ط١، دار الكتب العلمية، ١٤١٨،.

## فيقهي ظاهري:

٦٦- إبن حزم (علي بن أحمد)، المحلى بالآثار، دار الفكر، بيروت، تحقيق: أحمد شاكر.

## فيقهي گشتي:

٦٧- توفيق إسماعيل الجيوسي، مخاطر الربا الإجتماعية، والإقتصادية.

٦٨- إبن تيمية (أحمد بن عبد الحليم)، إقتضاء الصراط المستقيم في مخالفة أصحاب الجحيم، ط٧، دار عالم الكتب، بيروت، ١٤١٩، ١٩٩٩، تحقيق: ناصر عبد الكريم العقل.

٦٩- حسن عبد الله الأمين، الفوائد المصرفية والربا، الإتحاد الدولي للبنوك الإسلامية.

٧٠- الرئاسة العامة للبحوث العلمية والإفتاء، عبد العزيز بن باز، مجموع فتاوى ومقالات ابن باز.

٧١- الشاطبي (إبراهيم بن موسى بن محمد اللخمي)، الموافقات في أصول الشريعة، ط١، دار إبن عفان، ١٩٩٩، ١٤١٧، تحقيق: أبو عبيدة مشهور بن حسن آل سلمان.

٧٢- عبد العظيم جلال أبو زيد، فقه الربا.

٧٣- إبن القيم (محمد بن أبي بكر)، زاد المعاد في هدي خير العباد، ط١٤، مؤسسة الرسالة- بيروت، مكتبة المنار الإسلامية- الكويت، تحقيق: شعيب الأرناؤوط - عبد القادر الأرناؤوط.

٧٤- محمد الجمال، موسوعة الإقتصاد الإسلامي، ط٢، دار الكتب المصرية.

٧٥- محمد بن صالح العثيمين، الشرح الممتع على زاد المستقنع، ط١، دار إبن الجوزي، ١٤٢٢.

٧٦- د. محمد عمر شابرا، نحو نظام نقدي عادل دراسة للنقود والمصار والسياسة النقدية في ضوء الإسلام، دار البشير، عمان، ط١٩٩٠.

٧٧- المقريزي (أحمد بن علي)، رسائل المقريزي، ط١، دار الحديث، القاهرة، ١٤١٩.

٧٨- إبن المنذر (أبو بكر محمد بن إبراهيم)، الإشراف على مذاهب العلماء، ط١، مكتبة مكة الثقافية، رأس الخيمة، ١٤٢٥،٢٠٠٤، تحقيق: صغير أحمد الأنصاري.

٧٩- وزارة الأوقاف، الموسوعة الفقهية الكويتية، ط٢، دار السلاسل، الكويت.

٨٠- إبن هبيرة (يحيى بن هبيرة بن محمد)، اختلاف الأئمة العلماء، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤٢٣،٢٠٠٢، تحقيق: السيد يوسف أحمد.

## سەرچاوە هەمە جۆرەکان:

٨١- سفر الخروج، الإصحاح ٢٢، الفقرة٢٤.

٨٢- سفر اللاويين، فصل ٢٥، فقرة ٣٥- ٣٧.

٨٣- عبد الله بن بيه (عضو المجلس الأوروربي للإفتاء والبحوث)، في بحث له بعنوان: الفرق بين الضرورة والحاجة تطبيقا على بعض أحوال الأقليات المسلمة.

٨٤- مجلة البحوث الإسلامية، ع ١٨، فتاوى اللجنة الدائمة للبحوث العلمية والإفتاء.

٨٥- مجلة البحوث الفقهية المعاصرة، خالد بن عبد الرحمن المشعل، بحث بعنوان: الفائدة والربا شبهات وتبريرات معاصرة، ع٨٠، ص١٣-٢٣.

٨٦- مجلة المسلم المعاصر، د. محمود عارف وهبة، بحث بعنوان: نظريات الفائدة (الربا) في الفكر الاقتصادي، ع٢٣.

٨٧- مجلة المنار، محمد رشيد رضا.

٨٨- مجلة مجمع الفقه الإسلامي.

٨٩- محمد بن صالح العثيمين، مجموعة أسئلة في بيع وشراء الذهب، موقع: http://madrasato-mohammed.com/outaymin/pg_٠٦١_٠٠٠١.htm.

٩٠- موقع البيان الإقتصادي، د. محمد توفيق سماق، مقال بعنوان: رؤية صندوق النقد والبنك الدوليان بين التغريب والتدويل، تأريخ نشر المقال: ٣٠ أبريل ١٩٩٩.

٩١- د. يوسف القرضاوي، فوائد البنوك هي الربا الحرام، موقع الشيخ القرضاوي: http://www.qaradawi.net/new/library٢/٢٨٧-٢٠١٤-٠١-٢٦-١٨-٥٣-٤٦/٣٧٥٠.

## پێڕستی بابەتەکان

## نووسەر

- خالید موحەممەد ساڵح قادر.

- ساڵی (١٩٧٥) لە شاری سلێمانی لە گەڕەکی ئابڵاخ لە دایک بووە.

- ساڵی (١٩٨٦) خوێندنی سەرەتایی لە قوتابخانەی (سەلاحەددینی ئەیووبی) تەواو کردووە.

- ساڵی (١٩٩٢) پەیمانگای ئیسلامیی لە سلێمانی تەواو کردووە.

- ساڵی (١٩٩٦) بڕوانامەی بە کالۆریۆس لە (کۆلێژی شەریعە و خوێندنی ئیسلامیی) لە دهۆک بەدەستهێناوە.

- ساڵی (٢٠٠١) بڕوانامەی ماستەری لە کۆلێژی یاسا لە زانکۆی خەرتووم بەدەستهێناوە.

- ساڵی (٢٠٠٥) بڕوانامەی دکتۆرای لە کۆلێژی یاسا لە زانکۆی خەرتووم بەدەستهێناوە.

- ساڵی (٢٠٠٥) لە کۆلێژی یاسا/ زانکۆی سلێمانی دامەزراوە و نازناوی (مامۆستا)ی پێدراوە.

- ساڵی (٢٠٠٩) نازناوی پرۆفیسۆری یاریدەدەری بەدەستهێناوە.

- ساڵی (٢٠١٥) نازناوی پرۆفیسۆری بەدەستهێناوە.

- ئێستا لە زانکۆی سلێمانی لە کۆلێژی یاسا بەشی یاسای تایبەت مامۆستایە.

- پسپۆڕی وردی لە فیقهی بەراورد/ یاسای باری کەسێتییدایە.

